گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە،
کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دەریدەکات

# مێژوو ٧



ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی سەدەی نۆزدە (پرسی رۆژهەڵات و کۆنگرەی بەرلین)

نمایشێکی سەدەی بیستەم

خاکێکی خاوەن ناوداریییەکی دێرین

رحلة سيدي علي التركي في العراق والخليج سنة ١٥٥٣م

أربيل وضرورة الحفاظ على معالمها العمرانية التراثية

دراسة السيرة النبوية للمستشرقين الالمان ـ فلهاوزن نموذجاً

ژمارە (١٢) سالی سێیەم پایزی ٢٠٠٩

# مێژوو

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە، کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دەریدەکات



ژمارە (١٢) سالی سێیەم پاییزی ٢٠٠٩

کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان

KURDISTAN HISTORICAL CULTURAL ASSOCIATION

جمعية الثقافة التاريخية لكردستان




* گۆڤار : مێژوو
* ژمارە : ( ١٢ )
* تیراژ : ( ٧٠٠) دانە
* چاپخانە : گۆڤار



کوردستان / هەولێر - نزیك دەستەی وەبەرهێنان – کۆڵانی ٥١ – گەڕەکی ٢٠٤ منارە

کۆڵانی بەرامبەر بانکی کریدیتی عێراقی

g.mezhu@yahoo.com

g.mezhu@hotmail.com

# پێرست


ژ.لا

✓ **سەروتار**

| | |
|---|---|
| یەکێك لە نیشانەکانی گرنگی نەدانی کورد بە مێژوو | ٥ |

✓ **توێژینەوە**

| | | |
|---|---|---|
| میرنشینی عەنازی | د.ئاکۆ برهان محمد | ٩ |
| ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی سەدەی نۆزدە (پرسی رۆژهەڵات و کۆنگرەی بەرلین) | مەغدید حاجی | ٢١ |
| چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاست | ئامانج نازم بێجان | ٥١ |
| کورد و وڵاتەکەی لە ساڵانی (١٦-٤١ك / ٦٣٧-٦٦١ز) لە کتێبی (تاریخ الامم .... | هۆگر رحمان قادر | ٨١ |
| دەربارەی سەرهەڵدانی هزری ناسیۆنالیزم | د. حكيم أحمد | ١٣٧ |

✓ **وەرگێڕان**

| | | |
|---|---|---|
| نمایشێکی سەدەی بیستەم | و:لە ئینگلیزییەوە : سردوود قادر | ١٥٥ |
| مێژوو .. زانستی هەبوونی مرۆڤ هەوڵێك بۆ پەڕینەوە .. . | و. لە عەرەبییەوە: هاوار محەمەد | ١٨٥ |
| خاکێکی خاوەن ناودارییەکی دێرین | و.د. محەمەد عەبدوڵا کاکە سوور | ٢٢٩ |

✓ **القسم العربي**

| | | |
|---|---|---|
| الشرطة في العهد الاموي | أ.د.ارسن موسى رشيد | ٢٣٧ |
| التاريخ الكوردي على ضوء المصادر السريانيـة | د.فرست مرعي | ٢٦٥ |

| | | |
|---|---|---|
| نظرة في كتاب وعاظ السلاطين للاستاذ الدكتور علي الوردي | د. حسن جاف | ٢٧٩ |
| رحلة سيدي علي التركي في العراق والخليج سنة ١٥٥٣م | الدكتور عماد عبد السلام رؤوف | ٢٩٧ |
| أربيل وضرورة الحفاظ على معالمها العمرانية التراثية | د.على عادل حسين | ٣١٥ |
| دراسة السيرة النبوية للمستشرقين الالمان-فلهاوزن نموذجاً | فرست رۆژبەیانی | ٣٢١ |
| الوزارة في عصر التسلط البويهي (٣٣٤-٤٤٧هـ/٩٤٥-١٠٥٥م) | كامران علي فتح الله | ٣٥٩ |
| الحركة الكوردية في سوريا بين أزمة الفكر والممارسة | د. إسماعيل حصاف | ٣٨٣ |

# یەکێك لە نیشانەکانی گرنگی نەدانی کورد بە مێژوو

**سەرنووسەر**

بەشێکی زۆر لە نەوەی حەفتاکانی کوردیش ڕێککەوتی ڕۆژ و مانگی لە دایك بوونیان دیار نییە بۆیە بە شێوەیەکی گشتی ٧/١ تۆمارکراوە. لەوانەیە هۆی سەرەکی ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە نەریتی ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی جەژنی لەدایك بوون لە لای کورد زۆر درەنگ سەریهەڵداوە، بە لانی کەم بەبەراورد کردن لە گەڵ نەتەوەکانی دراوسێ ی کوردیش هەر لەبەر ئەم هۆیەو لەبەر ڕادەی بەرزی نەخوێندەواری لە نێوان کورد تاکو حەفتاکانیش ئەم نادیارییە لە بەرواری لەدایك بوون هەستی پێدەکرێ، هەندێك جار ساڵی لەدایك بوونەکەش بەتەواوی دیارنییە لە کاتێکدا کە دایك و باوکەکە نەخوێندەوار بوونە و ناسنامەی باری کەسیان پاش ماوەیەك لە لەدایك بوونەکە دەرکردووە، بەمەزندە ساڵی لەدایك بوونەکەش دانراوە.

هەر لەم ڕووەوەش ناکۆکی لە ساڵی لەدایك بوونی ژمارەیەکی بەرچاو لە ناودارانی کورد هەستی پێدەکرێ، تەنانەت سەبارەت بەسەرکردەیەکی بەناوبانگی وەکو شێخ محمود کە لە هەشتاکانی سەدەی نۆزدە لەدایك بووە، لە سەرچاوەکاندا سێ ساڵی جیاواز بۆ مێژووی لەدایك بوونەکەی دانراوە. بەلام لەهەشتاکانی سەدەی بیستەوە لەگەڵ بەرز بوونەوەی ڕادەی خوێندەواری و بلاوبوونەوەی نەریتی ئاهەنگ گێڕان بە هۆی جەژنی لەدایك بوونەوە لەلای زۆر لە خێزانە کوردەکان بەوردی ڕۆژ و مانگ و ساڵی لەدایك بوونی منداڵان تۆمار دەکرێ. کە بەشێوەیەکی گشتی هەست کردن بەگرنگی مێژوو لەلای کورد بەدیاردەخات و نیشانەیەکیشە لە نیشانەکانی مێژووناسی پتر لەلایەن کوردەوە.

# میرنشینی عەنازی

د.ئاکۆ برهان محمد
سەرۆکی بەشی مێژوو/ زانکۆی کۆیە

- **ناوی میرنشینی عەنازی :**

بنەچەی ناوی عەنازی دەگەڕێتەوە بۆ ناوی سەرۆك هۆزێك بە ناوی "عەناز" کە سەرکردایەتی هۆزێکی کوردی ناوچەی رۆژئاوای هەرێمی چیاکانی دەکرد، دیارە کۆنترین سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بەم ناوە دەکەن وەکو وشەی " عەناز " [١] ، بەڵام لەلایەن مێژوونووس "ابن خلدون" بە شێوازی " عەنان" هاتووە[٢]، وە لەلایەن مێژوونووسانی کورد شەرەفخانی بەدلیسی و محمد جمیل رۆژبەیانی بە شێوازی " عەیار" ی هاتووە[٣] .

- **بنەچەی عەنازیەکان:**

عەنازیەکان وەکو بنەماڵەیەك دەگەڕێتەوە بۆ هۆزێکی ناوداری رۆژئاوای هەرێمی چیاکان بە تایبەتی ناوچەکانی " حلوان" [٤]، و دەوروبەری[٥]، کە هۆزی " شازنجانی" یە کە جگە لەم ناوچانە " قرمیسین"[٦]، و دەوروبەری لە نێو ناوچە ئاکنجیەکانیان دا بوون[٧]، ناوی ئەم هۆزە کوردیە لەلایەن مێژوونووس " المسعودی" بە شێوازی " شادنجان" ی هاتووە کە بەدیارترین و ناودارترینی هۆزە کوردیەکانی وەسف کردووە لە پاڵ چەند هۆزێکی تر[٨] .

- سەرهەڵدانی میرنشینەکە:

دەبێت خوێنەر ئەوە بزانێت کە میرنشینی عەنازی هەروەکو میرنشینەکانی تر لەسەر بنەمای هۆزایەتی دامەزراوە، بەتایبەتی کەوا کەسایەتی کورد هەمیشە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا پابەندبوونێکی دیاری هەبووە بەسەرۆك هۆزەکەیەوە، هەر لەبەر ئەمەش بنەچەی دامەزرانی ئەم میرنشینە هۆزی شازنجانی بووە کە دەسەلاتی بە تێپەڕبوونی کات زیادی کردووە و توانیویەتی باڵ بکێشێت بەسەر ناوچەی ترو ڕێزگرتن و گوێرایەڵی تاك بۆ هۆزەکەی ڕۆڵی خۆی هەبووە لەسەرهەڵدانی میرنشینی عەنازی .

لەبەر ئەوەی هۆزی شازنجانی بالادەست بوون لە ناوچەکانیانداو هۆزێکی بەتواناو لێهاتوو بوون کە ببووە مایەی ڕەزامەندی دەسەلاتداریتی بوەیهیەکان[9]، کە دەستداریان چەند ساڵێك بوو گەیشتبووە ناوچەکەو لەبەر ئەوەی بووەیهیەکان دەسەلاتدارێکی نوێ بوون لە ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی ئیسلام و عێراق پێویستیان بەوە هەبوو کە پارێزگاری لەم دەسەلاتەیان بکەن بەپشت بەستن بەو هۆزانەی کە توانایان هەیە لە لەناوبردن و پارێزگاری کردنی دەسەلاتی ئەوان، هەر لەبەر ئەمەش بینیان کەوا هۆزێکی وەکو شازنجانیەکان لە توانایاندا هەیە کە پاراستنی ناوچەو ڕێگە سەرەکیەکانی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان پێ بدرێت بۆ پاراستنی بەرژەوەندی بوەیهیەکان، لەبەر ئەوە لەساڵی ٣٣٩ك / ٩٥٠ز بوەیهیەکان سەرۆك هۆزی شازنجانیان ڕاسپارد بەناوی " ئیبن ئەبی شۆك " بۆ ئەم کارە[10].

بەلام دامەزرێنەری ڕاستەقینەی میرنشینی عەنازی دەگەڕێتەوە بۆ " ابی الفتح محمد بن عناز " کە توانی هەر لەساڵی ٣٨١ك / ٩٩١ز بە فراوانکردنی سنووری دەسەلاتداریتیەکەی و وەکو میرنشین خۆی ڕاگەیاندو ناوچەیەکی زۆری خستە ژێر دەسەلاتی خۆی لە شارەزوور و دەینەوەر[11]، و خانەقین لەگەڵ چەند قەلاو شارێکی

ناوچەکە[١٢]، لێرەدا پێویستە بووترێت کە لەبەر ئەوەی ناوچەکانی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان سەخت و دژوار بوون و هەر بەرهەڵستکاریەك و نەیاریەك لە دژی دەسەلاتداریەتی بووەیهیەکان سەر ئێشەیەکی زۆریان بۆ دەنایەوە ، لەبەر ئەوە دان پیانان بە میرنشینی عەنازی و بەرامبەر پابەندبوونی عەنازیەکان لە ڕووی ناردنی پارەو پوول و ڕێگرتن لەسەر هەڵنەدانی نەیاری بووەیهی و فەرمانڕەوایەتی کردن بە ناوی بووەیهیەکان و خەلافەتی عەباسی ئەمانەیان بەلاوە گرنگ بووە بووەیهیەکان.

کورتەیەك لەسەر ناودارترین میرانی میرنشینێ عەنازی:

- **ئەبولفەتح محەمەد کوڕی عەنازی شازنجانی:**

ئەم میرە بە دامەزرێنەری میرنشینی عەنازی دادەنرێت نزیکەی بیست ساڵان فەرمانڕەوایەتی کرد لە ساڵی ٣٨١ك / ٩٩١ز دەسەلاتی گرتە دەست، وا دیارە هەر لەسەرەتای دەسەڵات گرتنە دەستیداو لە ئەنجامی فراوانخوازیەکانی دەکەوتە چوارچێوەی ململانێ لەگەڵ میرنشینی حەسنەوەیهی[١٣]کوردی کە لەم کاتەدا " بەدری کوڕی حەسنەوەیهی " فەرمانڕەوایەتی دەکرد، بەڵام میری عەنازی هەستی بە توانایی حەسنەوەیهیەکان دەکرد لەبەر ئەوە هەمیشە داوای یارمەتی و پشت بەستنی دەکرد لە دەسەڵاتداریەتی بووەیهیەکان[١٤]، چونکە هەردوو لای عەنازی و بوەیهی هەر لەکۆنەوە پەیوەندی بەهێزیان لەگەڵ یەکتردا هەبوو، دوای ماوەیەك بووەیهیەکان میری عەنازی ئەبولفەتح محەمەدیان دیاری کرد بە لێپرسراوی بەرگری ڕێگای خۆراسان[١٥]، کە بەسوودترین و ناودارترین ڕێگای بازرگانی بوو لەسەدەکانی ناوەڕاست هەر لەچینەوە دەستی پێ دەکرد تا بەغدا کە بە ڕێگای ئاوریشم ناوی دەرکردبوو.

میر بەدری حەسنەوەیهی هێزو توانای خۆی کۆکردەوە توانی ناوچەکانی قرمیسین و حەلوان لەدەستی عەنازیەکان دەربهێنێت و کۆنترۆڵی بکات[١٦]، بەم جۆرەش لە ساڵی

٣٩٧ك / ١٠٠٧ز سـەروەت و سـامانێکی زۆری ئەبولفـەتح محەمـەد کەوتـە دەسـت بـەدر ئەمەش وای کرد کە میری عەنازی هانا بەرێتە بەر میری موسڵ " رافـع کـوڕی مـوقرن " بەڵام بێ سوود

بوو[١٧]، بەڵام قەدەر وا ڕێکەوت کە کـوڕێکی بـەدری حەسـنەوەیهی بـەناوی " هـیلال " چاوی لـە دەسـەڵاتی بـاوکی بـووە کەوتـە ململانـێ لەگەڵیـداو هێـزی حەسـنەوەیهیەکان بەرەو لاوازی چوو میر بەدر بەدیل گـیراو ئەبولفـەتح موڵکـەکانی تـوانی بگەڕێنێتـەوە لـە شارەکانی حەلوان و قرمیسین، مـیر فـەتح دوای ماوەیـەکی کـورت سـاڵی ٤٠١ك / ١٠١١ز کۆچی دوایی کرد[١٨] .

- **ئەبو شۆك فارس کوڕی ئەبولفەتح محەمەد :**

لە دوای باوکی ساڵی ٤٠١ك / ١٠١١ز فەرمانڕەوایـەتی میرنـشینی عـەنازی گرتـە دەسـت، هەر لەسەرەتای دەسەڵاتیەوە تووشی کێشەو ململانێیەکی زۆر بـوو بـە تایبـەتی لەگـەڵ حەسنەوەیهیەکان[١٩]، جگە لەمەش هـەر لەسـەرەتای دەسـەلاتیدا لەگـەڵ میرەکـانی لـە کێشەو گرفتدا بوو[٢٠] .

ئەبو شۆك هـەوڵی زۆری دەدا بـۆ بـەهێزکردنی دەسـەڵاتەکەی و هۆزەکـانی دەوروبـەری یارمـەتیان دەدا بـە تایبـەتی " لوڕەکـان "[٢١]، بـەڵام مـیری حەسـنەوەیهی تـاهیر کـوڕی هـیلال تـوانی کـۆنترۆڵی شـاری دینـەوەر بکـات و هێـزو توانـای خـۆی کـۆکردەوە بـۆ بەرەنگاربوونی میر ئەبو شۆك، جەنگێکی سـەخت بـەرپا بـوو مـیر ئـەبو شـۆك شکـستی خـــوارد و ســـوپاکەی پەرتـــەوازە بـــوو شـــاری " قرمیـــسین " کەوتـــە دەســـت حەسنەوەیهیەکان، لێرەدا میر ئەبو شۆك دڵە ڕاوکێیەکی زۆری هەبوو کە چـۆن بتوانێـت تۆڵەی خۆی بکاتەوە، لەبەر ئەوە داوای یارمـەتی لـە بنەماڵـەی مەزیەدیـەکانی ناوچـەی بابل کرد بۆ پشتیوانی ، مێژوونووس ( ابن الأثیر ) باس دەکات کە هەرچـەندە یارمـەتی

درا بەڵام جەنگی بەرپا نەکرد و پەیمانی ئاشتی پێ باشتر بوو لە شەڕکردن لەبەر ئەوە پەیمانی ئاشتیان داو بۆ پتەوکردنی پەیوەندییەکانیش میر ئەبو شۆك خوشکێکی خۆی بەخشییە میر تاهیر، بەڵام وا دیارە نیازی ئەبو شۆك خراپ بوو چونکە بە پیلانێکی ئەو میر تاهیری لە ناوبرد و ناوچەکانی بە تایبەتی شارەزووری خستەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی[٢٢]، وە لەساڵی ٤٣٠ك / ١٠٣٩ز توانی دەسەڵاتی بسەپێنێتەوە بەسەر شاری " قرمیسین " کە لە دوای حەسنەوەیهیەکان بنەماڵەیەکی کوردی بەناوی ( قوهیەکان ) فەرمانڕەوایەتیان دەکرد[٢٣] .

ئەبو شۆك ساڵی ٤٣٧ك / ١٠٤٦ز تووشی نەخۆشی هات و لەقەلای سیروان نزیك حەلوان کۆچی دوایی کرد و لە دوای خۆی میرنشینی عەنازی لاوازی تێ کەوت[٢٤] .

– **ئەبو ماجد مهلهل کوڕی ئەبولفەتح محەمەد :**

لەدوای ( ئەبو شۆك )ی برای دەسەڵاتی گرتە دەست لە ساڵی ٤٣٧ك / ١٠٤٦ز، بەڵام لەگەڵ دەسەڵات وەرگرتن تووشی نارەزایی کوڕێکی ( ئەبو شۆك ) بوو بەناوی (سەعدی) لەبەر ئەوە کەوتە ململانێ بەو پێیەی کە برازاکەی دەسەڵاتی میرایەتی بە شەرعیەتی خۆی دەزانی بەحوکمی ئەم ئادیایەی کە میرایەتی پشتاوپشتە، بەڵام وا دیارە هۆزە کوردیەکانی ناوچەکە پشتیوانیان لە (سەعدی) نەدەکرد و پشتیوانیان لە میری نوێ کرد[٢٥]، ئەمەش ناچاری کرد کە هانا ببات بۆ (ئیبراهیم یەنالی سەلجوقی) کە میرێکی سەلجوقی ناودار بوو سەرکردایەتی ناوچەکانی (هەمەدان) و دەوروبەری دەکرد، ئەمیش یارمەتی دا بەڵام (مهلهل کوڕی ئەبو فەتح محمد) بەردەوام بوو لە فراوانخوازیەکانی و توانی شاری (دینەوەر) کە ماوەیەکی کەم لە ژێر دەستی سەلجوقیەکاندا بوو وەری بگرێتەوە جگە لە شاری (قرمیسین) کە پاشماوەی میرێکی لاوازی حەسنەوەیهی لێ بوو بەناوی (بەدر کوڕی تاهیر کوڕی بەدر) کە هەلات و

عەنازیەکان شارەکەیان گرت، ئەم ڕووداوانە هەمووی لە ساڵی یەکەمی فەرمانڕەوایی میری عەنازی ڕوویاندا[٢٦]، دیارە ئەمەش توانایی و لێهاتوویی ئەم میرە دەگەیەنێت.
نەیارەکانی (ئەبو ماجد) زۆربوون یەکێکیان براکەی بە ناوی (سورخاب) کە هەمیشە بیری لە بەرژەوەندیەکانی دەکردەوە و لە ململانێ دابوو لەگەڵ براو برازاکانی[٢٧]، بەڵام ئەوەی سەر ئێشەی تەواوی بۆ میر دروست کردبوو (سەعد)یە بەتایبەتی کە وەکو ووتمان هانای بۆ سەلجوقیەکان برد و بەهەماهەنگی لەگەڵ یەکتر پلانیان دارشت بۆ گرتنی شاری (حەلوان)ی پایتەختی (ئەبو ماجد) لەبەر ئەوە (سەعدی) جەنگاوەرانی کۆکردەوە لەگەڵ سەلجوقیەکان چەندین جار هێرشیان کردە سەر پایتەختی عەنازی داگیریان دەکرد، بەڵام نەیاندەتوانی قەڵاکەی داگیربکەن کە (ئەبو ماجد مهلهل) خۆی تێدا قایم کردبوو[٢٨].
(سەعدی) وازی لە شاری (حەلوان) هێناو ڕووی لە مامەکەی تری کرد بەناوی (سورخاب) کە لەشاری (بەندەنیجین / مەندەلی) فەرمانڕەوا بوو، هێرشێکی کردە سەر ئەم شارەو بە تاڵانی برد، بەلام (میر سورخاب) توانی خۆی کۆبکاتەوە بەسەر برازاکەی زاڵ بێت و بەدیلی بگرێت[٢٩].
میر (ئەبو ماجد مهلهل) بەردەوام بوو لەسەر دەسەڵاتەکەی و هەمیشە تووشی نەیاران دەبووەوە چ لە بنەماڵەکەی یاخود لە دەسەڵاتداران بەڵام لە ئەنجامی زۆر دەست تێوەردانی سەلجوقیەکان لە ناوچەکانی دەسەڵاتی تا متمانەی بە (سوڵتان توغرول بەك)ی سەلجوقی کردو بەناوی ئەو وولاتەکەی فەرمانڕەوایەتی دەکرد[٣٠]، بەڵام لەساڵی ٤٤٤ك / ١٠٥٣ز (سەعدی) بۆ جارێکی تر خۆی کۆکردەوە و توانی هێرش بکاتەوە سەر مامی میری عەنازی و بەدیلی گرت و خۆی کردە دەسەڵاتداری عەنازی[٣١].

- **میر سەعدی کوڕی ئەبو شۆك فارس :**

لە ساڵی ٤٤٤ك / ١٠٥٢ز توانی دەسەڵات بەزەبر وەرگرێت لە مامەکەی، (میر سەعدی) هەر لەساڵی ٤٣٧ك/ ١٠٤٦ز یەوە تاوەکو دەسەڵاتی وەرگرت لە ململانێ دابوو لەگەڵ (ئەبو ماجد)ی مامی واتە سێزدە ساڵان تاوەکو لە کۆتاییدا بەسەریدا زاڵ بوو دەسەڵاتی لێ سەند و لەیەك لە زیندانەکان زیندانی کرد.

بەڵام کوڕێکی میری پێشوو ساڵی ٤٤٥ك/ ١٠٥٣ز بەناوی (بەدر) هانای بردە لای سوڵتانی سەلجوقی (توغرل بەگ) و داوای لێ کرد کە جەخت لە (سەعدی) بکات بۆ ئازاد کردنی باوکی (بەدر) بەڵام میر (سەعدی) ئەم داواکارییەی ڕەت کردەوە، ئەمەش ناڕەزایی و کینێکی زۆری بۆ (توغرول بەگ) هێنایەوە لە بەرامبەر (سەعدی) و سەلجوقیەکان تەواو یارمەتی بەدریان دا بەتایبەتی لە (شارەزوور) متمانەیان پێ داو سوپایەکی سەلجوقیش لە خزمەتی ئەودا بوو، پاشان سەلجوقیەکان دەستیان گرت بەسەر ناوچەکانی ژێر دەستی (سەعدی) و لەسەر دەسەڵاتی عەنازی لایاندا[٣٢].

- **میر بەدر کوڕی مهلهل کوڕی محەمەد :**

لە ساڵی ٤٤٦ك/ ١٠٥٤ز بە هاوکاری تەواوی سەلجوقیەکان دەسەڵاتی گرتە دەست، وەهەر لەگەڵ بوونی بە میری عەنازی ببوە دار دەست بەدەست ئەوان و هەمیشە بەکاریان دەهێنا بۆ مەرامەکانی خۆیان[٣٣]، بەم جۆرەش بەردەوام لە خزمەتی ئەواندا بوو، تەنانەت سوڵتانی ناوداری سەلجوقی (توغرول بەگ) کە لەساڵی ٤٥٥ك/ ١٠٦٣ز کۆچی دوایی دەکات، خەلیفەی عەباسی (القائم بأمر الله) بەدوای میرانی بەتوانای ناوچەکەدا دەنێرێت لەوانە (بەدر کوڕی مهلهل) بۆ بەغدا بۆ ڕاوێژیان کە چی بکرێت[٣٤]، وە سەرچاوەکانی بەردەست ئاماژە بەوە ناکەن کە تاساڵی چەند فەرمانڕەوایی گێڕاوە.

- لاوازبوون و ڕووخانی میرنشینی عەنازی :

لە دیارترین فاکتەرەکانی لاوازی میرنشینی عەنازی لاوازی کەسایەتی میرەکانی دواییە، ئەمەش وای کردبوو کە بە بیرێکی تەسکەوە بڕواننە میرنشینەکە ئەمەش وەکو دیاردەیەك دەبینرا لە میرنشینەکەدا، و ناکۆکیەکانیش لەگەڵ یەکتردا ماوەیەکی خایاند[٣٥].

وەکو دەبینین کە لەدوای مردنی میر (بەدر) کوڕەکەی بە ناوی (سورخاب) دەسەڵات دەگرێتە دەست کە کەسایەتیەکی دەوڵەمەند بوو توانیبووی ناوچەکانی شارەزوور و دەوروبەری تەواو کۆنترۆڵ بکات[٣٦]، بەڵام مژوول بوونی بەخۆی و لاوازی کەسایەتیەکەی و جگە لەمەش جەختی بەردەوامی سەلجوقیەکان دەسەڵاتەکەی زۆر بەرتەسك کردبۆوە، چونکە میرنشینی عەنازی هەر لەگەڵ دیارکەوتنی سەلجوقیەکان ڕووبەڕووی بارێکی خراپی ناوخۆ دەبێت، چونکە دەسەڵاتدارانی ئەوان بەردەوام دەستیان لە کاروباری ناوخۆی ئەم میرنشینە وەردەدا و هەوڵیان دەدا سیاسەتێکی ناوەندی توند پەیڕەو بکەن لەو ناوچانەی کەسەر بە دەسەڵاتیانە[٣٧].

لاوازی دیبلۆماسیەتی (سورخاب) بەوە دیار دەکەوێت کە زۆر بەئاسانی پشتیوانی خۆی وەردەگرێت لە کەسایەتیەکی سەلجوقی بۆ ئەوی ترو ناتوانێت ململانێ ی ناوخۆیی بنەماڵەی سەلجوقی بقۆزێتەوە کاتێك لە ساڵی ٤٩٢ك/ ١٠٩٨ز متمانە بە (محمدی کوڕی مەلیکشا) دەکات و دواتریش متمانە و پشتیوانی خۆی دەدات بە دوژمنی ئەم میرە سەلجوقییە بەناوی (بەرکیا رۆك کوڕی مەلیکشا) [٣٨]، بەم بۆنەیەوە ناوچەو قەڵایەکی زۆر لەدەست دەدات و تاساڵی ٥٠٠ك/ ١١٠١ز کۆچی دوایی دەکات[٣٩]، ئەم ناوچە کەمەی کە مابویەوە کەوتە دەست (میر مەنسوری عەنازی) لەسەر فەرمانڕەوایەتی مایەوە تا ڕووخانی میرنشینەکە کە نزیکەی سەدو سی ساڵی خایاند[٤٠].

## پەراوێزەکان:

(١) هلال الصابي: تاريخ الصابي، ج٧، ىص٥ " ابن الاثير: الكامل في التاريخ، ج٥، ص٥٨٩.

تاريخ ابن خلدون، مج٤، ص٥٠٠، ص١١٠٥.

(٣) شرفنامة، ل٥٦ " مێژووی حەسنەوەیهی و عەیاری، ل١٨٨ بەدواوە.

حلوان: شارێکە دەکەوێتە رۆژئاوای هەرێمی چیاکان لە رۆخی چیایەکی سەخت دەڕوانێتە عێراق نزیکە لەشاری (دینەوەر). بڕوانە : قدامة بن جعفر: الخراج، ص١٧٣ " الاصطخري: الأقاليم، ص٨٦.

(٥) ابن الاثير: الكامل، ج٥، ص٣٠٤.

(٦) قرميسين: یا کرمانشای ئێستا کە شارێکی گەورەو ئاوەدانە لەرۆژئاوای هەرێمی چیاکان نزیك شاری دینەوەر. ياقوت الحموي: معجم البلدان، مج٢، ج٤، ص٣٧٠.

(٧) فرست مرعي: الامارات الاسلامية في بلاد الكرد، ص٢٧١.

(٨) مروج الذهب ومعادن الجوهر، ج٢، ص١٠٨.

(٩) بوەیهیەکان: دەگەڕێنەوە سەر کەسێك بەناوی (بويه) کە ڕاوچیەك بوو لە ناوچەی دەیلەم و توانیان دەسەڵات بگرنە دەست لە تەبەرستان و هەرێمی چیاو فارس و دواتریش بەغدا ساڵی ٣٣٤ك/ ٩٤٥ز کە تاساڵی ٤٤٧ك/ ١٠٥٥ز دەسەڵاتداریتی دەکەن. كارل بروكلمان: تاريخ الشعوب الاسلامية، ص٢٤٥.

(١٠) مسكويه: تجارب الامم، ج٢، ص١٣٩، ١٥٥.

(١١) شرفخانی بدليسي: شرفنامة، ص٥٦.

(١٢) سلام احمد الشهرزووری: مباحث في تاريخ شهرزور في العصر العباسي، ص٢٨٨.

(١٣) میرنشینی حەسنەوەیهی: دەگەڕێتەوە بۆ حەسنەوەیهی کوڕی حوسێنی بەرزیکانی کە دامەزرێنەری ئەم میرنشینەیە کە توانی کۆنترۆڵی دینەوەر و هەمەدان و نەهاوەند بکات لە نێوان ساڵانی (٣٤٨-٤٠٦ك/ ٩٥٩-١٠١٥ز) خایاند تا بەدەستی ئەبو شۆکی دووەمی عەنازی کۆتایی هات. بڕوانە حسام الدين النقشبندي: الكرد في الدينور وشهرزور، ص١٣٠-١٤٠.

(١٤) ابن الاثير: الكامل، ج٥، ص٥٣٣.

(١٥) ابن الاثیر: الکامل، ج٥، ص٥٦٧.

(١٦) ابن الاثیر: الکامل، ج٥، ص٥٦٧.

(١٧) حسام الدین النقشبندی: الکرد، ص٢٠٦.

(١٨) ابن الاثیر: الکامل، ج٥، ص٥٨١، ٥٨٩.

(١٩) محمد أمین زەکی: خولاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان، بەرگی یەکەم، ل٧٢.

(٢٠) شرفخانی بدلیسي: شرفنامة، ل٥٦.

(٢١) ابن الاثیر: الکامل، ج٥، ص٦٠٥.

(٢٢) ابن الاثیر: الکامل، ج٥، ص٦١٢" شرفخانی بدلیسي: شرفنامه، ل٥٤.

(٢٣) ابن الاثیر: الکامل، ٦٥، ص٩٠ .

(٢٤) ابن الجوزي: المنتظم، ج٨، ص١٣٠" سلام احمد شهرزوری: مباحث في تاریخ شهرزور، ص٢٣٦.

(٢٥) ابن الاثیر: الکامل، ج٦، ص١٣٠" ابن خلدون: تاریخ، مج٥، ق٥، ص١١٠٦.

(٢٦) محمد جمیل رۆژبەیانی: مێژووی حەسنەوەیهی و عەیاری، ل٢١٥-٢١٧.

(٢٧) ابن الاثیر: الکامل، ج٦، ص١٣١-١٣٢.

(٢٨) ابن الجوزي: المنتظم، ج٨، ص١٣٠.

(٢٩) ابو الفداء: المختصر في أخبار البشر، ج٢، ص١٧١-١٧٢.

(٣٠) ابو الفداء: المختصر في أخبار البشر، ج٢، ص١٧١-١٧٢.

(٣١) ابن الاثیر: الکامل، ج٦، ص١٣١-١٣٢.

(٣٢) ابن الاثیر: الکامل، ج٦، ص١٣١-١٣٢.

(٣٣) شرفخانی بدلیسي: شرفنامه، ل٥٩.

(٣٤) ابن الاثیر: الکامل، ج٦، ص١٣١-١٣٢.

(٣٥) محمد جمیل رۆژبەیانی: مێژوو، ل٢٣٦.

(٣٦) شرفخانی بدلیسي: شرفنامه، ل٦١.

(٣٧) حسام الدین النقشبندي: الکرد، ص٢٤٠.

(٣٢) ابن الاثير: الكامل، ج٦، ص١٣١-١٣٢.

(٣٣) ابن الاثير: الكامل، ج٦، ص١٣١-١٣٢" شرفخانى بدليسي: شرفنامه، ل٦١.

(٣٤) شرفخانى بدليسي: شرفنامه، ل٦١.

**لیستی سەرچاوەکان:**

**یەکەم/ سەرچاوە رەسەنەکان بەعەرەبی:**


ابن الاثير: عزالدين ابي الحسن بن محمد الجزري (ت ٦٣٠هـ/ ١٢٣٢م).

١- الكامل في التاريخ، تحقيق علب شيرى، دار أحياء التراث العربي، (بيروت: ١٩٨٣).

الاصطخري: ابو اسحاق ابراهيم بن محمد الفارسي (ت ٣٤٠هـ/ ٩٥١م).

٢- أحسن التقاسيم في معرفة الأقاليم، أخرجه ج.هـ.مولر، مكتبة المثنى (بغداد: د.ت).

ابن الجوزي : ابو الفرج عبدالرحمن علي (ت ٥٩٧هـ/ ١٢٠٠م).

٣- المنتظم في تاريخ الملوك والأمم، مطبعة دائرة المعارف الاسلامية، (حيدر آباد-الدكن : ١٣٥٧هـ) .

ابن خلدون : عبدالرحمن بن محمد (ت ٨٠٨هـ/ ١٤٠٥م) .

٤- تاريخ ابن خلدون، دار الكتاب العربي، (بيروت: ١٩٨٦).

ابو الفداء: عمادالدين اسماعيل بن محمد (ت ٧٣٢هـ/ ١٣٣١م).

٥- المختصر في أخبار البشر، دار المعرفة للطباعة والنشر، (بيروت: د.ت).

قدامة بن جعفر: أبو الفرج الكاتب البغدادي (ت ٣٣٧هـ/ ٩٤٨م).

٦- الخراج وصناعة الكتابة، شرح وتحقيق محمد حسين الزبيدي، دار الرشيد للنشر، (بغداد: ١٩٨١).

المسعودي: أبي الحسن علي بن الحسين (ت ٣٤٦هـ/ ٩٥٦م).

٧- مروج الذهب ومعادن الجوهر، عني به محمد هشام النعسان و عبدالمجيد صلعمة حلبي، دار المعرفة، (بيروت: ٢٠٠٥) .

مسكويه: ابو علي محمد بن أحمد بن يعقوب (ت ٤٢١هـ/ ١٠٣١م).

٨- تجارب الامم وتعاقب الهمم، نشره أمدروز، مطبعة التمدن الصناعية، (مصر: ١٩١٤) .

هلال الصابي: ابو الحسن بن المحسن بن ابراهيم (ت ٤٨٨هـ/ ١٠٥٦م) .

٩- تاريخ الصابي، دار الكتب العلمية (بيروت: ٢٠٠٣) .
ياقوت الحموي: شهاب الدين بن عبدالله الرومي (ت ٦٢٦هـ/ ١٢٢٩م) .
١٠- معجم البلدان، دار الفكر، الطبعة الثالثة، (بيروت: ١٩٨٠) .

**دووەم / سەرچاوە نوێیەکان بەعەرەبی :**

حسام الدين علي غالب النقشبندي:
١١- الكرد في الدينور وشهرزور خلال القرنين الرابع والخامس الهجريين، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة بغداد، (بغداد: ١٩٧٥).
سلام أحمد شهرزوري:
١٢- مباحث في تاريخ شهرزور في العصر العباسي، (بغداد: ٢٠٠٦) .
فرست مرعي اسماعيل :
١٣- الامارات الاسلامية في بلاد الكرد في العصر العباسي الثاني، رسالة دكتوراه، كلية الاداب، جامعة صنعاء، (صنعاء: ٢٠٠٠) .
كارل بروكلمان :
١٤- تاريخ الشعوب الاسلامية، ترجمة نبيه أمين فارس و منير البعلبكي، مؤسسة الأرز للطباعة، (بيروت: ١٩٧٩) .

**سێیەم / سەرچاوە کوردیەکان :**

شرفخانی بدلیسي :
١٥- شرفنامە، هەژار کردویە بەکوردی، چاپخانەی نعمان، (نەجەف: ١٩٨١) .
محەمەد ئەمین زەکی :
١٦- خولاصەیەکی تاریخي کوردو کوردستان، چاپخانەو ئۆفیسی شڤان، (سلێمانی: ٢٠٠٤) .
محەمەد جەمیل رۆژبەیانی :
١٧- مێژووی حەسنەوەیهي و عەییاری، دار الحرية للطباعة، (بغداد: ١٩٩٦) .

# ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی سەدەی نۆزدە
# ( پرسی ڕۆژهەڵات و كۆنگرەی بەرلین )

مەغدید حاجی

پێشەكی :

ئـەوروپا لـە سـەدەی نـۆزدەدا گـەلێك ڕووداوی سیاسـی گرنگ،شـەڕی خوێنـاوی، پەیماننامە وڕێكەوتننامەی لەنێوان دەوڵەتە گەورەكان بەخۆوە بینیوە.

یەكێك لەو كێشە وپرسە گـەرم وگوڕانـەی كـە لـە سـەرەتای ئـەم سـەدەیە دەسـتی پێكرد و تاكو كۆتاییەكانی ئەم سەدەیە بەردەوام بوو، پرسی ڕۆژهەڵاتە. ئـەم پرسـە لـە ڕاسـتیدا لـە ئـەنجامی لاوازی دەوڵـەتی عوسمـانی سـەریهەڵدا ودەوڵەتـە ئەوروپاییـەكان لەنێوان خۆیاندا كەوتنـە ململانـێ لەسـەر چۆنیەتی دەستەبەسـەرداگرتنی موڵك وزەوی وزاری زۆر وفراونی ئەم ئیمپراتۆریەتە نەخۆشە، كە تـاكو سـەرەتای سـەدەی نـۆزدە بـە گەورەترین ئیمپراتۆریـەت لـە جیهـان دانـراوە وسـنوورەكانی هەرسـێ كیشوەری ئاسـیا وئەفەریقا وئەوروپایان داگیركردبوو.

ئەم پرسە (پرسی ململانێی ڕۆژئاوایە لەسەر گەیشتن بە ڕۆژهـەڵات)، هـەر یەكـە لـە دەوڵەتـە زلهێزەكـانی ئـەوروپا لـەمیانی بەرژەوەندییـەكانی خـۆی جموجـوڵی سیاسـی وسەربازی ئەنجامداوە.. كوردستانیش كەوتۆتـە نـاو بازنـەی ئـەو ململانێیـە. كۆنگرەی

بەرلینیش (١٨٧٨) وێستگەیەکی گرنگە بۆ چارەسەرکردنی ئاشتیانەی ئەم کێشەیە کە زۆر شەڕ وململانێ وپەیماننامەی لێکەوتۆتەوە.

ئێمە لەم کورتە باسەماندا بە پشت بەستن بە ژمارەیەك سەرچاوە وژێدەر دەربارەی مێژووی نوێی ئەوروپا کە زۆربەی کتێبە ژێدەرەکان بە عەرەبی دانراون– بەداخەوە بە دەگمەن سەرچاوە بە زمانی کوردی دەربارەی مێژووی ئەوروپا دەستدەکەوێت– پێناسەی پرسی ڕۆژهەلاتمان کردووە، هۆکارەکانمان خستۆتە ڕوو، تیشکمان خستۆتە سەر هەلوێستە جۆراوجۆرەکانی ئەوروپا و بەر لە کۆتاییشدا لەدوای خستنەڕووی ڕووداو گرنگەکانی بەلکان، خالەکانی کۆنگرەی بەرلین ودەرەنجامەکانی کۆنگرەکەمان خستۆتە ڕوو.

هیوادارم تونیبێتم تیشك بخەمە سەر ئەو بابەتە گرنگەی سەدەی نۆزدە" پرسی ڕۆژهەلات و کۆنگرەی بەرلین.

بەشی یەکەم:

پێناسە و هۆکارەکانی پرسی ڕۆژهەلات

تەوەری یەکەم:

پێناسەی پرسی ڕۆژهەلات (Eastern Question)

پرسی ڕۆژهەلات "بریتی یە لە چاوتێبڕین وهەولدانی دەولەتە زلهێزەکانی ئەوروپا بۆ دابەشکردنی دەولەتی عوسمانی ودەست بەسەرداگرتنی گشت ئەو زەوی وزار وهەرێمانەی لە بن دەستیدا بوون. هەروەها بریتییە لە کێشەی بوونی عوسمانیە موسولمانەکان لە ئەوروپا ودەرکردنیان تیایدا"[١].

(د. هاشم صالح التكريتي)يش لە كتێبی (المسألە الشرقيە)دا پێی وایە پرسی ڕۆژهەڵات "ئەو ناكۆكیە توندە بوو كە لە نێوان زلهێزە ئەوروپاییەكاندا لە كۆتاییەكانی سەدەی هەژدە تاكو كۆتایی دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی ۱۹۲۳ دا لەپێناو سەپاندنی دەسەڵات وزۆرانبازیان لەسەر دابەشكردنی موڵكەكانی دەوڵەتی عوسمانی لە ئارادا بووە"(۲).

لێكۆڵینەوەیەكی تر -هەروەكو لە كتێبی كوردستان لە بازنەی كێشەی ڕۆژهەڵاتیدا- هاتووە، پێناسەی پرسی ڕۆژهەڵاتی لە چوارچێوەی پرسیارێكدا كۆكردۆتەوە و دەڵێ: "بریتی یە لەوەی كێ میراتەكەی دەوڵەتی عوسمانی دابەشدەكات، ئەگەر ئەم دەوڵەتە دوچاری دارمان هات؟"(۳).

لەم بۆچوون وپێناسانەی سەرەوە بۆمان دەردەكەوێت كە پرسی ڕۆژهەڵات لە ڕاستی وبنچینەدا كێشەی چاوتێبڕین وتەماحگیری وململانێی دەوڵەتە باڵادەستەكانی ئەوروپایە لە سەدەی نۆزدە تاكو دوای جەنگیجیهانی یەكەم، چاوتێبڕین وتەماحگیریان لە دەوڵەتی عوسمانی نەخۆش ودابەشكردنی، واتا كێشە وململانێی نێوان دەوڵەتەكانی ڕۆژئاوا بووە لەسەر گەیشتن بە ڕۆژهەڵات ودگیركردنی بە ڕۆیشتن وبازدان بەسەر لاشەی دەوڵەتی نەخۆشی عوسمانی، نەك كێشەی ڕۆژهەڵات.

## تەوەری دووەم:

## هۆكارەكان وبنچینەی سەرهەڵدانی ئەم پرسە

ڕەگی ئەم كێشەیە بۆ نیوەی سەدەی شازدە دەگەڕێتەوە لەو كاتەی ئیڤانی تۆقێنەر (إيفان المرعب) (۱۵۳۳- ۱۵۸۳ن) هەوڵی فراوانخوازی دەدا ودەیویست نیوە دوورگەی قرم وئاستانە داگیر بكات، تاكو ڕێگایەك بۆ ڕووسسیا بدۆزێتەوە بگاتە ئاوە

شـلەتێنەکانی دەریـای سـپی ناوەڕاسـت. ڕووسـیا خـۆی بـە میراتگـری ئیمپراتۆریـەتی بێزەنتی حیساب دەکرد ودەیویست ئیمپراتۆریەتی عوسمانی پارچە پارچـە بکـات، هـەر بۆیـە زنجـیرە شـەڕێك لـەنێوان ئـەم دوو دەوڵەتـە ڕوویـداوە[٤]. بـەڵام تـاکو دەوڵـەتی عوسمانی ئیمپراتۆریەتێکی بەهێز بوو، لە سەردەمی فراوانخـوازی و فتوحاتـدا و خـاوەن هێزێکی گەورەبوو بۆ پاراستنی زەوی وزاری ودەستکەوتەکانی، کێشەیەك نەبوو بـەناوی پرسی ڕۆژهەڵات. پرسی ڕۆژهەڵات ئەو کاتە سـەریهەڵدا کـە دەوڵـەتی عوسمـانی توانـای فراوانخوزی بەرەو ئەورووپا نەما ولەچاو ئەورووپا هێزی سەربازی لە کورتیدا وبەرەو لاوزی دەچـوو، بەتایبـەتی لەچـاو هـەردوو دراوسـێی ڕووسـیا و نەمـسادا ولـەماوەی سـەدەی نۆزدەدا پرسی ڕۆژهەڵات زیاتر هاتە پێش دەوڵەتە ئەورووپاییەکان[٥].

بەر لە سەدەی نۆزدە لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە، کە ناپلیۆن لـە سـاڵی ١٧٩٨ میسری داگیرکرد، بێهێزی دەوڵەتی عوسمانی دەرکەوت، کە نەیتوانی بـەرگری لـە خـۆی بکـات. ئەمـەش بـووە هـۆی ئـەوەی دەوڵەتـە ئەورووپیـەکان چـاوی تـەماحگیری ببڕنـە موڵکەکانی دەوڵەتی عوسمانی هەر لـە جـەزائیرەوە تـاکو عێـراق، چـونکە ئـەم ناوچـانە شوێنێکی ستراتیجییان هەیە ودەوڵەتە ئەورووپیەکان دەستیان کرد بـە دەسـتوەردان لـە کاروباری ئەم دەوڵەتە نەخۆشە.

ئەوەی جێگای سەرنجە بەریتانیای زلهێز وخاوەن کەشتیگەلی گـەورە، کـە هەمیـشە چـاوی لـە پاراسـتنی ڕێگـا بازرگانیـەکانی ڕۆژهـەڵات، بەتایبـەتی هیندسـتان بـوو، لـە ململانێی دەوڵەتە ئەورووپیەکاندا لایەنگیریدەوڵەتی عوسمانی بوو، نەیدەویست هەرەس بهێنێـت ومانـەوەی بـە لاوازی پـێ باشـتر بـوو نـەوەك لـە ئـەنجامی ڕووخـانی دەوڵـەتی عوسمانی پارسەنگی دەوڵەتان لە ئەورووپا بە جۆرێك تێکبچێت بە بەرژەوەندی بـەریتانیا

تەواو نەبێت، یان دەوڵەتێکی نەخۆش وەکو عوسمانی لەسەر ڕێگای ڕۆژهەلات بێت باشترە نەوەك دەوڵەتێکی بەهێز مەترسی بخاتە سەر بەرژەوەندییەکانی.

–لاوازبوونی دەوڵەتی عوسمانی لە سەدەی نۆزدەدا زۆر هۆکاری هەیە، یەکێکیان شێوازی حوکمی تاکڕەوی وتوندڕەوی سوڵتانە عوسمانیەکان بوو، کە هەموو دەسەلاتێکی سیاسی وئاینی ڕەهایان خستبووە ژێر دەستی خۆیان لەو کاتەی ئەورویا پێشکەوتنی هزری وسیاسی وزانستی و پیشەسازی بەخۆوە دەبینی، سوڵتان و والیەکان بە ئارەزووی خۆیان تاکڕەوانە دەسەلاتیان بۆ بەرژەوەندی خۆشی تایبەتی خۆیان گرتبووە دەست، نە ئەنجومەنی نوێنەران، نە یاسا نە ڕێسا نەیاندەتوانی لە دەسەلات وزوڵمی سوڵتان و والیەکان کەم بکەنەوە وڕادەیەك بۆ دەسەلاتی نا عادیلانەیان دابنێن. دەبینین لە یەك کاتدا سوڵتان و والیەکان بە فرەژنی وڕابواردن وژیانی ناو کۆشك وتەلار کاتیان بەسەر دەبرد. ململانێ لەنێوان سوڵتان وکوڕەکانی یان برایەکانی لەسەر دەسەلات ڕوویدەدا، بێهێزی بواری دارایی وئابووری دەبووە هۆی ئەوەی سوڵتانەکان نەتوانن ئەو ئیمپراتۆریەتە گەورەیە بەڕێوەبەرن، بۆیە ڕاپەڕین وجیابوونەوە لەسەر بنچینەی مەزهەبی ونەتەوەیی لەناو چوارچێوەی دەوڵەتە فراوانەکەی عوسمانی ڕوویداوە، سەرباری چاوتێبڕینی تەماعکارانەی دەوڵەتە ئەوروپاییەکان(٦).

بە کورتی فراوانبوونی ئیمپراتۆریەت ولاوازی سوڵتانەکان وتاکڕەوییان لە حوکمڕانیدا و دەمار تووندی پیاوە ئاینیەکان وبلاوبوونەوەی گەندەڵی ودیاردەی بەرتیل وتێکچوونی باری دارایی وسەرەڕای لەبارییەك هەڵوەشانەوەی سوپای ئینکیشاری ودیاردەی پلە وپایە کڕین، هۆی سەرەکی لاوازی دەوڵەتی عوسمانی بوون وپرسی ڕۆژهەلاتیان بەدوادا هات.

-هەروەها ململانێی دێرینی نێوان ڕۆژهەڵاتی موسوڵمان ورۆژئاوای خاچ پەرست. گەلانی ئەورویا بە هەموو مەزهەبەکانیانەوە ڕقیان لە وولاتە ئیسلامیەکان دەبۆوە وچاوەڕوانی ئەو ڕۆژە بوون دەولەتە ئیسلامیەکان نەمێنن، جا چ عوسمانی بێت یان فارس یان عەرەب. ئەم هەست وسۆزە تاکی ئەوروپایی هاندا فشار بخەنە سەر کاربەدەستە سیاسیەکان ودەولەتە ئەوروپاییەکانیش لە هەنگاونان بەو مەبەستە دوو دڵ نەبوون ئەگەر لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیان ناکۆك نەبوونایە. بۆیە سیاسەتی فراوانخوازی دەولەتە ئەوروپاییەکان لەسەر حسابی دەولەتی نەخۆشی عوسمانی کارێك بوو بەدڵی کۆمەڵگەی فەلەی ئەوروپایی وسیاسەتمەدارە دەسەڵاتدارەکانیان بووە، بەلام لە چوارچێوەی بەرژەوەندییەکانی هەر دەولەتێکیاندا(٧).

- تێکچوونی هاوسەنگی لەنێوان دەولەتی عوسمانی نەخۆش و دەولەتە پەرەئەستێنەکانی ئەوروپا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر زیاتر لاوازبوونی دەولەتی عوسمانی ودابەشبوونی جێدەهێشت.

- هەروەها سەرهەڵدانی هەستی نەتەوەیی فەلەکان لە بەلکان وئارەزووی سەربەخۆبوون و جیابوونەوە لە دەولەتی عوسمانی هۆکارێکی تر پێکدەهێنێت. لێرەدا ڕووسیا زیاتر دەیویست بە بیانووی هاومەزهەبی ئەرسۆدۆکسی پشتگیری لە گەلانی بەلکان بکات ودەست بخاتە کاروباری ناوچەکە وفشاری ڕاستەوخۆی بۆ سەر دەولەتی عوسمانی دروست دەکرد.

لە بەرامبەر بەرزبوونەوەی هەستی ئاینی فەلەکان لە بەلکان وهەوڵدانیان بۆ سەربەخۆیی، سوڵتانی عوسمانی دروشمی (نەتەوەی ئیسلامی) بەرزکردەوە، دەیویست ئیسلام بکاتە هۆکاری هاوبەندی گەلەکانی چوارچێوەی دەولەتی عوسمانی(٨). بەلام ئەم دروشمەش دادی نەدا ونەخۆشیەکەی چارەسەر نەکرد.

## بەشی دووەم :

## هەڵوێستی دەوڵەتە گەورەکانی ئەوروپا وتەماحگیریان لە دەوڵەتی عوسمانی وقۆناغەکانی پرسی ڕۆژهەڵات

### تەوەری یەکەم :

### هەڵوێستی دەوڵەتە گەورەکان

هەر چوار دەوڵەتە بەهێز وکاریگەرەکەی ئەوروپا (ڕووسیا، بەریتانیا، نەمسا، فەرەنسا) بەردەوام چاویان بڕیبووە دەوڵەتی عوسمانی نەخۆش. لە بەرامبەر لاوازبوونیدا دەیانویست فراوانخوازی پەرەپێبدەن، بەتایبەتی لە سەدەی نۆزدە بزوتنەوەی داگیرکردن پەرەی سەند. بەڵام سەرەتا دەوڵەتە ئەوروپیەکان لەسەر دابەشکردنی دەوڵەتی عوسمانی ڕێکنەبوون. یان نەیاندەویست ئەم کارە ئەنجامبدەن. بەڵکو گەیشتبوونە ڕێکەوتنێکی ڕانەگەیەنراو بە پاراستنی ئەم دەوڵەتە وڕێگەگرتن لە هەرەسهێنانی، چونکە دەیانزانی بە ڕووخانی جەنگێکی گەورە لە ئەوروپا بەرپا دەبێت وبارودۆخی سیاسی تێکدەچێت، بەهۆی تێکچوونی پارسەنگی نێودەوڵەتی. بۆیە وایاندەبینی کە پاراستنی (سەڵتەنەتی عوسمانی) پێداویستییەکی ئەوروپاییە. لەهەمان کاتدا هەریەك لەم دەوڵەتە ئەوروپاییانە دەیویست هەر هەلێکی دەست بکەوێت دەستکەوتەکانی لەناو دەوڵەتی عوسمانی زیاتر بێت یان پارچەیەکی ئەم دەوڵەتە نەخۆشە بۆ خۆی دابڕێت[٩].

دامەزراندنی ئەڵمانیای بەهێز پارسەنگی ئەوروپا دەگۆڕێت :

لەدوای ئەو سەرکەوتنە گەورانەی کە پروسیا بەسەر نەمسا وفەرەنسا بەدەستی هێنابوو، پارسەنگی نێو دەوڵەتانی ئەوروپا ئاڵۆز بووبوو، ئەڵمانیا وەکو دەوڵەتێکی

زلهێز لـە ناوجەرگـەی ئـەورووپا دەرکـەوت، بـەڵام نەشـیدەتوانی وبـۆی نەدەچـووە سـەر دەست بەسەر ئەورووپادا بگرێت یان جارێ ئەمەی نەدەویست.

فەرەنسا بەزیووە ودووچاری زۆر تـەنگژە بۆتەوە، بەڵام هێشتا توانای ماوە ڕادەیەك بۆ زلهێزی نوێی ئەورووپا دابنێـت، چـونکە بـەریتانیا بە زیرەکـی ودووربینـی و دوربینـی خۆی نەیدەویـست سـوود لـە دەرفـەتی کـاتی وەربگرێـت وفەرەنـسا داگـیر بکـات تـاکو (هاوسەنگی نێودەوڵـەتی) تێکنەچـێت وئیمپراتۆریـەتی ئـەڵمانیا لەمـە بـەهێزتر نـەبێت. ڕووسـیا و نەمـساش نەیاندەویـست بارودۆخەکـە لەمـە ئـاڵۆزتر بێـت. بـەمجۆرە جـۆرە هاوسەنگیەکی ناسەقامگیری پڕ لـە مەترسـی لەسـەر پاشـەڕۆژی ئـەورووپا هاتـە ئاراوە. لەهەمان کاتـدا هەریەکـە لـە دەوڵەتـە ئەورووپاییـەکان پێـشبینی سـەرهەڵدانی تەنگـژەی نوێیان دەکرد تاکو لە میانیدا بەرچاویان ڕوون بێت وڕێگای پاشەڕۆژ ببینن، فەرەنساش بەدوای هاوپەیمانێکی نوێ دەگەڕا تاکو بتوانێ لەڕووی ئەڵمانیای بەهێز بوەستێت. بۆیە هاتنە پێشی پرسی ڕۆژهەڵات ڕێگای بۆ هەندێ لە دەوڵەتە ئەورووپاییەکان خۆشکرد کـە بە چ ئاراستەیەك هەنگاو بنێن[١٠].

پەیوەندی فەرەنسا لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی یان چاوتێبڕینی فەرەنسا مێژوویەکی دێرینـی هەیـە، پـەیمانی هاوکـاری ودۆسـتایەتی کەلـەنێوان سـوڵتان سـلێمانی قـانوونی وفرەنسوای یەکەم ساڵی ١٥٣٥ بەسـتراوە، ئەمـە بـەردی بناغـەی دانـاوە بـۆ پاراسـتنی مافی تایبـەتی فەرەنـسییەکان لـە خۆرهـەڵاتی نزیکـدا، بـەناوی پاراسـتنی مـافی ئـاینی دیانەکان، مافی ئازادی کەشتیگەلیان پێدرا، لـە دەریـای ناوەڕاسـت. تەنانـەت کەشـتیە ئەورووپاییەکان دەبوایە ئاڵای فەرنسا لە ئاوەکانی سـەڵتەنەتی عوسمـانی بەرزبکەنـەوە، تاوەکو ڕێگایان پێبدرێت بەناوی پاراستنی کاسۆلیك وشوێنە پیرۆزەکان لـەناو دەوڵـەتی عوسمانی فەرەنسا لە سەدەی نۆزدە دەستکەوتەکانی پـەرەپێبـدا ولـە ١٨٣٠ جـەزائیری

- گیرکرد ولە ١٨٥٩ پشکی زۆری ئیمتیازی کەناڵی سوێسی لە میسر دەستکەوت. بەم جۆرە فەرەنسا پێی خستە ڕۆژهەڵات.

هەڵوێستی ڕووسیا :

شوێنی جوگرافی ڕووسیا کە سنووری باکوری بەستەڵەکە وکەڵکی کەشتیگەلی نیە، ڕۆژهەڵاتی لێ دوورە، هیچ چاری نەبوو جگە لە هەوڵدان بۆ کردنەوەی بەڕووی باشوور وپەیداکردنی دەروازەی بازرگانی ئاوی بەرەو ئاوە گەرمەکانی دەریای ناوەڕاست لەلایەك و کەنداوی عەرەب لەلایەکی دیکەدا.

باشترین بیانوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی پاراستنی فەلەکانی بەڵکانە کە ئەمانیش وەکو ڕووسیا سەربە کەنیسەی ئەرسۆدۆکسین وڕووسیا خۆی بە دایکیان دادەنا. بۆیە کە دەوڵەتی عوسمانی لاواز بوو نەتەوەکانی سلاڤ هەوڵی ڕزگار بوونیان دەدا ڕووسیا هاوکاری کردن وبەم بیانووە ویستی خۆی لە گۆشەگیری جوگرافی ڕزگار بکات. بێگومان لەم هاتنەپێشەی ڕووبەڕووی دەوڵەتی عوسمانی داگیرکەری بەلکان دەبۆوە، ئەمەش مەترسی لەلای دەوڵەتە ئەوروپاییەکان پەیداکرد بەتایبەتی لەلای بەریتانیا کە هەوڵیدا ڕووسیا بۆ بەندیخانە جوگرافیەکەی بگێڕێتە دواوە[١١].

لەدوای جەنگی قرم (١٨٥٣- ١٨٥٦) کێبەرکێی (ڕووسی - نەمساوی) بۆ گرتنەوەی شوێنی یان میراتی عوسمانی لە بەلکان سەریهەڵدا.

نەمسا ڕووی لە ئەڵمانیا وەرگێڕا و چاویبڕیە هەرێمی بەڵکان. هەر پەرەسەندنێك لە ناوچەی بەلکانی عوسمانیدا ڕوویبدایە ئیمپراتۆریەتی نەمسا ومەجەر نەیدەتوانی لە بەرامبەریدا بێدەنگ بێت.

ڕووسیاش دەیویست ڕابەرایەتی بزوتنەوەی سلاڤی بکات، ئەو بزوتنەوەیەی زیانی بۆ هەردوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ونەمسا هەبوو، چونکە مەرامی ئەم بزوتنەوەیە بریتی بوو لە ڕزگاربوونی گەلانی سلاڤی کە لەژێردەسەلاتی هەردوو ئیمپراتۆریەتەکەدا بوون(١٢).

توخمەکانی ئاڵۆزی کێشەی بەلکان :

١- گرفتی ململانێی دێرینی خاچ پەرستەکان.

٢- سەرهەڵدان وپەرەسەندنی گیانی نەتەوەیی لەنێوان گەلانی سلاڤی خۆیاندا لە (صرب) وبولگاریا ومەجەر.

٣- گرفتی دەمارگیری تایفەگەری.

٤- ئارەزووی جیاکردنەوەی کەنیسە لەسەر بنچینەی نەتەوەیی.

٥- ڕووسیا دەیویست سوود لە لاوازی دەوڵەتی عوسمانی وهەستی بەرزی فەلە خاچ پەرستەکانی ڕووسیا وەربگرێت.. هەروەها نەش ونومای دەمار توندی نەتەوەیی فەلەکان لە بەلکان دژ بە دەوڵەتی عوسمانی موسوڵمان.

بێگومان بەرهەڵستی (ئینگلیزی- فەرەنسی- نەمساوی) توندی دژ بە ئارەزووەکانی ڕووسیا کە لە سەرەوە ئاماژەی بۆکراوە هەمیشە بۆتە هۆی تەمەندرێژی دەوڵەتی عوسمانی.

هەڵوێستی بەریتانیا :

سیاسەتی تەقلیدیی بەریتانیا بەرامبەر بە دەوڵەتی عوسمانی و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست تاکو ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە، بەگوێرەی ئەم خاڵانە بناغەی بۆ دارێژراوە :

١- پارێزگاریکردن لە قەوارەی دەوڵەتی عوسمانی لەبەرامبەر هەر فراوانخوازییەکی ئەوروپا لەسەرحسابی ئەم دەوڵەتە.

٢- بەهێزکردنی دەسەڵاتی بەریتانیا لەناو دەوڵەتی عوسمانی بەتایبەتی لە شوێنە ستراتیژییە گرنگەکان وەکو ڕێگای هات وچۆی جیهانی. بۆئەم مەبەستەش بەریتانیا ئەم هەنگاوانەی هاویشتووە:

أ- دزرائیلی کە بە باوکی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا دانراوە وایدەبینێ کە ئاستانە دەروازەی ڕێگایە بەرەو ڕۆژهەڵات. هەر بۆیە لە ساڵی ١٨٧٥ پشکەکانی خدێوی ئیسماعیل-ی میسری لە نۆکەندی سوێس کڕینەوە، وەکو ڕێگا خۆشکردن تاکو بەریتانیا دەست بەسەر ئەم نۆکەندە گرنگەدا بگرێت. لەهەمان کاتدا بەریتانیا بەرپەرچی هەر پێشکەوتنێکی ڕووسیای لە گەرووەکانی دەردەنیل وبسفۆر دەدایەوە.

ب- زیاتر بەهێزکردنی پێگەی بەریتانیا لە هەردوو بواری بازرگانی وسەربازیدا بەتایبەتی لە بواری هێڵەکانی هاتوچۆی ووشکانی و ئاوی دیجلە وفورات.

ت- بەریتانیا خۆی بە پاسەوانی میرنشینەکانی عەرەب لە بەحریەن وکەنداو ودەوڵەتی ئەلبوسەعید لە مەسقەت و زنجبار وخوارووی یەمەن داناوە.

پ- عەدەن بوو بە هەرێمی داگیرکراو لەلایەن بەریتانیا.

گۆڕان لە سیاسەتی بەریتانیا :

تاکو پەنجاکانی سەدەی ١٩ بەریتانیا هەمیشە ئامادەبوو لەسە دەوڵەتی عوسمانی شەڕ لە دژی ڕووسیا بەرپابکات، ئەگەر بهاتبایە ڕووسیا لەبەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی هێڵە سوورەکانی ببەزاندایە، دوایی سیاسەتی بەریتانیا گۆڕانی بەسەرداهات لە پاراستنی دەوڵەتی عوسمانی بۆ داگیرکردنی چەند بەشێکی ئەم دەوڵەتە یان دابەشکردنی.

پەرەسەندنی تەنگژەی بەلکان وهەڵوێستی ئاشتیخوازانەی بسمارك :

بسمرك درکی بەوەکردبوو کە کلیلی چارەسەرکردنی کێشەکان پەیوەندییان بە ڕۆژهەلات ودەولەتی عوسمانیەوە هەیە، پێی وابوو کارێکی باش نیە دەولەتەکانی ئەوروپا لەسەر دەولەتی عوسمانی خۆیان دووچاری شەڕی خوێناوی بکەن، دەیگووت ئەگەر دەولەتەکانی ئەوروپا دەیانەوێ چاو بەڕاگرتنی پارسەنگی نێودەولەتی بگێڕنەوە بالەسەر حسابی دەولەتی عوسمانی بێت. بسمارك دەیویست ئاشتی لە ئەوروپا بچەسپێنێت پەیوەندییەکانی نێوان بەریتانیا وفەرەنسا و ئەلمانیا ئاشتیانە بێت. نەیدەویست لەسەر داگیرکردنی ئەفریقا شەڕ لەنێوان بەریتانیا وفەرەنسا ڕووبدات.

تەوەری دووەم :

قۆناغەکانی پرسی ڕۆژهەلات

قۆناغی یەکەم : سەربەخۆبوونی یۆنان :

بارودۆخی یۆنان لەچاو هەرێمەکانی بندەستی عوسمانی لە هەمووان باشتر بوو. یۆنانیەکان پلە وپایەی باشیان لە دەسەلاتی عوسمانیدا هەبوو. شوێنی یۆنان ومێژووی یۆنان هاندەربوون بۆئەوەی گەلی یۆنان داوای سەربەخۆیی بکات.

لە سالی ١٨٢٢ ئەنجومەنی یۆنانی سەربەخۆبوون وشۆڕشی ڕاگەیاند. مترنیخ لە دژی وەستا، بەلام ڕۆشنبیرانی وولاتەکانی بەریتانیا وفەرەنسا وئەلمانیا هەست وسۆزیان بەرامبەر گەلی یۆنانی بزووت ودوای هاوکاری یۆنانیان کرد. هەلوێستی دەولەتی عوسمانی زۆر توند وخوێناوی بوو دژی یۆنانیەکان. بەلام شۆڕشگێڕانی یۆنان بەهاوکاری ڕۆژئاوا سەرکەوتن وسەربەخۆیی یۆنان ڕاگەیەنرا ویۆنان لە سالێ ١٨٣٢ دا بوو بە دەولەتێکی سەربەخۆ[١٣] وهەموو هەولێ وکۆششێکی سولتان مەحمود بەهەدەرچوو.

قۆناغی دووەم : ڕۆڵی محەمەد عەلی (١٨٣١ – ١٨٣٣) :

محەمەد عەلی ئەفسەرێکی ئەلبانی بوو لەناو سوپای عوسمانی کە دژی لەشکری فەرەنسا ڕەوانەی میسر کرابوو دواتر کە توانی حوکمی مەمالیك وەلابنێ ولەسەر داوای سوڵتان بەسەر بزووتنەوەی وەهابی سەرکەوت، دەسەڵاتی بەسەر میسر وسودان و وڵاتی شام سەپاند لێرەدا سوڵتان داوای یارمەتی لە ڕۆژئاوا کرد بۆ ڕاگرتنی مەترسی محەمەد عەلی لەسەر ئەستەمبوڵ. ڕووسیا هەلی قۆستەوە ولەشکری نارد ولە قوستەنتینیە نزیك بووەوە، بەریتانیا وفەرەنسا ترسیان لێ نیشت وداوایان لە سوڵتان کرد بە مەرجەکانی محەمەد عەلی ڕازیبێت[١٤].

قۆناغی سێیەم : محەمەد عەلی ١٨٣٩ – ١٨٤٠ :

سوڵتان مەحمود کە لە ئاکامی ڕاپەڕینی محەمەد عەلی ناچار بوو پەیماننامەی (هنکار اسکەلەسی) لەگەڵ ڕووسیا ببەستێت و کە بەگوێرەی ئەم پەیماننامەیە ڕووسیا دەسەڵاتی بەسەر دەریای ڕەش وگەرووەکاندا دەڕۆیشت ولە هەیبەتی سوڵتان کەم کرایەوە، سوڵتان خۆی کۆکردەوە وویستی تۆڵە لە محەمەد عەلی بکاتەوە، بەڵام ئەمجارەش لەشکری سوڵتان شکستی زۆری خوارد وداوای یارمەتی لە ئەورووپا کرد وئەمانیش لە مەترسی باڵادەستی ڕووسیا دەترسان بۆیە هاوکاری دەوڵەتی عوسمانیان کرد تاکو ڕێگا لە سەرهەڵدانی دەوڵەتێکی بەهێز لە میسر و وڵاتی شام بەسەرکردایەتی محەمەد عەلی بگیرێت. هەر چۆنێ بێ دەوڵەتی نەخۆشی عوسمانی بۆ ئەورووپا باشتر بوو. لەهەمانکاتدا ڕێگا لە ڕووسیا گیرا دەسەڵاتی لە ناوچەکە زیاتر بێت وبگاتە ئاوە شلەتێنەکانی ڕۆژهەڵات.

بەم شێوەیە دەوڵەتەکانی ئەوروپا، بەتایبەتی بەریتانیا ڕادەیەکیان بۆ (ناپلیۆنی ڕۆژهەڵات) دانا هەروەك چۆن پێشتر ڕادەیان ۆ (ناپلیۆنی ڕۆژئاوا) دانابوو. دەوڵەتەکانی ئەورپاش لە ئەنجامی ئەم باردۆخە زیاتر دەستیان لە کاروباری دەوڵەتی عوسمانی وەردەدا ولە کەنارەکانی باکوی ئەفریقا نزیك دەبوونەوە.

قۆناغی چوارەم : جەنگی قرم وئەنجامەکانی وگرێدانی کۆنگرەی پاریس لە ساڵی ١٨٥٦[١٥] :

دەوڵەتی عوسمانی لە دژی ڕووسیا بەشداری لە جەنگی (قرم)دا کردووە، لە ماوەی (١٨٥٣– ١٨٥٦ز)دا. ئینگلتەرا وفەرەنساش لە دژی ڕووسیا وبۆ پشتیوانی لە دەوڵەتی عوسمانی چوونەتە ناو ئەم شەڕە. چونکە لەوە ترساون ڕووسیای بەهێز هەرێم وزەوی وزارەکانی پیاوە نەخۆشەکە قوتبدات. ئەم جەنگەش بە تێکشکانی ڕووسیاو مۆرکردنی پەیماننامەی (پاریس) کۆتایی هاتووە. گرنگترینی بەندەکانی ئەم پەیماننامەیەش بریتین لە:

١– دەریای ڕەش بۆ هەموو کەشتیەکی بازرگانی دەوڵەتان کراوە دەبێت. نابێت ئەم دەریایە لەلایەن دەوڵەتی ڕووسیا و عوسمانی بۆ مەبەستی جەنگ بەکاربێت یان کارگەی دروستکردنی کەشتی جەنگی تێدا دابمەزرێت.

٢– دەوڵەتە ئەوروپاییەکانی بەشداری ئەم پەیماننامەیە زامنی سەربەخۆیی ویەکپارچەیی دەوڵەی عوسمانی دەبن.

٣– گەروەکانی (بسفۆر وچەنەقەلعە) بەڕووی کەشتیە جەنگیەکانی هەموو دەوڵەتاندا دادەخرێن.

٤- ڕووباری دانووب بۆ كەشتی بازرگانی هەموو دەوڵەتێك كراوە دەبێت ولەلایەن لیژنەیەكی ئەورووپاییش دەپارێزرێت.

٥- (قرم) بۆ ڕووسیا دەبێت و(قارس)یش بۆ عوسمانی.

٦- دەوڵەتە ئەورووپاییەكان دان بە خودموختاری هەردوو ویلایەتی (افلاق وبغدان)د دەنێن (صرب)یش سەربەخۆ دەبێت.

٧- دەوڵەتی عوسمانی بەڵێن دەدات ژیان وگوزارانی فەلەكان چاك بكات. دەوڵەتە ئەورووپاییەكانیش بەڵێن دەدەن دەست نەخەنە كاروباری ناوخۆیی[16].

ئەم دەوڵەتانە لە مۆركردنی ئەم پەیماننامەیە بەشدار بوون (بەریتانیا، فەرەنسا، ڕووسیا، دەوڵەتی عوسمانی، نەمسا، پروسیا، سردینیا).

قۆناغی پێنجەم : سەرهەڵدانی دەوڵەتەكانی بەلكان[17] :

لە ناوچەی بەلكان شۆڕش وكێشەی ئاڵۆز لە ئارادا بوون ، لە (هرسك) شەڕ لەنێوان زۆرینەی فەلە وكەمینەی موسوڵمان بەرپابوو، (جبل الاسود) و(صرب) داخلی شەڕ بوون، بولگارەكان ڕاپەڕین. هەڵوێستی دەوڵەتە ئەورووپاییەكان لەبارامبەر ئەو ڕووداوانە جۆراو جۆر بوو. ڕووسیا دەیویست دەست لەم ڕووداوانە وەربدات لە بەرژەوەندی ڕاپەڕیووەكان دژ بە دەوڵەتی عوسمانی. بەریتانیا دژی ئەم نیازەی ڕووسیا بوو. كە سوپای عوسمانی بەسەر (صرب)ەكاندا زاڵ بوو هەڕەشەی خستە سەر بولگاریا، ڕووسیا خۆی بۆ نەگیرا وشەڕی لە دژی دەوڵەتی عوسمانی ڕاگەیاند. سوپای ڕووس لە هەردوو ویلایەتی ئەفلاق وبلدان (ولافیا وملدافیا)ی ڕۆمانیا پەڕییەوە وئەم دوو ویلایەتەش لە دژی دەوڵەتی عوسمانی ڕاپەڕین. عوسمانیەكان بە توندی بەرگریان دەكرد. بەریتانیا هەوڵیدا سنوورێك بۆ ئەم شەڕە خوێناوییە دابنێت. لەم كاتەدا گۆڕانكاری لەناو دەوڵەتی

عوسمانی ڕوویدا، (مەدحەت پاشا) بوو بە سەدری ئەعزەم، عەبدولحەمیدی دووەم بوو بە سوڵتان (١٨٧٦– ١٩٠٩) یەکەمین دەستوور لە دەولەتی عوسمانی لە ساڵی ١٨٧٦ ڕاگەیەندرا.

و چاوەڕوان دەکرا ئەماجرەش بەریتانیا لە شەڕی بەلکان لە دژی ڕووسیا پشتگیری لە دەوڵەتی عوسمانی بکات، بەڵام بارودۆخ وپارسەنگی نێودەوڵەتی گۆڕانی بەسەردا هاتووە. بۆیە (بابی عالی) ناچار داوای ڕاگرتنی شەڕی کرد ولە ٣١ینایر ١٨٧٨ ئاگربەست ڕاگەیەنرا وپەیماننامەی (سان ستیڤانۆ) لە بەرژەوەندی ڕووسیا لەنێوان دەوڵەتی نەخۆشی عوسمانی وڕووسیا لە ٣ی مارسی/ ١٨٧٨ مۆرکرا.

ئەم ڕێکەوتننامەیە بە دڵی دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان نەبوو بۆیە لە دژی وەستان[١٨]. چونکە بە گوێرەی ئەم پەیماننامەیە بولگاریای گەورە دامەزرا کە بووە داردەستێکی بەهێز بەدەستی ڕووسیا کە بەهۆیەوە هەڕەشەی بەردەوام لە دەوڵەتی عوسمانی بکات[١٩]. سوڵتانیش ناچار بوو دان بە سەربەخۆیی صربیا و(جبل الاسود) و ڕۆمانیادا بنێت وبۆسنە وهێرسکیش سەوربەخۆیی کارگێڕیان بەدەست هێنا. ڕووسیاش باتوم وقارسی وەرگرت[٢٠]. ئەمە بووە هۆی پەیدابوونی ترسی زیاتر و وروژاندنی بەریتانیا، بەتایبەتی کە بەریتانیا بینی ڕووسیا لە بەری ڕۆژهەڵاتیش دەستی بەسەر (قارس واردهان وئەرزەڕۆم) و زۆرینەی ئەرمینیادا گرتووە.

لێرەدا بەریتانیا وایلێکدایەوە کە ڕووسیا لەمەولا دەبێتە هەڕەشە بۆ سەر ڕێگاکانی ڕۆژهەڵات، ڕێگا بەرەو میزۆپۆتامیا و وڵاتی شام ومیسر. بۆیە زۆر لەم پەیماننامەیە بەد گومان بوو.

ـولتانی عوسمانی ڕێگای بە بەریتانیا دا لە ساڵێ ١٨٧٨ دوورگەی قوبرس داگیر کات تاکو چاودێری بزووتنەوەی ڕووسیا بەرەو ڕۆژهەڵات بکات[٢١]. ئەمەیان بەگوێرەی ڕێکەوتننامەیەکی نهێنی بووە لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی وبەریتانیای مەزندا.

ئەم بارودۆخە ئاڵۆزە وتارمایی جەنگ لەنێوان ڕووسیا و بەریتانیا هەلی بۆ بسمارك ڕەخساند کە بە ڕۆڵی پاراستنی ئاشتی جیهان هەڵسێت وداوای گرێدانی کۆنگرەیەکی ئەوروپایی کرد، کە دەوڵەتە ئەوروپاییەکان لەسەر پارچە زەوییەك لێر وپارچەیەك لە ڕۆژهەڵات خوێنی یەکتر نەڕێژن.

## تەوەری سێیەم :

## کوردستان وپرسی ڕۆژهەڵات

بۆ ئەم تەوەرە پشتم بە کتێبەکەی توێژەر کامەران محەمەد حاجی (کوردستان لە بازنەی کێشەی ڕۆژهەڵاتیدا ١٨٠٠– ١٩٠٠) بەستووە کەتیایدا لەم بارەیەوە گەیشتۆتە چەند ئەنجامێك وەکو: "کورستان وەکو بەشێك لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی نزیك، هەروەها وەکو بەشێك لە موڵکەکانی دەوڵەتی عوسمانی (پیاوە نەخۆشەکە) هەر لە سەرەتای سەدەی نۆزدە کەوتە نێو بازنەی ململانێ وڕکابەرێتی زلهێزەکانی کێشەی ڕۆژهەڵاتی".

لە نەخشەی ڕووسەکانیشدا، واتە گەیشتنی بە ئاوە گەرمەکان ودژایەتیکردنی پێگە ودەسەڵاتی بەریتانییەکان لە ڕۆژهەڵاتی نزیکدا.. کوردستان بەشێك بوو لەو ڕێگایانەی کە بەهۆیەوە دەیانتوانی هەڕەشە لە پێگە وبوونی بەریتانیەکان لە ناوچەکەدا بکەن.

بەلای فەرەنسیەکانیشەوە کوردستان بەشێك بوو لەو ناوچانەی کە دەکرا لەوێوە هەڕەشە لە پێگەی بەریتانییەکان لە هندستان وناوچەکەدا بکرێت. بەلای ئەڵمانەکانیشەوە کوردستان ناوچەیەکی گرنگ وستراتیژی بوو، چ لەبەرئەوەی کە

دەمێك بوو ئەڵمانەكان ئاگاداری سەنگی ئابووری ناوچەكە بوون، بۆیە وەكو بەشێك لەو ناوچانەی كە دەبووایە هێڵە ئاسنینەكانی پێدا تێپەڕبێت.

زلهێزە ئەوروپاییەكان (بەتایبەتی بەریتانیا) خاوەنی چەندین بەرژەوەند ئابووری، سیاسی، سەربازی و ئاینی كاریگەر بوون لە كوردستان وناوچەی ڕۆژهەڵاتی نزیكدا هەربۆیەشە ململانێ وڕكابەرایەتیەكانیان ڕاستەخۆ یان نا ڕاستەوخۆلە كوردستان وناوچەكە ڕەنگی دەدایەوە. بۆیە هەرچی ڕووداوو وپێشهاتی ناوچەكە بوو بە ڕووداوەكانی كوردستانیشەوە كەوتنە ژێر كاریگەری ململانێ وڕكابەرێتی زلهێزەكانەوە[٢٢].

(عبدالعزیز نوار)ی مێژوونووسیش لە كتێبی (تأریخ العراق الحدیث) دا نووسیوویەتی ودەڵێ: "ئیمپریالیزمی بەریتانیا دەستی خستەناو كاروباری ناوەوەی دەوڵەتی عوسمانی وفارس، هەروەها كوردستانیش، بەو نیازە بەرژەوەندی ئابووریخۆی لەو ناوچەیەدا بپارێزێ ولەهەمان كاتیشدا بەربەستی پەرەسەندنی دەسەڵاتی ڕووسیای قەیسەری لەو ناوچەدا بكات[٢٣].

## بەشی سێیەم:
## كۆنگرەی بەرلین ١٨٧٨
### تەوەری یەكەم:
### خاڵەكانی كۆنگرەی بەرلین

بەریتانیا ونەمسا نەیاری ڕێكەوتننامەی (سان -- ستیڤانۆ) بوون، چونكە ئەم ڕێكەوتننامەیە بوارێكی باشی بۆ ڕووسیای سلاڤی دەڕەخساند دەست لە كاروباری بەلكان وەربدات بەتایبەتی دوای ڕزگاربوونی یۆنان و(صربیا) و(جبل الاسود) و ڕۆمانیا

...مەزراندنی بولگاریای گەورە کە لەژێر چاودێری ئاشکرای ڕووسیادا بوو، ئەم ...ەنجامەش دەسەڵاتی ڕووسیای لە بەلکان بەهێز دەکرد. ئەمە بووە مایەی نارەزایی ...ەریتانیا و نەما وهەرەشەی شەڕیان کرد ئەگەر بێتو ڕووسیا داواکارییەکانیان ...ەلمێنێت[٢٤]. ڕووسیاش بەتەنیابوو بۆیە ناچار بوو پەیماننامەکە بخاتە پێش ...ۆنگرەی بەرلین. کە لە ساڵی ١٨٧٨ بەسەرۆکایەتی (بسمارك) بەسترا و وڵاتە گەورەکانی ئەوروپا تیایدا بەشدار بوون.

(دزرائیلی) سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا ڕۆڵێکی کاریگەری لەم کۆنگرەیەدا بینی، چ ...ە ئامادەکاری یان لە دارشتنی خاڵەکانی دوای گفتوگۆ و وتوویژێکی درێژخایەن کە ...یلۆماتکارە تورکەکانی تیایدا دوورخرابۆوە بڕیار لەسەر ئەم خلاڵنەی خوارەوە درا:

١- بولگاریا بۆ سێ بەش دابەشدەکرێت:

أ- بولگاریای سەربەخۆ، بەڵام ساڵانە مەبلەغێك دەداتە سوڵتان.

ب- رومیلی ڕۆژهەڵات دەخرێتە ژێر دەسەڵاتی سەربازی تورکیا.

ت- مەقدونیا، ئەمیش لەژێر دەسەڵاتی تورکیادا دەبێت.

بەمجۆرە ئاواتی ڕووسیا لە پێکهێنانی دەوڵەتێکی سلاڤی گەورە (بولگاریای گەورە) لەبارچوو.

٢- کاریگەری پەیماننامەی پاریس ١٨٥٦ بەردەوام دەبێت.

٣- سەربەخۆبوونی ڕۆمانیا و (صربیا) و (جبل الاسود).

٤- بابی عالی دەست لە ئەردەهان وباتۆم هەڵدەگرێت بۆ ڕووسیا.

٥- بەدەستهێنانەوەی دۆلی ئالاکرد وشاری بایەزید لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی.

٦- دەوڵەتی عوسمانی بەڵێنی دا بەخێرایی چاکسازی لە ئەرمینیا ئەنجامبدات وئەرمەنەکان لە کورد وچەرکەس بپارێزێت.

٧- دەوڵەتی عوسمانی بەڵێن دەدات کەوا دان بە ئازادی بیروڕای ئاینی لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا بنێت.

٨- قونسوڵگەرییەکان مافی پاراستنی ڕەعیەتەکانی خۆیان هەبێت.

٩- ئازادی دەریاوانی لە دانوب دابین بکرێت[٢٥].

ئەوەی جێی سەرنجە لەم کۆنگرەیەدا ولە کۆنگرەکانی ڕابردووشدا دەوڵەتە زلهێزەکانی ئەورووپا هیچ باسیان لە مافەکانی کورد وکوردستانی بندەستی عوسمانی نەکردووە، بەڵام لە خەمی ئەرمەندا بوون. هاوکاری دەوڵەتی عوسمانیشیان کردووە بۆ لەناوبردنی میرنشینە کوردییەکان وسەرکوتکردنی شۆڕش وڕاپەڕینەکانی کورد.

## تەوەری دەووەم:
## ئەنجامەکانی کۆنگرەی بەرلین

١- بۆچوون وخواستی بەریتانیا هاتەدی، ئەویش بە لەناوبردنی پەیماننامەی (سان ستیڤانۆ) و ڕێگاگرتن لە دامەزراندنی بولگاریای گەورە. هەروەها گێڕانەوەی ڕومیلی ڕۆژهەڵات تاکو چیاکانی بەلکان بۆ دەوڵەتی عوسمانی. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە دەوڵەتی عوسمانی سنوورێکی سروشتی باشی بۆ بڕەخسێت وبتوانێ بە ئاسانی بەرگری لەم سنووە بکات.

٢- سەرکەوتنی سیاسەتە ناودارەکەی (بسمارك)[٢٦] کە بریتی بوو لە (پێکهاتنەوە وقەرەبووکردنەوە).

٣- لەبەرامبەر ڕێکەوتننامەی نهێنی (بەریتانیا- دەوڵەتی عوسمانی)، بەریتانیا دوورگەی قوبرسی دەستکەوت، کۆنگرەکە دانی بەم ڕێکەوتننامەیەدا نا، بەڵام فەرەنسا داوای داگیرکردنی تونسی کرد، هەروەها بەریتانیا وفەرەنسا وەکو یەك

دەسەڵاتیان لە میسر بەهێزکرد، بەجۆرێك میسرییەکان دەسەڵاتێکی ئەوتۆیان نەما.
ـەدوای ئـەوەی فەرەنـسا لـە سـاڵی ١٨٨١ تونـسی داگرکـرد، بـەریتانیا لـە ترسـی فراوانبـونی دەسـەڵاتی فەرەنـسا لـە دەریـای ناوەڕاسـت لـە سـاڵی ١٨٨٢ میـسری داگیرکرد.

٤- لەناوبردنی پەیماننامەی سان ستیڤانۆ، نەوەستانی بـەهێزەوەی بـسمارك لـە تـەك ڕووسیا، هـەروەکو ڕووسـەکان چاوەڕێبوون، بوونـە هـۆی ئـەوەی پەیوەندییـەکانی نێوان سێ زلهێزەکەی ئەوروپا ساردی وناکۆکی تێبکەوێت. تووڕەبوونی ڕووسـیا بـە سوود بـۆ فەرەنـسا گەڕایـەوە، چـونکە ئـەو دۆسـتەی دەسـتکەوت کـە لـە ئـەوروپا بەدوایدا دەگەڕا ولە گۆشەگیری ڕزگاری بوو.

٥- لەلایەن دەوڵەتەکانی (بەریتانیا، ڕووسـیا، فەرەنـسا، نەمـسا) غـەدرێکی گـەورە لـە دەوڵـەتی عوسمـانی کـرا، ئـەڵمانیایش لـە ئـەنجامی کـۆنگرەی بـەرلین هیـچی دەستنەکەوت، پارچەیەکیشی لە دەوڵەتی عوسمانی نەبرد. ئەمە پـاڵی بـە سـوڵتان عەبدولحەمیـدەوە نـا لـە ئـەڵمانیا نزیـك بێتـەوە و سـوود لـە پێـشکەوتنی زانـستی وسەربازی ئەڵمانی وەربگرێت. ئەمەش بـووە سـەرەتای هاوپـەیمانێتی (ئـەڵمانی - عوسمانی) کە لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا بەرجەستەبوو.

٦- تێکچوونی بارودۆخ وشان وشەوکەتی دەوڵەتی عوسمانی، لەئەنجامی لە دەسـتدانی پێگەی لـە بـەلکان وبـاکوری ئـەفریقا وسـودان وچـەند ناوچـەیەکی نیمـچەدوورگەی عەرەب بوونە هۆی ئەوەی کـە تـوخمی تـورکی دەسـەڵاتدار لـە کاروبـاری کـارگێڕی وسوپادا لەگەڵ توخمی عەرەب ڕووبەڕووی یـەك ببنـەوە، چـونکە ئـەوەی دووەمـین (عەرەب) دوای هاوبەشی دەکرد لەگەڵ تورکدا.

دەستپێشخەری سوڵتان عەبدولحەمید بە دەرکردنی دەستوور لە ساڵی ١٨٧٦ بەلای سیاسەتمەدارەکان هەنگاوێکی مەزن بوو بۆ ڕزگاربوونی دەوڵەت وگەلانی دەوڵەتی عوسمانی لەو تەنگژەی لەناویدا دەژیان، بەڵام لە ئەنجامی ئەو شەرمەزارییەی بەهۆی کۆنگرەی بەرلین ڕووبەڕووی دەوڵەتی عوسمانی بووەوە سوڵتان دەستووری ڕاگرت وتاکرەوانە تاکو ساڵی ١٩٠٨ حوکمی کرد. ئەمەش پاڵی بە گەنجە ئیتیحادیەکانەوە نا شۆڕش لە دژی سوڵتان بەرپا بکەن. لە هەمان کاتدا پەیتا پەیتا بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی، بە گەلی کوردیشمانەوە سەریهەڵدا.

٧- دەربارەی کێشەی ئەرمەن، نیازەکان بەو ئاراستەیەوە بوون کە مافی سیاسی ومەدەنی زیاتر بە ئەرمەنەکان بدرێت لە چوارچێوەی دەوڵەت عوسمانی، بەڵام ئەرمەنەکان دەوڵەتی عوسمانیان بە لاوازی بینی هاوکاریان لەگەڵ ڕووسیا کرد وزێدەڕۆییان پیشاندا لە داواکردنی مافەکانیان. دەوڵەتی عوسمانی دژە ڕووسیاش ئەم هەڵوێستەی پێ قبوڵ نەکرا. ئەمە سەرەتای چاندنی تۆوی دژایەتیکردنی ئەرمەن وئەو قەسابخانە نا مرۆڤانەیەبوو کە دواتر بەرامبەر بەگەلی ئەرمەن لەلایەن عوسمانیەکانەوە ئەنجامدرا و تاکو ئێستا ئەوروپای ڕۆژئاوا دۆسیەی قەتل وعام کردنی ئەرمەنەکانی دانەخستووە، (دەوڵەتی عوسمانی- تورکیا) تۆمەتبار دەکات.

٨- بۆماوەی چەندین ساڵ تارمایی جەنگ لە ئەوروپا دوورکەوتەوە، بەم جۆرە (بسمارك) ئەو ئاشتییەی چەسپاند کە هەولی بۆ دەدا و لەژێر سێبەری ئەم ئاشتییەدا ئابووری ئەڵمانیا گەشەی کرد، لەهەمان کاتدا ئەڵمانیا هەولی دەدا لەتەك دەوڵەتەکانی دیکەی ئەوروپا دەست بە داگیرکردن بەتایبەتی لە ئەفریقا بکات. ئەم

ـ ڕووخەش ڕێگای خۆشکرد بۆ ئەنجامدانی کۆنگرەیەکی تر لە بەرلین (١٨٨٤-١٨٨٥) کە بووە هۆی دابەشکردنی ئەفریقیا لەنێوان دەوڵەتە ئەوروپاییەکان[٢٧].

٤- بزاڤی نێو میرنشینە کوردییەکان لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا ڕاپەڕین وشۆڕشەکانی کورد لەنیوەی دووەمی هەمان سەدە، لە گرنگترین ئەو ڕووداوە دیار وبەرچاوانە بوون کە سیمایەکی سەرەکی مێژووی گەلی کوردیان لە ماوەی سەدەی نۆزدە پێکهێناوە[٢٨]. ئەم بزاڤە لەدوای کرنگرەی بەرلینی لەسەرەتای سەدەی بیستەم پەرەی سەند وهەستی ڕزگاری نەتەوەیی لەلای لاوانی کوردی هۆشیار لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانی چ لە ئەستەمبوڵ یان هەندێك شاری تر لە پەرەسەندندا بوون. دەرچوونی ڕۆژنامەی (کوردستان) لە قاهیرە ساڵی ١٨٩٨ و دواتر دامەزراندنی چەندین کۆمەڵە وڕێکخراوی کوردیی هەمووی دەرەنجامی ئەو پەرەسەندننە بوون کە لە ئەنجامی بارودۆخی کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم ناوچەکەی گرتەوە.

## ئەنجام

لە چارەکی کۆتایی سەدەی هەژدە وسەرەتای سەدەی نۆزدە، لەو کاتەی دەوڵەتە گەورەکانی ئەورووپا لە ڕووی ئابووری (پیشەسازی وبازرگانی)، لە گەشەسەندندا بوون ولە ڕووی سەربازیشەوە خاوەن هێزی گەورە وپڕچەکی نوێ بوون بە گوێرەی ئەو کات، دەوڵەتی عوسمانی ئەگەر چی وەکو ڕووکەش گەورەترین ئیمپراتۆریەت بوو لە جیهاندا بەڵام لە ناوەڕۆکەوە بەرەو لاوازی وداڕووخان دەڕۆیشت وبە پیاوە نەخۆشەکە ناودەبرا، بۆیە ململانێ لەنێوان دەوڵەتە ئەورووپاییەکان لە سەرچاوبڕین لە موڵك وزەوی وزاری

وشوێنە ستراتیژیەکانی دەوڵەتی عوسمانی چۆنیەتی داگیرکردنی دەستی پێکرد وزیاتر لە سەدەیەکی خایاند.

فەرەنسا بەر لە هەمووان هەر لە سەدەی چواردە بەناوی پاراستنی شوێنی پیرۆزی فەلەکان لە ڕۆژهەڵاتی نزیك چاوی بڕیوەتە ناوچەکە. ڕووسیاش بە بیانووی هاومەزهەبی لەلایەك دەیویست لە نیمچە دوورگەی بەلکان ژێر پێی قایم بکات ولەپێناوی بەرژەوەندییە ستراتیژیەکانی مەبەستیٚ بوو بگاتە ئاوە شلەتێنەکانی ڕۆژهەلات. بەریتانیاش لە هەمووان بە تواناتر وتەماحگیرتر بوو لە زەوی وزاری دەوڵەتی عوسمانی وپەیوەندی لەگەڵ دەوڵەت باش بوو بۆ پاراستنی ڕێگا بازرگانیەکان بەرەو ڕۆژهەلات بەتایبەتی هندستان وپاراستنی بەرژەوەندییەکانی لە ڕۆژهەلات بەگشتی.

بەریتانیا هەرگیز نەیویستووە فەرەنسا وڕووسیا دەست بخەنە کاروباری دەوڵەتی عوسمانی وداگیریبکەن، هەمیشە مانەوە وپاراستنی دەوڵەتی نەخۆشی عوسمانی پیٚ باشتر بووە لە هەر جێگرەوەیەکی نادیاری تر لە ڕۆژهەڵاتی نزیکدا، بۆیە لە کاتی هەر هێرش وپەلاماردانێکی چ ڕووسیا چ فەرەنسا، یان هەوڵەکانی محەمەد عەلی والی میسر بۆ سەربەخۆیی، بەریتانیا بێدەنگ نەبووە و پشتگیری لە دەوڵەتی عوسمانی کردووە.

هەروەها لە ئەنجامی لاوازی دەوڵەتی عوسمانی گەلانی بەلکان کە لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا بوون هەمیشە هەوڵی ڕزگاری وسەربەخۆییان داوە ویۆنانیش پێش هەموویان لە بندەستی دەوڵەتی عوسمانی دەرچووە وسەربەخۆ بووە.

بەشێکی گەورەی کوردستانیش وەکو وڵاتێکی دابەشکراو وداگیرکراوی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی لە بازنەی ململانێی ڕۆژئاوا لەسەر ڕۆژهەڵاتی عوسمانی دوورنەبووە، لەو کاتەی میرنشینە کوردییەکان هەوڵی سەربەخۆییان داوە، بۆ بەهێزکردنی ناوەند ودروست نەبوونی کوردستانێکی سەربەخۆ. بەم جۆرە دەوڵەتی

عوسمانی میرنشینە کوردیەکان لەناو ببات وشۆڕشەکانی کوردستانی باکور سەرکێنێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە ئێرانیش هاوکاری دەوڵەتی عوسمانی کردووە.

لەگەڵ زیاتر لاوازبوونی دەوڵەتی عوسمانی دەوڵەتە ئەوروپاییەکان زیاتر چاوی تەماحیان تێبڕیووە، بۆیە زنجیرە جەنگێکی لە دژی دەوڵەتی عوسمانی بەرپا کردووە، هەر کاتێ لەو جەنگانە سەرکەوتوو بووە وشوێنی ستراتیژی بندەستی دەوڵەتی عوسمانی داگیرکردوو و لە ئاوە شلەتێنەکانی ڕۆژهەلات بە تایبەتی دەریای ناوەڕاست نزیك بۆتەوە. بەریتانیا بۆ پشتگیری لە دەوڵەتی عوسمانی ڕاپەڕیووە وڕێگای نەداوە مەرامەکانی ڕووس سەربگرن. دواجار بەریتانیا و وڵاتە زلهێزەکانی دیکەی ئەوروپا توانیان ڕێکەوتننامەی (سان ستیڤانۆ) لە باربەرن.

لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزەدەدا بسمارك سەرەك وەزیرانی ئەڵمانیای یەکگرتوو هەوڵی داوە ڕۆڵی ئاشتی ببینێت لە ئەوروپا ، ڕێگای نەداوە دەوڵەتە ئەوروپاییەکان لەسەر زەوی وزاری عوسمانی چیتر خوێنی یەکتر بڕێژن. ئەڵمانیای یەکگرتوو ویستوویەتی بارودۆخ ئارام بکاتەوە تاکو پێشکەوتنی ئابووری ڕەخساو بێت وهێزی سەربازی پەرە پێبدات، تاوەکو لە کۆتاییدا خۆیشی لە بواری داگیرکاریدا دوانەکەوێت، ئەوەبوو کۆنگرەی بەرلینی لە ساڵی ١٨٧٨ بە سەرپەرشتی بسمارك بەسترا وخاڵەکانی بڕیارەکانی بە قازانجی ئەوروپا بەگشتی وبەریتانیا بەتایبەتی تەواو بوو، دەوڵەتی عوسمانی لەم کۆنگرەیە دوورخرایەوە، بەڵام تەمەنیشی کەمێك درێژکرایەوە. ڕووسیا نەیتوانی لە بەروبوومی (سان ستیڤانۆ) بخوات پارسەنگی نێودەوڵەتی گۆڕانی بەسەردا هات، ئەوەبوو دەوڵەتی عوسمانی لە ئەڵمانیا نزیك بووەوە، فەرەنسا لە گۆشەگیری ڕزگاریبوو، لەگەڵ بەریتانیا لەیەکتر نزیك بوونەوە وبە هاوبەشی باکوری ئەفریقیا (فەرەنسا جەزائیر وبەریتانیا میسر)یان داگیرکرد. ئەم هاوپەیمانییە نوێیانە بناغەیەك

بوون بۆ هاوپەیمانیەتی یەکەمین جەنگی جیهانی لە ساڵی ١٩١٤دا، کە لە ئەنجامدا دەوڵەتی عوسمانی لە باریەکترازا وهەڵوەشایەوە و (ڕۆژئاوا) بەتایبەتی بەریتانیا وفەرەنسا دەستیان بەسەر (ڕۆژهەلاتی نزیك)دا گرت وبەمجۆرە (مەسەلەی ڕۆژهەلات)یش کۆتایی پێهات.

سەرچاوە وپەراوێزەکان :

لانترنیت، الموسوعة االحرة، المسألة الشرقیة.

کامەران محەمەد حاجی، کوردستان لە بازنەی کێشەی رۆژهەلاتیدا، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٠، ل١٢.

هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٥.

:الانترنیت، الموسوعة االحرة، المسألة الشرقیة.

د. عبدالعزیز سلیمان نوار ود. عبدالمجید نعیمي، التأریخ أوربا المعاصر من الثورة الفرنسیة الی الحرب العالمیة الثانیة، دار النهضة، بیروت، بلا سنة طبع، ص٢٣١.

د. وهیب أبي فاضل، موسوعة عالم التأریخ والحضارة، بەشی چوارەم، چاپی سێیەم، نوبلیس، ٢٠٠٧، ل٧١.

د. عبدالعزیز سلیمان نوار و د. عبدالمجید نعیمي، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٩٣– ٢٩٤.

د. وهیب أبي فاضل، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٣.

د. وهیب أبي فاضل، موسوعة عالم التأریخ و الحضارة، بەشی چوارەم، چاپی سێیەم، ٢٠٠٧، نوبلیس، ل٧١.

(١٠) د. عبدالعزیز سلیمان نوار و عبدالمجید نعیمي، تأریخ أوربا المعاصر من الثورة الفرنسیة الی الحرب العالمیة الثانیة.

(١١)علي حیدر سلیمان، تریخ الحضارة الأوربیة، (دار واسط للدراسات والنشر)، بەغدا، ١٩٩٠، ل٣٠٨.

(١٢) د. عبدالعزیز سلیمان نوار ود. عبدالمجید نعیمي، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩٤.

(١٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣١٥.

(١٤) بروانە: علی حیدر سلیمان، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣١٩.

(١٥) أورخان محمد علي، السلطان عبدالحمید الثاني، حیاته و أحداث عصره، دار الأنبار، الرمادي، ل٣١.

(١٦) بەلکان (Balkans): نیوە دوورگەیەکی گەورەیە. ناوچەیەکی جوگرافیە، باشووری خۆرهەلاتی ئەورووپای گرتۆتەوە. بریتی یە لە چەند ولاتێك، کە: بولگریا، یوگسلافیا، یۆنان، ئەلبانیا، باشووری

خۆرهەڵاتی ڕۆمانیا، بەشی ئەورووپای تورکیا.. ناوچەیەکی شاخاوییە و شاخەکانی بەلکان وئالپی دینریە وڕۆدۆلفی تیا هەڵکەوتووە. ئەم نیوە دوورگەیە کەوتۆتە نێوان دەریای ڕەش لە خۆرهەڵاتەوە، گەرووی بسفۆر و دەردەنیل و دەریای مەڕمەڕە و ئیجە لە باشوورەوە، دەریای ئەیۆنیا وئەدریاتیکی لە خۆرئاواوە، ئەم ناوچەیە هەمیشە مەیدانی جەنگ وکۆچکردن وناکۆکی سەر سنووری نێوان کەمە نەتەوایەتیەکان بووە، بەتایبەتی لە سەدەی ١٩ و ٢٠ دا. چەن جەنگێکی تێدا ڕوویداوە، دوا جەنگیان جەنگ سربیا لەگەڵ هێزەکانی پەیمانی ناتۆ لەسەر هەرێمی کۆسۆڤۆ. ئەم نیوە دوورگە بەلکانە، دەوڵەتە گەورەکان وهاوپەیمانانیش ناکۆکی ململانێیان تووش بووە لە سەری. لە جەنگی جیهانی دووەمدا ئەڵمانیا داگیریکرد. (سەرچاوە: یاسین صابر صالح، ئینسکلۆپیدیای گشتی، دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ٢١٥.

(١٧) د. عبدالعزيز سليمان نورا و د. عبدالمجيد نعيمي، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٩٧.

(١٨) د. وهيب أبي فاضل، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٥.

(١٩) علي حيدر سليمان، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢١.

(٢٠) د. وهيب أبي فاضل، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٥.

(٢١) کامەران محەمەد حاجی، کوردستان لە بازنەی کێشەی ڕۆژهەڵاتیدا ١٨٠٠– ١٩٠٠، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٢٦٧– ٢٦٨.

(٢٢) د. کاوس قەفتان، (بابان، سۆران، بۆتان)، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨٥، ل ٧– ٨.

(٢٣) د. عبدالعزيز سليمان نوار و د. عبدالمجيد نعيمي، هەمان سەرچاوەی پێشوو

(٢٤) علي حيدر سليمان، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٢١.

(٢٥) بڕوانە ئەم سەرچاوانە :

١– علي حيدر سليمان، هەمان سەرچاوە، ل٣٢١.

٢– موسوعة عالم التأريخ والحضارة، ل ١٥٥.

٣– د. عبدالعزيز سليمان نوار و د. عبدالمجيد نعيمي، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠٠– ٣٠١.

ناوی تەواوی: (ئۆتۆڤۆن ئەدوارد لیۆپۆل بسمارك (Bismarck) لە ساڵی ١٨١٥ لە شونهازن لە
ـ یك بووە، گەورە سیاسی وكارسازێكی مەزن ودامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانیایە، خوێندنی
ـ نكۆی لە گۆتنگن وبەرلین خوێندووە، بەشی یاسای تەواوكردووە. لە ١٨٥٩- ١٨٦٠ كرا بە باڵیۆز لە
سان بترسبرگ لە ١٨٦٢ باڵیۆزبووە لە پاریس. لە ١٨٦٢ ولیەمی یەكەم كردی بە ڕاوێژكار (سەرۆك
وەزیران). تەنیا شتێك باوەڕێ پێی هەبوو هێزبوو ئەویش زانی چۆنی بەكاری بهێنێ. لە ١٨٧١ كە
ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانیای یەكگرتوو دامەزرا، بسمارك بە دامەزرێنەری بەهێزی دانراوە. ڕۆڵێكی
دیبلۆماسی كاریگەری لە ئەوروپا بینی، لە سەردەمیدا ئەڵمانیا بەهێز بوو، ئەڵمانیای كرد بە
دەسەڵاتدارترین وڵات لە هەموو ئەوروپا (١٨٧٠- ١٩١٤) سەردەمی بسمارك بە مردنی ولیەمی یەكەم
وهاتنە سەرتەختی ولیەمی دووەم كۆتایی هات ١٨٨٨، لە ١٨٩٠ وازی لە كار هێنا. لە ١٨٩٨ كۆچی
دوایی كرد، سەرچاوە: یاسین صابر صالح، ئینسكلۆپیدیای گشتی، دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم،
سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٢٣١.

(٢٧) د. عبدالعزیز سلیمان نوار و د. عبالمجید نعیمی، هەمان سەرچاوەی پێوو، ل٣٠٢.

(٢٨) كامەران محەمەد حاجی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٧.

سەرچاوەكان :

سەرچاوەكان بە زمانی عەرەبی :

١- ج. جرانت وهارولد تمبرلي، تأريخ أوروبا في القرنين التاسع عشر والعشرين ١٧٨٩- ١٩٥٠، ترجمة بهاء فهمي، مؤسسة سجل العرب، القاهرة، مطابع دار الكتاب العربي بمصر.

٢- أورخان محمد علي، السلطان عبدالحميد الثاني، حياته وأحداث عصره، دار الأنبار، الرمادي.

٣- الانترنت، الموسوعة الحرة، المسألة الشرقية.

٤- د. عبدالعزيز سليمان نوار و د. عبدالمجيد نعيمي، التأريخ المعاصر أوروبا من الثورة الفرنسية اى الحرب العالمية الثانية، دار النهضة العربية، بيروت، لبنان.

٥- علي حيدر سليمان، تأريخ الحضارة الاوروبية الحديثة، دار واسط للدراسات و النشر والتوزيع، بغداد، ١٩٩٠.

٦- د. عبدالعزيز رمضان، تأريخ اوربا والعالم في العصر الحديث، الجزء الثاني، الهيئة المصرية العامة لكتاب.

٧- د. فرغلي علي تسن، تأريخ أوربا الحديث والمعاصر، الطبعة الأولى، دار الوفاء للطباعة والنشر، الاسكندرية، ٢٠٠٢.

٨- د. محمد محمد صالح، تأريخ أوربا الحديث، ١٨٧٠- ١٩١٤، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٦٨.

٩- هـ. أ. ل. فيشر، تأريخ أوربا في العصر الحديث، تعريب أحمد نجيب هاشم و وديع الضبع، دار المعارف بمصر، الطبعة السابعة، ١٩٧٦.

١٠- د. وهيب أبي فاضل، موسوعة عالم التأريخ و الحضارة، الجزء الرابع، العالم من مؤتمر فيينا حتى الحرب العالمية الأولى، طبع ونشر شركة نوبليس- بيروت، (ط/ الثالثة ٢٠٠٧).

سەرچاوەکان بە زمانی کوردی :

١١-د. کوس قەفتان، (بابان، سۆران، بۆتان)، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨٥.

١٢-کامەران محەمەد حاجی، کوردستان لە بازنەی کێشەی ڕۆژهەڵاتیدا، لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییە، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٧.

١٣-مێژووی نوێ بۆ پۆلی پێنجەمی وێژەیی، دانانی لیژنەیەك لە وەزارەت پەروەردە، چاپخانەی یەرموك، بەغدا، ١٩٩٨.

# چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی ئەوروپای سەدەكانی ناوەڕاست

ئامانج نازم بێجان

## بەشی دووەم

تەوەرەی سێهەم :- ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی ئایینی مەسیحی وسەرەتای فراوان بوونی دەسەڵاتی :-

- پوختەیەك دەربارەی ئیمپراتۆری ڕۆمانی لە ڕۆژئاوادا:-

پێش ئەوەی ڕاستەوخۆ بچینە سەر باسكردنی مێژووی ئایینی مەسیحی وبڵاوبوونەوەی بە نێو خەڵك دا وسەرەتای وەرگرتنی دەسەڵاتی وچەند تیشكێك بخەینە سەری واباشە كەمێك لە سەر مێژووی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لە ڕۆژئاوادا بوەستین ، چونكە جگە لەوەی كەوا جێگەی بایەخە لە مێژووی ئەوروپادا ، بەڵكو گرنگتریش لەوە ئەوەیە كەوا ئەگەر بێت و بمانەوێت لە هێڵە گشتیەكانی ئایینی نێوبراودا بگەین ، ئاوا دەبێت ئاوڕێكی زۆر خێرا لەو ماوەیەدا بدرێتەوە كەوا پێش بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی وسەرەتای وەرگرتنی دەسەڵاتی دا كەوتووە ، چونكە پەیوەستن بە یەكترەوەو پەیوەندییەكی توندوتۆڵیشیان بە یەكترەوە هەیە ، وەدەتوانین بڵێین مێژووی سەدەكانی ناوەڕاست لە ئەوروپادا ، دەرهاویشتەو دەرەنجامی مێژووی كۆن و ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی یە ، یاخود بە واتایەكی تر ئەو ماوەیەی كەوا پێش سەردەمی سەدەكانی ناوەڕاست كەوتووە ڕۆڵێكی باشی گێڕاوە بۆ هاتنە كایەی سەدەكانی ناوەڕاست، وەهەروەها تەواو كەری یەكترن بەڵام لە شوێن وكات و كاركردنی جیاوازدا،

چونکە هەروەکو دواتر بۆمان بەدیار دەکەوێت بەلاوازبوون ولە نێوچوونی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەت ، تاکە هێزێك کە چاوی تێبڕیبێت وجێگەی بگرێتەوە کەنیسەی مەسیحی (کاتۆلیك)ە، کە بۆ ماوەی نزیکەی (دە) سەدە بەردەوام دەبێت . هەروەکو باس دەکرێت ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لە سەدەی سێهەمی پێش زایینەوە دامەزراوە ، وەهەتا وەکو سەدەی پێنجەمی زایینی لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا بەردەوام بووە [1] .

بە پێی ئەم مێژووە بێت ئەوا ئیمپراتۆریەتی نێو براو تەمەنی کورت نەبووە ، وەماوەکەشی تاڕادەیەکی باش پێش مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپادا کەوتووە ، وەدیارە وەکو هەر ئیمپراتۆریەتێکی تر خاوەن داب ونەریت و زمان و ڕۆشنبیری ویاسا و ئاین و دەسەڵات ......هتد .تایبەتی خۆی بووە ، چ بۆ خۆی وەچ بۆ کۆمەڵگاکەی ، وەگومانیش لەوەدا نییە کەوا کۆمەڵێك کەسایەتی فەرمانڕەواییان کردووە لەم ماوەیەدا ، وە هەروەك پاشتریش بۆمان ڕوون دەبێتەوە ، ئیمپراتۆر ودەسەڵات وکۆمەڵگاش هەر لە سەرەتاوە هەتاوەکو کۆتایی پێهێنانی دا، لە سەر یەك هێڵ و ئاست نەڕۆیشتووە ، بەڵکو گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە لە هەموو بوارو لایەنەکانی دا.لە مێژووی ئیمپراتۆری ڕۆمانی دا سەردەمێك هەیە بە نێوی سەردەمی (ئاشتی ڕۆمانی) یەوە ،ئیمپراتۆر (أوغسطس أوکتافیوس) کەوا لە ماوەی سالآنی (٢٧)پ.زهەتاوەکو (١٤) ز فەرمانڕەوایی کردووە ، ویستوویەتی سەردەمێکی نوێ لە مێژوودا بکاتەوە ،وەبنەماکانی ئاشتی ڕۆمانی ئاشکرا کرد ،کە دەرفەتی بە هاوڵاتییان داوە کە بەدرێژایی سەدەی یەکەم و دووەم و زایینی دا، ژیانێکی هێمن بژێن و ئاشتی ویەکسانیشی بۆ دابین کردوون ، وەهەر لەو قۆناغەدا ئیمپراتۆریەت گەیشتۆتە ئەوپەڕی فراوانی [2] وە لە کۆتایی سەدەی یەکەم وسەرەتای سەدەی دووەمی زایینی دا ، گەیشتۆتە لووتکەی هێزو فراوان بوونی شتومەکەکانی ، وەهەر لەو سەردەمی

ـکۆمەندییەی دا، " ئەورووپای ڕۆژئاوا ، بەلقان ، ئاسیای بچووك ، وولاتی شام ، میسر ـیبیـ .تونس ، جەزائیر ، مەغریب "ی خستە پالْ خۆی ،وەهەندێ جاریش دەسەلاتی ـیـژ ـدەبوویەوە بۆ "ئێران – هیند – سودان –نەتەوە جەرمانییە ڕۆژهەلاتییە كانی ـیـ–باكووری دانوب"یشی دەگرتەوە(٣)، وەهەر لەو قۆناغەدا ئیمپراتۆریەت یەكێتی ـعیـری وڕۆشنبیری وئابوری و یاسایشی دەستەبەر كردووە (٤)، لەبەر ڕۆشنایی ئەو ـسانەی سەرەوەدا بۆمان بەدیاردەكەوێت كەوا سەدەی یەكەم و دووەمی زایینی بە ـشێوەیەكی گشتی ، سەردەمێكی لە بارو گونجاو بووە چ بۆ دەسەلات وفەرمانڕەوا وە چ ـبۆ كۆمەلگا ، چونكە لەو ماوەیەدا كۆمەلگا بە ئاشتی و هێمنی وخۆشگوزەرانی دەژیا ، وەهەر وەها دەسەلاتی سیاسی ئیمپراتۆریەتیش وێڕای ئەوەی كەوا كۆنترۆلی كاروباری ـزمیاری ناوەخۆیی كردووە ، بەلكو سیاسەتی فراوان خوازیشی هەبووە ، وەدەسەلاتەكەی پەلی هاویشتووە بۆ زۆر شوێن و جێگا ، وەبەمەش دەتوانین بلێین ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەو ماوەیەدا هەروا بە نێو ئیمپراتۆریەت نەبووە، بەلكو بە كردار وئەزموون ئەمەی سەلماندووە، جا بۆیە زێدەڕەوی ناكەین ئەگەر بلێین لە ماوەی نێوبراوودا ئیمپراتۆری ڕۆمانی ئیپراتۆرییەتێكی گەورەی جیهانی بووە، وەلەپاش ئەم ماوەیە شدا ئیمپرتۆریەت پێ دەنێتە سەردەم وقۆناغێكی تری مێژووییەوە، كە جودایە لەو ماوەیەی پێشوو، وە زیاتر سەدەی سێهەمی زایینی دەگرێتەوە، هەروەكو لەسەرچاوەكان دا هاتووە لە سەدەی سێهەمی زایینی دا، ئەم ئیمپراتۆریەتە پێ دەنێتە قۆناغی هەرەس هێنان و هەلوەشاندنەوە(٥)، چونكە لەم سەدەیەدا ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی تووشی قەیران دەبێت، وەلە لایەن مێژوو نووسانەوە بە قەیرانی سەدەی سێهەم ناودەبرا (٦) دیارە ئەمەش هۆكارو ودیاردەو پالنەری تایبەتی خۆی هەیە بۆ ئەوەی ئەم سەردەمە بۆ ئیمپراتۆریەت بخولقێنێت.

بۆ نموونە لە سەردەمی ئیمپراتۆر (کاراکلا) (٢١١-٢١٧ز) دا ، دەستپێشخەری قەیرانی ئابووری دەرکەوت[٧] ، وەشەڕی ناوخۆیی زۆر بوویەوە[٨] ، کەوا ئەمەش زیاتر یەکێتی ئیمپراتۆری لەت لەت کرد ، وەهەر لە سەدەی سێهەمی زایینی دا چەندین ڕاپەڕین لە ویلایە جیاجیاکانی ئیمپراتۆردا بڵاو بوویەوە[٩]، وەهەروەها پشێوی ڕامیاری و سەربازیش لە نێوان ساڵانی (٢٣٥-٢٨٤ز)دا هەبوو ، وەبوونی داڕوخانی ئابوریش بە هەمان شێوە هەبووە ئەمە وێڕای ئەوەی لە هەمان سەدەدا بوو کە مەسیحیەکان لە چوار چێوەیەکی فراوان دا بڵاو بوونەوە لە ویلایەتەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی ، وەلەو لاشەوە مەترسییە دەرەکییەکان لە ئارادا بوو، کەمەترسیترین دوژمنی ئیمپراتۆریەت ،(فارس) و (بەربەرە جەرمانییەکان ) بوون[١٠] ، وە بەلای هەندێك لە نووسەرانەوە ، سەدەی سێهەم بە سنوورێکی جیاکەرەوە دادەنرێت لە مێژووی ئابووری جیهانی کۆندا[١١] ، جگە لەم فاکتەرو دیاردانە ڕەنگە هۆکاری تریش هەبن کەوا پاڵیان بە ئیمپراتۆریەتەوە ناوە هەتاوەکو بگاتە ئەم قۆناغە .

لەمیانەی ئەم باسەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کەوا ئیمپراتۆریەت لەم ماوەیەدا کەوتۆتە بارودۆخێکی زۆر خراپ وئاڵۆزەوە ، چ لە ئاستی ناوخۆو چ لە ئاستی دەرەکی دا، چونکە لە زۆر لایەنەوە درزی تێکەوتبوو ڕەنگە لە ڕاستی دوور نەکەوینەوە ئەگەر لێرەدا سێ خاڵی گرنگ دیاری بکەین بۆ ئەو دۆخەی کە ئیمپراتۆریەتی تێیکەوتبوو ، لەوانەش بڵاوبونەوەی مەسیحیەت کەوا دواتر دەنگۆیەکی زۆری لیکەوتەوە لە نێو کۆمەڵگادا و بووە جێی مەترسیش بۆسەر دەسەڵات ، جا لێرەوە چەوساندنەوەی ئایینی دەستی پێکرد و بە زیانی ئیمپراتۆریەتیش کۆتایی هات ، وەهەروەها خراپی باری ژیان و گوزەرانی خەڵکیش کە گەشەی سەندبوو یاخود دەتوانین بڵێین ئابووری لەو ماوەیەدا لە داڕووخاندا بوو ، بێگومان ئەمەش کاریگەری و ڕەنگدانەوەی خۆی دەبێت لەم

قەیرانەدا ، ئەمە وێڕای مەترسی دەرەکی کەوەکو خاڵێکی زۆر گرنگ ڕۆڵی هەبووە بۆ بڕسی ئەو قەیرانە ، چونکە چاویان بڕیبووە دەسەڵاتە فراوانەکەی ئیمپراتۆریەت بە تایبەتی بەربەرییەکان ، ئەم سێ هۆکارو دیاردەیە ئێمە وای دەبینین کەوا ڕۆڵێکی گرنگیان گێڕاوە لە پەکخستنی ئیمپراتۆریەت بەڵام ئەگەر لە گۆشە نیگایەکی تریش بڕوانینە مەسەلەکە ئەوە زیاتر بۆمان ڕوون و ئاشکرا دەبێت ئەگەر چاوێك بە لاپەڕەکانی مێژوودا بخشێنین دەبینین تەواوی ئیمپراتۆریەتەکان و سەرکردەکان وەهەر شێوەیەکی تری دەسەڵات و فەرمانڕەوایی ، بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیوون ، دەشێ لە سەرەتادا دەسەڵات لە هەوڵ و تەقەلای ئەوەدا بێت کەوا چۆن کۆمەڵگە بەلای خۆیدا ڕابکێشێت و پشتگیری لێ بکەن ،وەبۆ خۆیشی سەرقاڵی ئەوە بێت ئاخۆ چۆن ڕەزامەندی کۆمەڵگاکەی بە دەست بهێنێت وچۆن دەسەڵاتی جێگر بکات ؟وەلەپاش ئەمەش دا ئەگەر سەکەوت دەگاتە قۆناغی گەشەکردن و فراوان خوازی ، هەروەکو چۆن بینیمان کەوا ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی ماوەیەك لە تەمەنی دا بە فراوان خوازی وشکۆمەندی بردە سەر، جا ئەمەشیان بە پێی ئەو هێزو توانایە دەبێت کە تێیدا بە دیدەکرێت ، وەدواقۆناغ و سەردەمیش کە مەرجە یاخود دەتوانین بڵێین خۆ دەربازکردن تیایدا زۆر دەگمەنە ئەگەر مەحاڵ نەبێت لەوانەیە لە هەندێك شوێن و کاتی جیاوازدا ئەم قۆناغە یان قۆناغەکانی تر بگۆڕدرێت ، یاخود تێڕوانینی دەسەڵاتەکان جیاواز بێت دەربارەی ، بەڵام دەبێت لە یادمان نەچێت هەموو دەسەڵاتێك دەبێت قۆناغی هەرەس هێنان ببینێ ، هەروەکو چۆن ئێستا ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لە سەدەی سێهەمدا لەم قۆناغەدا دەژێت ، ئاوەها دەبێت هەموو فەرمان ڕەواکان بەم قۆناغەدا تێپەڕن ، ڕەنگە لەم ماوەیەدا هەندێك کەس بیر لە دەرباز بوون بکەنەوە بۆ پاراستنی ماوەی درێژی دەسەڵاتیان !.

ئەوەتا هەندێك لە ئەباتیرەكان هەوڵی ئەوەیان داوە كەوا ئیمپراتۆریەت لەم قەیرانەدا ڕزگار بكەن ، وەبەتایبەتی (دقلدیانوس) (٢٨٤-٣٠٥)ز ، وئیمپراتۆر (قوستەنتینی گەورە) (٣٠٥-٣٣٧ز) ، كە هەستاوون بە چەند چاكسازییەك وەئامانج تێیدا ئەوە بووە ، ئیمپراتۆریەت لە ڕووی ئابووری و ئیداری و سەربازییەوە بە هێز بكات [١٢] ، ئەوەی یەكەمیان گرنگی خۆی ڕووبەڕووی بە هێز كردنی دەسەڵاتی ناوەندی دەكردەوە ، لە میانەی بە هێز كردنی هێزی ئیمپراتۆرو دیاری كردنی سیستەمی سوپا و ڕێكخستنی دەزگای حوكومی، ئەمەش بە هاوكاری وەزیرەكەی خۆی بووە بە نێوی (أرسطو بولوس) ،وەهەروەها دقلدیانوس ودارودەستەكەی ڕووبەڕووی كێشە ئابوورییەكان بوونەوە ، وەلە جێگەی یاسای خستنە ڕوو داواكردن ، سیستەمی ئابوری دانا كە دەوڵەت زاڵ دەبێت بە سەریدا ، وەبۆ ئەوەی لە بێ بازاڕیش بباتەوە ، وەهەروەها هەڵگیرسانی ڕاپەڕینەكانیشی قەدەغە كرد ، وەهەر لەم سۆنگەیەوە نابێت نێوی ئیمپراتۆر ( أولیان)یشمان لە یاد بچێت ، چونكە بەڵگەنامە هاوچەرخەكان نازناوی (( تازە گەری ئیمپراتۆریەت)) یان لێ ناوە [١٣] ، وەلەو لاشەوە قوستەنتین بە كردار بنەمای حوكمی بۆماوەیی داخل كرد ئەمەش جیاوازییەكی نێوەڕۆكی یە لەگەڵ نەریت و باوەكانی ڕۆمانی دا وە بەپێی مەرسوومی میلانۆی بە ناوبانگساڵی (٣١٣) ز دوای ئەوەی بە فەرمی دانی بە ئایینی مەسیحی ناوە پشتگیریشی لێیان كرد [١٤] وەپایتەختی گواستەوە بۆ قوستەنتینیە وە بە نێوی (ڕۆمای نوێ) ناو دەبرا [١٥] ، ئەم چاكسازییانە وای نەكرد كە ئیمپراتۆریەت لەم قەیرانە ڕزگار بكات ، بەڵكو لە كۆتایی سەدەی چوارەمدا زیاتر لە جاران قوڵبوویەوە، چونكە لە كۆتایی سەدەی نێوبراودا بە تایبەتی سەدەی پێنجەمدا بەربەرییەكان لە ئیمپراتۆریەتدا پەرت وبڵاوبوونەوەو وە زاڵ بوون بە سەر زەویەكانیدا و تێیدا جێگر بوون وەئەم كارەش نزیكەی یەك سەدەی بە تەواوەتی

خایاند، وەئەم سەردەمە بە سەردەمی کۆچی گەورەی نەتەوەکان ناو دەبرێت، جێی ئاماژەیە کە هاتنی (غوتەکان) سەرەتای ئەم کۆچانە بوو [16]، کەواتە ئیمپراتۆریەت لە سەدەی چوارەمدا پێی نایە قۆناغێکی رونی تەفروتونا بوونەوە [17]، وەلە سەدەی پێنجەمدا رۆما رووخا ، وەئیمپراتۆریەتی رۆمانیش لە گەڵیدا بەدەستی بەربەرییە جەرمانییەکان دەروخێت ، وە لەزەوییەکانی ئیمپراتۆریەتدا مەمالیکە بەربەرییە نوێیەکان پێك دەهاتن، وەکو مەملەکەی (فرنجە) لە فەرەنسا و(قوتە رۆژئاواییەکان ) لە ئیسپانیاو (قوتە رۆژهەڵاتیەکان ) لە ئیتالیا و (وەندال) لە باکوری ئەفریقیادا [18]، وە بەرجەندییەکان لە بەرزاییەکانی دۆڵی رووباری (الرون ) [19]، ومەملەکەی (السیوفی ) لە پورتوگال وباکووری ئیسپانیادا ، ئەمە وێرای چەند مەمالیکێکی تر کەوا گرنگی کەمترە [20]، ئەوەی تێبینی دەکرێت لێرەدا ئەم هەرەس هێنانەبە ماوەیەکی کورت نەبووە ، یاخود راستەوخۆ تەواوی مێژووی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی لە رۆژئاوادا بە یەکجار گۆرابێ، بەڵکو هۆکارو دیاردەو کارەسات و قەیران و گۆرانکارییەکانی ئیمپراتۆریەت ماوەیەکی زۆری خایاندووە ، وەهەموو لایەن و بوارەکانی پێکەوە رۆڵیان هەبووە بۆ نەمان و لە نێو چوونی ئیمپراتۆریەت، وەدەبێت بزانین بەر پرسیارێتی ئەم رووداوە ، دەکەوێتە ئەستۆی کۆمەڵگاو دەسەڵاتی ئیمپراتۆر ، وە ریشەکەشی دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی پێش داروخان ، ئەمە وێرای ئەوەی کەوا هەرەسهێنان لە تەواوی شوێن و کاتەکاندا هەبووە و بابەتێکی حەتمی بووە ، ئەگەر لێرەدا ووتەیەکی (شپنگلەر ) فەیلەسووفی ئەڵمانی بە نموونە بهێنینەوە وەزیاتر مەبەستەکەمان بۆ روون و ئاشکرا دەبێت . شپنگلەر لای وایە (( هەموو شارستانیەتێك تواناکانی نوێیە لە گوزارشت کردنیدا بۆ خوود، ئەو توانایانەش کە دەست پێدەکات و پێدەگات و پاشان هەڵدەوەشێتەوە ، پاش ئەمە هەرگیز ناگەرێتەوە )) [21]، لەمەوە دەگەینە ئەو راستییەی کەوا کاتێك

شارستانیەت یاخود دەتوانین بڵێین دەسەڵات ، بگاتە قۆناغی هەرەس و داڕوخانی ناکرێت و ناشگەڕێتەوە بۆ دۆخی جارانی کە بریتیە لە دروست بوون و پێگەیشتن و فراوان بوون .

شایەنی باسە چەندین بیروبۆچوونی جیاواز هەیە لە مەڕ هۆکارو ماوەی داڕوخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لە ڕۆژئاوادا لێرەدا تەنها نێوی چەند فەیلەسوف و بیرمەندو نووسەرێك دەهێنین لە گەڵ ئەو پەرتووکەی کەوا ڕاوبۆچوونی خۆی تێیدا خستۆتە ڕوو دەربارەی هۆکارەکانی ڕووخانی ئیمپراتۆریەت بو نمونە بیردۆزەکەی (القدیس أوغسطین) (٣٥٤-٤٣٠ز) پەرتوکەکەی بە نێوی (شاری خودا) وەیە ، وەمێژوو نووسی ئینگلیزی (ادوار جیبون ) (١٧٣٧-١٧٩٢ز) کە کتێبەکەی ناوی (اضمحلال الإمبراطوریة الرومانیة وسقوطها) ، وەهەروەها بیردۆزەی مێژوو نووسی بە ڕەچەڵەك ڕووسی ((ڕستوفیتزف)) (١٨٧٠-١٩٥٢ز) لە پەرتووکەکەیدا بە نێوی ( التاریخ الاقتصادي والاجتماعي للأمبراطوریة الرومانیة)[٢٢]، ڕاو بۆچونی خۆی خستۆتە ڕوو، وە هەروەها مێژوو نووس (زوزیموس)ی بتپەرستیش، ڕاوبۆچونی خۆی دەربارەی ئیمپراتۆری ڕۆمانی و ڕووخانی لە کتێبی (مێژووی نوێ )دا خستۆتە ڕوو[٢٣] ئەمە جیا لەوەی کەوا هەندێکی تر لە گەڵ بیردۆزی بایۆلۆژیدان ، وەهەندێکی تریش لە لێکۆڵەرەوان هەوڵیان داوە ڕاڤەی ئابووری بدۆزنەوە بۆ مەسەلەی ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی[٢٤].

هەروەها ڕاوبۆچوونی دیکەش هەیە کە دنیەوین، لەوانەش ( أمیانوس مارسیلینوس) کەوا لە ساڵی(٣٣٠ز) لە (أنطاکیا) لە دایك بووە[٢٥]، ئەمانەو چەندین هۆکاری تر هەبووە، بۆ نمونە هەروەکو باس دەکرێت لاوازی دەسەڵاتی ناوەندیش ڕۆڵی هەبووە لەم بارەوە[٢٦]، ئەمە جگە لەوەی کەوا کەسایەتی تریش هەن کە قسەو باسیان لەمەڕ ئەم پرسە کردووە وەبە درێژی لەسەری دواوون[٢٧]، وەدتوانین بڵێین هەر

هەموویان جێگەی بایەخ و گرنگی پێدانن ، هەرچەندە هەریەکێکیان لە گۆشەیگایەکەوە تەماشای بابەتەکە دەکات، هەندێکیشیان لە یەکترەوە نزیکن، لەمەشەوە ئەوەمان بۆ ساخ دەبێتەوە کەوا ڕووخانی ئیمپراتۆریەت لە ڕۆژئاوادا ، هۆکارێکی زۆری لە پشتەوە بووە وەهەر هەمووشیان ڕۆڵیان گێڕاوە تیایدا وەهەرگیز ناکرێت تاکە هۆکارێك بکەین بە پێوەر بۆ ئەو مەبەستە ، یاخود بیردۆزە و ڕاوبۆچوونی فەیلەسوفێك یاخود بیرمەندێك بە هەند وەربگیرێت ، ئەمە لە کاتێکدا کەوا ناشتوانرێت بۆدەستنیشان کردنی ماوەی ڕووخانی ئیمپراتۆریەت ساڵێك یاخود ماوەیەکی کورت دەستنیشان بکرێت بەڵکو دەبێت لە گەڵ ئەوەدا هاوڕا بین کەوا ماوەیەکی دورو درێژ دەستنیشان دەکات لەمبارەیەوە، چونکە دەمێکە ئیمپراتۆریەت بەرەو پیر بوون و نەخۆشی بوون و خۆرئاوابوون دەچێت ، تا دواجار لە کۆتایی سەدەی پێنجەمدا کۆتایی پێهات ،وەلە پاش ساڵی ٤٧٦ز ڕۆژئاوا بەبێ ئیمپراتۆریەت مایەوە هەتاوەکو ساڵی ٨٠٠ز ، ئەوەبوو لەم ساڵەدا (توج شارلمان ) بووبە ئیمپراتۆر لەسەر ڕۆژئاوادا ، وەهەروەها ئیمپراتۆریەیشی زیندووکردەوە لە ژێر ناوی ((ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز)) [٢٨].

هەندێك لە مێژوو نووسان لەگەڵ ئەو بۆچوونەدان کەدەڵێت ئەم ئیمپراتۆرە لە ساڵی( ٩٦٢ ز ) دا دروست بووە بەڵام مێژوو نووس( bryce) وای دەبینێت ئەم ئیمپراتۆریەتە تەنها درێژکەرەوەی (ئیمپراتۆریەتی کارولینجیی) یە کەمەبەست تێیدا زیندوکردنەوەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی یە لە ڕۆژئاوادا بۆ ڕەچاو کردنی ئاینی و سیاسی بووە وەمێژووی(٩٦٢) ز جگە لە ئاماژە کردن بێت بۆ گواستنەوەی تاجی ئیمپراتۆریەت بە شێوەیەکی کۆتایی لەبەشی ڕۆژئاوا بۆ بەشی ڕۆژهەڵات لە ئیمپراتۆریەتی کارولینجیی دا هیچی تر نییە[٢٩]، شایەنی باسە لە سەدەی حەوت و هەشتی زایینی دا ، موسڵمانەکان هەستان بە فەتح کردنی زەویەکانی ڕۆمانی ، وەلە سەدەی نۆو دەشدا ،

کشانەوەی چەند نەتەوەیەك بوو لە باکوریەکان ، لە ( سوید –نەرویج –دانیمارك) وچەند نەتەوەیەکی ترلە مەجەڕدا لەوماوەیەدا هێمنییەکی درێژخایەن نەبووە ، وەلە دیاردەکانی دا دوو دڵی وشپرزەیی بووە ، ئەمە وێڕای نەبوونی یاخود دەستکورتی بۆ حوکمەتێکی باش بە شێوەیەکی گشتی [٣٠]، بەڵام لە سەرەتای سەدەی یازدەدا ، کۆمەڵگا لە ڕۆژئاوای ئەوروپادا جێگیربوونێکی ڕێژەیی ڕایدەبوارد ، وەژیانیش زیاتر ئاسایش و ئاشتی هەبووە ، وەناڵێین ئاسایش بوونێکی ڕەها ، بەڵکو زیاتر بووە لەو ماوەیەی پاش سەدەی دوەمی زاینیدا ، وەلە ئەنجامی ئەم ئاسایشە ڕێژەییەدا ، ڕاپەڕینێ دەرکەوت لە ئەوروپادا ، کەبە ڕاپەڕینی سەدەی دوازدەی زایینی دەناسرێ ، بەڵام سەرەتای سەدەی چواردە قۆناغی تەفروتونابوونی شارستانییەتی ئەوروپای ناوەڕاستە ، وەبە تێپەڕبوونی سەدەی چواردەو پازدەی زایینی هزرەکانی ناوەڕاست لە دەوڵەتانی ئەوروپادا نەدەمان ، وەئەزموونە نوێیەکان جێگەیان دەگرتەوە ، وەلە تایبەتمەندییەکانی ئەم ماوەیەش ئەوە بوو تێڕوانین گۆڕا بۆ سیستەمی پاشایەتی [٣١]، وەهەروەها زمانی لاتینی لە سەدەکانی ناوەڕاست دا کە زمانی زانست و نووسین بووە ، بەڵام دوای ئەمە بە کارهێنانی ئەم زمانە هێدی هێدی لاواز بوویەوە [٣٢]، ئەوەتا (دانتی) بە ئیتاڵی دەنووسیێ و شاعیری فەڕەنسی گەورە ( فرسنوأفییون) (١٤٣١–١٤٦٣)ز شیعرەکانی بە زمانی فەڕەنسی دەنووسی وەهەروەها(تشوسر) (١٣٤٠–١٤١٣)زبە ئینگلیزی دەنووسێت ،وەهەروەها هێرشی خاچ هەڵگرەکانیش مۆرکێکی نوێی وەرگرت ، لە دیاردەکانی گۆڕانی سەرەکی ،ئەوەبوو کەوا کەنیسە تووشی دابەش کردن بوو[٣٣] .

ب/ دەرکەوتنی ئاینی مەسیحی و بڵاوبوونەوەی بە نێو کۆمەڵگادا :–

بۆ تیشك خستنە سەر مێژووی ئەوروپای لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ، زۆر گرنگە چاوێك بە ژیانی( مەسیح د.خ) وەخودی ئایینەکەو بڵاوبوونەوەیدا بخشێنین ، چونکی

ـیی مەسیحی گەورەترین و بەرچاوترین ڕۆڵـی هـەبووە لـەو ماوەیـەدا ، و زیادەڕەوی ـیە ئەگەر بڵێین مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئـەورووپادا ، بـریتی بـووە لـە مامەڵـە کردنی مرۆڤ لە گەڵ ئایینی نێـو براواد وەبـە تایبـەتی پیـاوان و هـەڵگرانی پـەیامی ئـەم ـیینـە ، جـا لێـرەدا جێـی خۆیـەتی کـەوا کـەمێك لـە سـەر ژیـان و ئـایینی مەسـیحی و ـاوبوونەوەی بووەستین ، چـونکە وەکـو کۆڵەکـە و سەرچـاوە و کەرەستـەیەکی خـاو بووە بۆ ئەم مێژووەی کەوا نزیکە ی هەزار ساڵی خایاندووە .

١-کورتاەیەك لە ژیانی یەسووع :-

(ئەو کات لە بیت لحم) ی جولەکەدا منداڵێك لە دایك دەبێت بە نێـوی عیـسا یـاخود مەسیح) ، وە(متی لوقا)ش هەر ناوی ئەو شوێنە دەهێنن بەڵام (مرقس) باسی بیت لحم ناکات[٣٥] ، وەسەبارەت بە ماوەو کاتی لە دایك بوون و ژیانی و نەمانی لە دونیادا گەلێك ڕاوبۆچوونی جیاجیا هەیە بۆ نموونە هەندێك لایان وایە کەوا مەسیح لە ساڵی (٦) یـاخود (٥) پ .ز لە (بیت لحم) لە داپك بووە[٣٦] ، وەلە هەندێك شوێنیشدا (١/١/١...) ز کـراوە بە ڕۆژی لە دایك بوونی [٣٧]، وەمتی و لوقاش لایان وایـە کـەوا مەسـیح لـەو ڕۆژانـەدا لـە دایـك بـووە کـەوا هێـرۆدس پادشـا بـووە بـە سـەر وڵـاتی یـەهودا[٣٨] ، وەلـە هەنـدێ سەرچاوەی تریش دا واباس کراوە کەوا لە سەردەمی ئیمپراتۆر (أغسطس) لە (٢٧) پ.ز بۆ (١٤)ز لە دایك بووە[٣٩]، بەڵام سەرچاوە مەسیحیەکان ئاماژەیان بـەوە کـردووە کـەوا پێغەمبـەری ئـایینی مەسـیحی لـە سـەرەتای سـاڵی(١) ڕۆژمێـری زایـینی دا لـە دایـك بـووە[٤٠]،وەتێبـینی دەکـەین کـەوا لـە پەرتووکـە مێژووییەکـەی (وول دیورانـت) دا ، بـۆ دەست نیشان کردنی ماوەی ژیانی مەسیح لەم دونیایـەدا ، سـاڵانی (٤) پ.ز بـۆ (٣٠) ز دیاری کراوە[٤١]، بەهەر حاڵ ئەم کەسایەتییە بەسادەیی لە خێزانێکی ئەوپەڕی هەژار لە دایك بووە[٤٢]، وەهەر وەکو دەیگێڕنەوە لە منداڵیەوە پەیڕەوی جولەکەیەتی وەك هەموو

جولەیەك پێی ڕاگەیاندراوە ، وەباوەڕیشی بەوە هەبوەوە کە دەڵێن (خودایەکی تاك و تەنیاو نەبینراو هەیە ) ، بەڵام یەسووع ئەوەی نەسەلماند کە ئەم خودایە هەر خودای جولەکە بێت ، گوایە وەك خۆیان دەڵێن ئەم کارەی بووە بناغەی شۆڕشی مەسیحێتی، وەئەمە یەکەم هۆ بوو کە جولەکەکان ڕقی لێ هەڵبگرن [٤٣]، سەبارەت بە لە دایك بوونی عیسا دیارو ئاشکرایە کەوا ڕاوبۆچوونێکی زۆر لە ئارادایە ئەگەر سەرنج بدەین هۆکارەکەی زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەوا هەر لەو کاتەی لە دایك بووە بە شێوەیەکی سەر سوڕهێنەر هاتە دونیاوە ، وەژیان و هەڵسوکەوتیشی لە نێو کۆمەڵگاکەیدا ڕەنگدانەوەی زۆری هەبووە ، وەدەربارەی کۆتایی ژیانیشی دیسان ڕاوبۆچوونێکی زۆر و جودا جودا هەیە ، کەوا بە چ شێوەیەك وەچۆن چۆنی کۆتایی بە ژیانی ئەم دونیایەی هات ؟! دەتوانین بلێین هەر بەسەر سامیشەوە ئەم کەسایەتییە دونیای بە جێ هێشت ، وێڕای هەموو ئەمانەش وای دەبینین کەوا یەسوع لە ساڵێکدا لە دایك بووە کەوا پێش زاین بووە ، چونکە لە گەڵ هاتن و دەرکەوتنی لە ژیاندا ، ئیدی مێژووی زایینی هاتە کایەوە ، دەبێ ئەوەش بزانین خۆ ئەم کردارە هەروا بە ساناییی نەکراوە و لە گەڵ ئەمەش دەکرێ بلێین هۆیەکی تریش هەبووە بوچ نەزانینی ڕاست و دروستی ماوەی لە دایك بوونی نێو براودا ، ئەویش ئەوەیە ڕەنگ بێ لەو سەردەم و قۆناغە مێژوویەدا کۆمەڵگا بە گشتی هێندە هۆشیاری و ڕۆشنبیریان بەرزنەبووبێت بۆ ئەم جۆرە بابەتانە ، وەبەهایەکی ئەوتۆی نەبووە لەلایان دا ، وەلەوانەشە هەتاوەکو بە تەواوی دەرنەکەوت و ئاماژەکانی پێغەمبەرایەتی تێدا بە دیار نەکەوت نەبووە تە جێی بایەخ و گرنگی پێدان هەر لەبەر ئەمەشە کەوا ئەو مشت و مڕەی لەسەرە ، لای هەمووان ئاشکرایە کەوا مەسیح پەیامبەرێك بووەوەهەڵگری یەکێك لەو سێ ئایینە گەورەیەی جیهانە ، وەپەرتووکەکەشی بە ( الإنجیل ) واتە مزگێنی ناسراو ، لە چوار

ـەش پێك دێت(مەتی —مەرقۆس— لۆقا —یۆحەننا) ، وەلەماوەی تەمـەنی کـورتی دا کـە
ـزیکەی (٣٣) ساڵ دەبـوو ، تـوانی ڕۆڵێکـی بـاش بگێڕێـت لـە گـۆڕانی کۆمەڵگاکـەی بـە
ئاراستەیەکی باشتردا ، وەئەوەی زیاتر مێژووی بە ئاقارێکی تـردا بـرد ، لـە ڕاسـتیدا لـە
پاش مردنی دابوو .

٢- بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحیەت :-

سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کەوا مەسیح لـە تەمـەنی (٣٠) یـان (٣٣) سـاڵیدا دەستی کـردووە بـە بڵاوکردنـەوەی پـەیڕەوەکانی دا [٤٤] وەلـەنیوەی یەکـەمی سـەدەی یەکەمی زایینیدا لە ویلایەتە ڕۆژهەڵاتیەکان ی ئیمپراتۆری ڕۆمانی دا ئایینی مەسیحی لـە سەر دەستی مەسیحدا دەرکەوت وپاشان لەسەر دەستی ( سانت — پۆل ) دا ئەم ئایینـە لە قاڵبی ئایینی یە هوودی چووە دەرو بوو بو ئـایینێکی جیهـانی و گشتگیر ، وەبـەرەو ناوچـە ڕۆژئاوایەکانیـشدا تەشـەنەی کـرد[٤٥]، ئەمـە وێـڕای ئـەوەی کـەوا (پـۆڵس) و (پەترووس) یش وەکودوو قوتابی دیارو بەتوانا ڕۆڵی گرنگیان گێـڕاوە لـە بڵاوکردنـەوەی ئەو ئایینەدا ، وەناویشیان کەوتۆتە نێو لاپەڕەکانی مێژووی ئایینی مەسیحیەوە ئـەوەی یەکەمیان هەروەکو باس دەکرێت ، کەوا لە هەموو قوتابیەکانی تری مەسیح تێگەیـشتوو تر بووە لە کاروباری لاهوتی دا ، وەدواتـر بـووە بـە فەیلەسـووفی مەسـیحی ، وەئـەوەی دووەمیشیان لە قوتابیەکانی تر زیاتر بە پەرۆش وهەڵپە بووە ، وەکـو مێـژووی کەنیـسە دەڵێت (( کلیلی بەهەشت و ئاسمان) یشی وەرگرتووە [٤٦] بێگومان ئەم جـۆرە کردارانـە وەدەرکەوتنی ئایدیاو ئایینێکی وەهـا ، دەبێتـە جێگـەی گومـان و پرسـیارو مەترسـی و باس و خواس لە لای دەسەڵات ، وەفەرمان ڕەواکـانیش ترسـیان لێدەنیـشێت وزۆر جـار پەنا دەبەنە بەر بەکارهێنانی هێزو دژایەتی کردن ولە نێو بردن ، چونکە هاتنی ئایینێکی وەها کەوا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بانگەشە کەرانی زۆرتر دەبێت و خەڵکانێکی یـەکجار زۆر بـۆ

باوەشی خۆی ببات ، بێگومان لێرەوە دەسەڵات پەسەندی ناکات و بەکارێکی زۆر ئاڵۆز دێتە پێش چاوی ،بە تایبەتی لە سەرەتا . ئەوەتا لە ساڵی (٦٨)ز لە دوای گەڕان بە بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحی و بەربەرەکانی کردنیان لە لایەن ئایینی جولەکەدا، ئیمپراتۆر(هیرۆن) هەریەك لە (پەتروس) و(پۆلس) ی دەستگیرکرد و هەردووکیان ی سەربڕی [٤٧] ، ئەوەی تێبینی دەکرێت نەك هەر ئایینی مەسیحی ،بەڵکو تەواوی ئایین و ئایدیاکان لە سەرەتاوە کە دەردەکەوێت جگە لەوەی دەبێتە جێی پرسیارو ترس و سەر سوڕمان چ لە لای کۆمەڵگا وە چ لە لایەن دەسەڵات ، بەڵکو لە گەڵ ئەمەشدا تووشی ئەشکەنجەو ئازارو مردنیش دەبێتەوە، بۆ نموونە لە سەردەمی ئیمپراتۆر (دوکلیاس ) (٣٠٥-٣٨٤) ز دا توندوتیژی گەیشتۆتە لوتکە بۆیە بەلای مەسیحیەکانەوە سەردەمی ئەم ئیمپراتۆرە بە سەردەمی شەهیدان ناسراوە [٤٨]، وەلە سەردەمی ئەم ئەباتیرانەشدا بە هەمان شێوە مەسیحیەکان تووشی چەوساندنەوە بوونە ، لەوانە (سبتیمیوس) ، (سیفیروس) (١٩٣-٢١١)ز (دیکیوس)(٢٤٩-٢٥١) ز، (دقلدیانوس) (٢٨٤-٣٠٥) ز[٤٩] ، وەدەبێت لە یادشمان نەچێت مرۆڤ بەدرێژایی مێژوو ئایینی لازۆر پیرۆز و خۆشەویست بووە ڕاستە لە زۆر کات و شوێندا تووشی بەربەرێکانێ هاتووە لە گەڵ دەسەڵات یاخود کۆمەڵگا ، بەڵام دواجار بە شێوەیەك لە شێوەکان نەك هەر گەر م وگوڕی کەم نەکردۆتەوە ، بەڵکو زۆر جار ئەو دژایەتی کردنە بۆتە مایەی خوێنگەرمی زیاتر وەمێژووی ئایینی مەسیحی و ئایینی ئیسلامیش وەکو دوو نموونەی زەق گەواهی ئەم ڕاستیەمان بۆ بە دیار دەخات .

٣- هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی :-

لە ڕاستییدا بڵاوبوونەوەی ئەم ئایینە فاکتەری زۆری لە پشتەوە بووە ، وەدەبێت بزانین ئایینی مەسیحی هەر لە نێو ئیمپراتۆری ڕۆمانی وئایینی جولەکەدا دەرکەوت .چونکە

-ەرکەوتنی ئایینی ناوبراو لە گرنگترین پێشکەوتنەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بوو، کەبەخۆیەوە دیبووی ، وەئەم ئایینە لە (زەوی پیرۆز) دەرکەوت کە بەشێك بووە لە -یمپراتۆریەت [٥٠] کەواتا ڕیشەی دەرکەوتن و دواتر بڵاوبوونەوەی بە نێو گۆمەڵگادا ، لە -ێو ئیمپراتۆر ی ڕۆمانی و ئایینی جولەکە زیاتر بە دیار کەوتووە ، وەئەو ڕاوبۆچوونەش کە دەیان خەینە ڕوو ، هەندێکیان لە چوار چێوەی ئایینین و وەهەندێکی تریشیان -یوین ،بۆنموونە بە لای هەندێ کەسەوە کەوا بڵاوبوونەوەی ئەم ئایینە ئەوەیە کەوا ویستی خوداوەندی لە سەر بوو [٥١]، وەهەروەها فراوان بوونی ئیمپراتۆریەت و پەیوەندی کردنی بە بەشە جیاجیاکانیدا ، بە هاتووچۆی نوێ و بازرگانی چالاك [٥٢]، هۆکارێکی تر بوو ، وەهەروەها بە کار هێنانی زمانی لاتینی [٥٣] ،ویۆنانی کە سەروەر بوونە لە هەردوو بەشەکەیدا ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا [٥٤] ، وەزمانی یۆنانی زمانی تێگەیشتنی بازرگانی بووە ـە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا[٥٥]، وەهەروەها بڵاوبوونەوەی ئاوارە یەهودیەکان، وەچەوساندنەوەکانیش [٥٦]، هۆکارێکی تر بوونە بۆ بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی ، وەهەر لەمبارەیەوە نابێت مێژوو نووس (کیون ) مان لە یاد بچێت ، کە بۆ ئەم مەبەستە چەند خالێکی دەستنیشان کردووە ، لەوانەش باسی ئەوەی کردووە کەوا مەسیحیەکان خاوەنی غیرەت ودەمارگیری بوونە بۆ ئایینەکەیان وەدەستیان پێوە گرتووە ، وەبەڵێنی ژیانی نموونەیی لە دوا ڕۆژدا هەبووە ، وەهەروەها ڕۆڵی ئەو موعجیزانەی کەوا کەنیسە بە دەستی دەهێنا، وەهەروەها ژیانی زوهدی مەسیحیە پێشینەکان کە زیندوویان کردەوە ، ئەمە وێرای ئەو ڕێکخستنەی کەوا لە بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی ڕێبازی (کەهەنووتی) دا دەکرا [٥٧] ، وەدەبێت باس لە ئیمپراتۆر قوستنتینی گەورەش بکرێت لە مبارەیەوە . کەوا لە ماوەی ساڵانی (٣٠٦-٣٣٧) ز دا فەرمانڕەوایی کردووە ، وەدانی بە ئایینی مەسیحی دا ناوە [٥٨]، وەهەر خۆی بە تەنها نەبووە بەڵکو لە گەڵ

(لیسینوس )دا لە میلان لە سەرەتای (٣١٣) ز دا چاویان بە یەك كەوتووە وەمەرسوومی میلانیـان دەركـردووە [٥٩]، وەئـەو نووسـراوەش بـە شـێوەیەكی وەهـا پێشوازی لێكـراو هەروەكو یاسایەكی بنەڕەتی بێت لە یاساكانی جیهانی ڕۆمانی دا چـونكە هـەروەك بـاس دەكرێت مەسـیحیەت هـەر لـە سـەرەتاوە بـە بزوتنەوەیـەكی نهێنی مایـەوە هـەتاوەك و ئاشكرا كردنی نووسراوی نێو براودا [٦٠]، لە میانەی ئەو باسەوە بۆمان بە دیار دەكەوێت كەوا بە شێوەیەكی گشتی سەردەمی ئیمپراتـۆر قوستـەنتینی گـەورە تاڕادەیـەكی بـاش ماوەیـــەكی گونجـــاو لـــە بـــار بـــووە بۆبڵاوبوونـــەوەی ئاینەكـــە بـــە نێـــو خەڵكـــدا ، وەبەشـێوەیەكی فـەرمی وئـازاد و سـەربەخۆ بـێ تـرس و بـیم ممارەسـەی ڕێـوڕەسمی خۆیان بكەن وەبەڵگەشمان لە سەر ئەمە ئەوەیە هەروەكو بـاس دەكرێـت لـە سـەرەتای سەدەی چوارەمدا لایەنگیری ئایینی مەسیحی لە لایەنگیرانی سـەرجەم ئایینـەكانی تـری ئیمپراتۆری ڕۆمانی زۆرتر بووە [٦١]، وەهەروەها سەرچاوەكان ئاماژە بـەوە دەكـەن كـەوا تەنانەت مێژووی دەركەوتنی كەنیسەش دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (٣١٣)ز ، واتە سـەردەمی قوستەنتینی گەورە ،وەبەدرێژایی سەدەكانی ناوەڕاستدا دوو كەنیسە هەبووە ، یەكەمیان كەنیسەی ڕۆژئاوا لە لایەن پاپاوە سەرپەرشتی دەكرا ، وەمێژووەكـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ سەرەتای سەدەی دووەمی زایـینی وەبەكەنیـسەی كاتۆلیـك ناسـراوە ، وەدووەمیـشیان (كەنیسەی ڕۆژهەڵات) كە لـە لایـەن بـەتریاریكی قوستەنتینیەوە سەرپەرشـتی دەكـرا ، وەبۆ سەدەی چـوارەمی زایـینی دەگەڕێتـەوە وەبـە كەنیـسەی أرثـوذكس ناسـراوە [٦٢] ، وەهەر لە كۆتـای سـەدەی چـوارەمدا لـە سـەردەمی ئیمپراتـۆر (فیودۆسـیوس) (٣٧٨-٣٩٥) ز دا بوو بە ئایینێكی فـەرمی ئیمپراتۆریـەتی ڕۆمـانی [٦٣]، لـە بـەر ڕۆشـنایی ئـەم باسەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە كەوا بڵاوبوونەوەی ئایینەكـە بـە شـێوەیەكی بەرچـاو لـە سەردەمی ئیمپراتـۆر قوستـەنتینی گـەورە بـووە ، یـاخود دەتـوانین ڕیشەو ڕەچـەڵەكی

ـــ‌ـنینــەوە بـۆ ئــەم ســەردەمە چـونكە مەسـیحیەكان هــەتاوەكو پــێش ئــەم ماوەیــە
.ـەچەوسێنرانەوە ، بەڵام دەبێت لێرەدا شتێكمان لـە یـاد نەچـێت لـە بـارەی مەرسـومی
ـــلانی سالّی ٣١٣زدا بە هەرشێوەیەك ئـەو دانـی ئازادییـەو دانپێنانــەی ئیمپراتـۆر بــە
ـــ‌ـی ئایینەكە وپەیڕەوانیدا لێكبدەینەوە ، ئەوەمان لە یـاد ناچـێت كـەوا ئــەم كـردارە
ـــ‌ـرە گومان و پرسیارو سەرسامی و پەرژەوەندییەكی تێدا بەدی دەكرێت بە بیّ مەرام
ـــ‌ـوە ، بەڵام هەرچۆنێك بووبێت لـە كۆتاییـدا بـە قـازانجی مەسـیحیەكاندا شـكایەوە ،
ـــەم ماوەیەدا مێژووی ئاینی مەسیحی پێدەنێتە قۆناغێكی ترەوە كە بریتیە لە ئـازادی
ـــ سـەربەخۆیی وفراوان خوازی هەوڵدان بۆ وەرگرتنی هەردوو دەسەڵاتەكە ، چـونكە ئــەو
قۆناغەی بە ڕێ كرد كە بـریتی بـوو لـە كـاری نهێنی ماوەیـەكیش تووشـی ئەشـكەنجەو
ـــزرو مردن و مەینەتی هەمە چەشنە هات ،

ـــ‌ـكەنیسەی مەسیحی و سەرەتای وەرگرتنی دەسەڵات :-

كەنیسەی مەسیحی (كاتۆلیك) لە پاش ئەوەی كەوا توانی بـە ئـازادی ئایینەكـەی بخاتــە
ـنـو خەڵكـدا ، وە خــەڵكیش زۆر بــە پەرۆشــەوە لــە دەوروبــەری كەنیـسەو پیــاوانی دا
كۆبوونەوە ، وەلەو لاشەوە بوّتـە جێگـەی مەترسـی بـۆ دەسـەڵاتی سیاسـی ئیمپراتـۆر.
چونكە لـە سـالّی (٣١٣)زدا ئیـدی كەنیـسە چـووە فـۆرمی ڕێكخراوێكـی نیمـچە سیاسـی
وخـاوەن دەسـەڵات و سیـستەمی پــەیڤی تایبــەت و لــە ڕووی هــزری سیاسـی و كـرداری
سیاسیەوە چەند ئاڕاستەیەكی نوێی تێیـدا پەیـدا بـووە پێـشەوایانی ڕۆم كاریگەریـەكی
وایان پەیدا كرد لە سەر ئیمپراتۆروپاشاكان . وەبەشێك لە سنوورەكانی كەنیـسەیان بــە
جیا زانی لــە دەسـت تێوەردانــەكانی دەوڵــەت ، وەكەنیــسەش هــەر زوو بــە ئاگــا هــاتوو
خوازیاری سەربەخۆیی زیاتری كرد و هێڵی جیاكەرەوەش كێشرا لە نێـوان مەرجەعیــەتی
كەنیــسە و دەســەڵاتی حكومەتــدا [٦٤] ، وەلێــرە بــەدواوە ش كۆمــەڵێك گۆڕانكــاری

سەرهەڵدەدات چ لە نێو خودی ئیمپراتۆر وەچ لە نێو خودی کەنیسەی مەسیحی ئەمە جیا لەوەی کە وادۆخی ئیمپراتۆریەت لە گەڵ کەنیسەو پیاوانی دا بە بارێکی تردا رۆیشتن بۆ نموونە لە ساڵی (٣٩٥)زدا واتە پاش کۆچی دوایی ئیمپراتۆر (پیودوسیوس) دا ، ئیمپراتۆریەت دابەش کرا لە نێوان کوڕە لاوەزەکانیدا ، یەکەمیان (ئەرکادیوس) کە لەسەر بەشی ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریەت و پایتەختەکەشی لە قوستەنتینیە بوو ، وەدووەمیشیان (هونوریوس) کە لەبەشی ڕۆژئاوای ئیمپراتۆریەت و پایتەختەکەشی (ڕافنا)بووە[٦٥]، وە دەبێت خاڵێکی زۆر گرنگمان لە یاد نەچێت ، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ناکۆیەکی تیژ هەبووە لە نێوان کەنیسە و ئیمپراتۆریەتدا[٦٦]، بێگومان ئەمەش وای لە کۆمەڵگا کردووە کە بە تەواویماندووبونیان پێوە دیاربێت وەڕیشەی ئەم دیاردەیەش زیاتر لەو کاتەدا بە دیار کەوت کەوا کەنیسە ئەو کات خەریکی خۆبەهێز کردن بووە وەڕزگاری بووە لە چەوساندنەوە ، جابۆیە هەوڵی دەدا کەوا جگە لە دەسەڵاتی ئایینی جڵەوی دەسەڵاتی دنیەویش بگرێتە دەست ، جا هەر کەم و کورتیەك یاخود هەر ناکۆکی لاوازی و دوو بەرەکیەك بە دی کرابا لە نێو ئیمپراتۆریەت بەتایبەتی لەم ماوەیەدا ، ئەوە زیاتر بە قازانجی کەنیسەو پیاوانی دا دەشکایەوە ، لێرە بە دوواوە ئەگەر سەرنج بدەین ئەوەمان بۆ بە دیار دەکەوێت کەوا کەنیسەو پیاوانی بیرکردنەوەو کردارییان خستۆتە بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵاتی ئیمپراتۆر، وەنیازو مەبەستیان وابووە هەر خۆیان ببن بە خاوەنی هەردوو دەسەڵاتەکە .

لێرەدا پرسیارێك دێتە کایەوە ، ئاخۆ دەبێ هەوڵی کەنیسە بۆ دروست کردنی دەوڵەت یاخود خۆ خزاندنە نێو کاروباری ڕامیارییەوە چ سوودێکی هەبێت بۆ ئەو ئایینە ، وەتا چەند لە گەڵ ئایینەکەدا کۆك وتەبایە ؟ وەلەبەرژەوەندی خودی ئایین و کۆمەڵگاکەیە؟ چونکە ئەوەتا لە زاری عیساوە لە ئایەتی (٣٦) ی بەشی (١٨) ئینجیلی

یوحنادا هاتووه كه (پادشایەتی من لەم دونیایەدا نییە)[٦٧]، لێرەدا گرنگە سەرنجی ئەوە بدەین كەوا لە زۆرینەی كات و جێگاكاندا پەیامی ئایینەكە و پەیامبەرەكەیان لە بیر چووەتەوە ، وەكاری پێ ناكرێت بەڵكو وێڵی بەرژەوندی و مەرامی دونیایی خۆیان و ئامانج و مەبەستی ئایینەكە ، جا بۆیە ئەمە جۆرە كردارانە ناكەوێتە ئۆباڵی خودی ئایینەكە ، بەڵكو مرۆڤ لێی بەرپرسیارە كەوا ناتوانێ یاخود نازانێ مامەڵەیەكی باش وتەندروست لە گەڵ ئاین دا بكات ، وەئەو ناكۆكیەش كە هەبووە لە سەدەكانی ناوەڕاست دا لە نێوان پاپاو ئیمپراتۆر . ئەوەبوو كەوا پشتیوانانی پاپا دەیانگووت ڕوح لە سەروی لاشەوەیە كەنیسەش نوێنەرایەتی ڕوح دەكات و دەوڵەتیش نوێنەرایەتی لاشە دەكات ، كەواتە سەرۆكی ڕۆمانی پاپا دەبێت لە سەروی سەرۆكی دنیوی دا بێت ، كە چی پشتیوانانی ئیمپراتۆر دەیانووت پیاوانی ئایینی ماڤ ئەوەیان هەیە كە فەرمانڕەوایی مەملەكەتەكەیان بكەن و خۆیان لە كاروباری دەوڵە ت دا هەڵنەقورتێنن كە لە دەروەی چوارچێوەكەیان ،[٦٨] جالێرەدا تێبینی دەكەین ، كەوا كەنیسەی ڕۆما ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە ژیانی كۆمەڵایەتی كۆمەڵگای ڕۆژئاواو ناوەڕاستی ئەوروپادا كاریگەرتر دەبوو ، ئەمەش بە سەر دەسەڵاتە سیاسیەكەی دا كاردانەوەی دەبوو، جا بۆیە پاپاكان هەر زوو كەوتنە هەڵبەی ملكەچكردنی دەسەڵاتی دنیایی[٦٩] وەئەم هەوڵەی كەنیسە بەردەوام بووەو هەمیشە كاری بۆی دەكرد. ئەوەتا (ئیمبرۆز) (٣٤٠-٣٩٨)ز، لای وابووە كەنیسە تایبەت مەندە بە مەسەلە ڕوحیەكانی گشت مەسیحیەكان وە پێیشی وابووە ئیمپراتۆر جودا نییە و یەكێكە لە كوڕەكانی ، ئنجا بۆیە دەبێت تێڕوانین بۆئیمپراتۆر لە چوار چێوەی كەنیسەدا بێت نەك لە سەرووی ئەو چوار چێوەیەدا[٧٠]، وە بەجوامێری دژی بەرەنگارییەكانی دەسەڵاتی سیاسی بووە بۆ بەرژەوەندی كەنیسە[٧١] ،ئەم جۆرە قسەو باسانەی (ئیمبرۆز) شتی زۆری لێدەكەوێتەوە ،لەوانەیە كەنیسەو پیاوانی

دەیانەوێت ببن بە خاوەن دەسەڵاتێکی گەورەی جیهانی ئەوروپا ، وەلە سەری ئەوانەوە هیچ دەسەڵاتێك نەبێت ، وەهەروەها دەیان ئەویست خودی ئیمپراتۆریش لەوەانەوە دەسەڵات وەربگرێت هەر بۆیە ناوبراو لە ساڵی ٣٨٤زاییندا پەیامێکی ئاراستەی ئیمپراتۆر (فالنتین) کرد کە ئەم ووتەیەی بۆ نوسیووە (نەریت وابوو کە پیاوانی کەنیسە دادگایی ئیمپراتۆرە مەسیحیەکان بکەن ، ئیمپراتۆرەکان بۆیان نییە دادگایی پیاوانی کەنیسە بکەن) [٧٢]، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کەوا جگە لەوەی نابێت یاسا و سزا بە سەریاندا بسەپێنرێت ئیدی هەر کارێك بێت وەلە هەمان کاتدا کەنیسە خۆی بە گەورە تر دەزانێت وەهەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بووە چۆن دەسەڵاتی ئیمپراتۆر لاواز بکات.وە (ئیمبرۆز ) لە لایەکی تریشەوە باسی لەوە کردووە کەوا کۆشکەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئیمپراتۆر وکەنیسەش بۆ پیاوانی ئایینی [٧٣]،وێڕای ئەمەش گۆڕانکاری لە نێو خودی ئایین و کەنیسەی مەسیحیش دەبینین . بۆ نموونە لە سەدەی چوارەمەوە درزی جیابونەوە کەوتە نێو ئاێینی نێوبراوو،وەسەرەتای ئەم جودابونەوەش لە رووی فکریەوە لە کۆنگرەی (ئەفسوس)ی یەکەمدا لە ساڵی (٤٣١)زاینیدا بە ڕونی دەرکەوت[٧٤] ، وەهەر لە سەدی چوارەمدا بەرهەڵستی (الآريوسيه)ئاریوسی لە تێڕوانینی کاتۆلیك دا ، مەترسی دارترین بەرهەڵستەکان بوو کەوا کەنیسە ڕووبەڕووی بوویەوە[٧٥] ،ئەگەر سەرنج بدەین لەم ماوەیەدا ، هەرچی شتێك بگۆڕدرێت هێشتا کاتی ئەوە نەهاتووە کەنیسە و پیاوانی حەزو ئارەزوو ئاواتی وەرگرتنی دەسەڵاتی سیاسیان لە بیر بچێت ، یاخود هێشتا ئەو ڕوحە یاخیانە لە دایك نەبوونە کە دواتر دێنە دنیاوە دەبن بە بەرهەڵستکارێکی کارای دژ بە کەنیسە و پەردە لە سەر گەندەڵییەکانی لادەبەن بەڵکو لەم قۆناغەدا هەنگاو بە هەنگاو کە دەینێن زیاتر لە دەسەڵات نزیك دەبنەوە ،یاخود بە واتایەکی تر هەوڵەکانی کەنیسە کاری کردبووە سەر لاوازی و کەم کردنەوەی دەسەڵاتی ئیمپراتۆر .چونکە لە

کۆتـایی سـەدەی پێنجەمـدا ، دیـسان پاپـا (کلاسیوسـی یەکـەم )(٤٩٢-٤٩٦) ز ، لەنامەیەکی دا بۆ ئیمپراتـۆر (أنـستاسیوس) ی ناردووە وەتێیـدا هـاتووە :(( جەلالـەتی ئیمپراتۆر،دوو دەسەڵاتی سەرەکی هەن کە بەشـێوەیەکی فـەرمی فـەرمانڕەوایی جیهـان دەکـەن ئـەویش دەسـەڵاتی پیـاوە ئاینیـەکان وپاشـاکانە ، بـەڵام دەسـەڵاتی پیـاوانی ئایینی مەزن ترە ،بەو پێیەی لایەنە پیرۆزەکان ڕاڤە دەکات ، ئەویش بزانە کـە تـۆ هـەر چەندە بە سەر ڕەگەزی مرۆڤدا دەسەڵاتت هەبێت ، دەبێ سەری ڕێـز بۆپیـاوانی ئـایینی دانـوێنی و لـە دەسـتی ئەوانـەوە چـاوەڕێی ڕزگـاری بێـت ، ... بۆیـە پێویـستە دان بـە ملکەچیدا بنێیت بۆیان نەك خۆت بـە گـەورە بزانیـت ))[٧٦] ، وەهـەروەها پاپـا (لیـو) ی یەکەم (٤٤٠-٤٦١)ز ئەوەی سەلماند کەوا دەسـەڵاتە ئاینیـەکان توانـای لـە دەسـەڵاتە مەدەنییەکان کەمتر نابێتەوە لە گرنگی دان بـە کاروبـاری چـاودێری لـە ڕێگـای شـێوازە دنیەوێکانـدا[٧٧]، وەپاپـا (جریجـوری گـەورە )ش لـە (٥٩٠-٦٠٤) ز ، پـاش ئـەوەی بـە کۆششی تایبەتی خۆی گەیشتە پلەیەك لـە بـەهێزی دا [٧٨]، وەڕۆڵێکـی کـارای بـینی لـە بڵاوکردنەوەی مەسیحیەت لە ئیسپانیاو ئینگلتـەرادا [٧٩]، وەکـاری لەسـەر ئـەوەش کـرد کـەوا مەسـیحیەت لـە نـاوخۆو دەرەوەی ئیمپراتـۆردا بڵاوببێتـەوە [٨٠]، ئـەم هـەوڵ وتەقەلاکردنە لە ڕاستیدا مەترسیەکی گەورەی لێدەخوێنرێتەوە بۆ دەسـەڵاتی ئیمپراتـۆر کـەدواتر بۆمـان بـەدیار دەکـەوێت ، ئەمـە وێـڕای ئـەوەی کـەوا دەبێتـە مەینـەتیش بـۆ کۆمەڵگاکەی . چونکە دەرکەوتنی کەنیسە وەکو دامەزراوەیەکی سـەربەخۆ لـە دەوڵـەت کە ماف فەرمانڕەوایی کردنی ڕەگەزی مرۆیی هەبێ لە چوار چێوەی کاروبارە ڕوحیەکاندا ، بۆخۆی ترسناکترین ڕوداوی شۆڕشگێڕانەیە لە مێژووی ئەوروپای ڕۆژئاوادا[٨١] ، ئەگـەر فـەرمانڕەوایی کەنیسە بـۆ کاروبـارە ڕوحیـەکان هێنـدە جێگـای مەترسـی بێـت لـە لای خەڵکی ، ئەدی هەوڵدان بۆ فراوان بوون خۆخزاندنە نێو کاروباری ئیمپراتۆر و پـشکداری

لـە دەسـەڵاتی سیاسـی چ ترازدیایـەکی هـەبێت ؟ بـەڵام ڕەنگـە کۆمـەڵگاو دەسـەڵات ترسـاندنیان لـە وەرگـرتنی دەسـەڵاتی ئـاینی لـە لایـەن کەنیـسەو پیـاوانی ،لـەوەوە سەرچاوەی گرتبێت کە لایان وابووە ئـەم کارەیـان دەتـوانن وەکـو دەروازەیـەك بـە کـار بهێنن بۆ وەرگرتنی کاروبـاری ڕامیـاری ، هـەر لـە چـوار چێوەی هەوڵـەکانی کەنیـسەی مەسیحی بۆ کەم کردنەوەی دەسەڵاتی ئیمپراتۆر و فراوان بوونی دەسەڵاتی خۆی .پاپـا (ستیفن)ی دووەم (٧٥٢–٧٥٧) ز بەڕێگەیەکی نهێنیدا لە ڕۆمـا دەرچـوو وە ڕۆیـشت بـۆ لای (بیبن) ی سێهەم ، لەم زیارەتەدا هاوپەیمانییەك لە نێوان هـەردوو لادا بەسـترا پاپـا بە پێی ئەم پەیمانە ویلایەتی (ڕاڤنا) وهەموو شتومەکەکانی بیزەنتی جارانی لە ئیتالیادا دەسکەوت ، ئەمە وێڕای هەردوو دۆقییەی (سبولتو -- وینفنتـو) ،وەشـایەنی باسـە ئـەم ڕووداوە لە مێژوودا بە بەخـشندەی (بیـبن) ناسـراوە وەبەرامبـەر بەمـەش.پاپـا (بتتـوتج بیبن) دووبارە بوو بە پادشای (فرنجە)، وەئەم ڕووداوە بووە هۆی دامەزراندنی دەوڵەتی پاپەوی[٨٢] ، کەلەناوەڕاستی ئیتالیـادا بـوو ، سـوپاو دادگـاو خەزێنـەی تایبـەتی خـۆی هــەبووە[٨٣]، کەواتــە دەتــوانین بڵــێین ، کەنیــسە لــە ســەروی دەوڵەتەوەیــە لــە سەربەخۆییەکی تەواوەوە لە دەوڵەتـدا[٨٤]، بێگومـان ئەمـەش یەکێکـە لـەو گۆڕانکارییـە بەرچاوانەی مێـژووی سـەدەکانی ناوەڕاسـت لـە ڕۆژئـاوای ئـەورووپادا ، کـەوا دەسـەڵاتی کەنیسەو سەربەخۆیی زیاتری پێ بەخشی وبە دیارکەوت ، چـونکە دەسـەڵاتی ڕۆمـی لـە سەدەکانی ناوەڕاست دا گەلێك بەرزتر بووە لە دەسەڵاتی زەمەنی وحوکمەت ،پاپاش بە هەموو شـێوەیەك لـە هـەوڵی ئـەوەدا بـوو کـە نـەهێڵێت حوکمـەتێکی زەمـەنی بـە هێـزو یەکگرتوو هەبێت ، وەهەر پاپا و کەنیسە سـەرداری پادشـا و میرەکـان دەبەخـشی هـەر خۆشی تاجی پاشایەتی دەنایە سەریان ، وەئەگەر پاپا ڕقـی لـە یـەکێك لـە پادشـا یـان میرەکان هەڵبگرتایە ئەوە دەسەڵاتی لێ دەسەندەوە ، بۆ نموونە شارلمان (کەیفی بەوە

ـەدەهات كە پاپا تاجی پادشایەتی بناتە سەری بەڵام پاپا بە پیلان توانی لـەم كارەیـدا سـەركەوتن بە دەست بهێنێت) [85]، وەهەروەها لە دەسەڵاتی بوو كەوا هەر یاسایەك كـە كۆسپ و تەگەرە بێت لە گەڵ بەرژەوەنـدی كەنیـسە دا هەڵیبوەشـێنێتەوە ، ئیـدی هـەر ـەوڵەتێك بێت[86]،دەبێت پرسی هەوڵی كەنیسە بـۆ وەرگـرتنی دەسـەڵاتی سیاسیـشمان ـە یاد نەچێت ، چونكە ئەم بابەتە هۆكارو ڕیشەی خۆی هەیە .كەنیسە گرنگـی دەدا بـە ژیانی كۆمەڵایەتی ئایینی وەهەروەها ژیان و ڕامیاریش لە میانەی (بەخشی قوستەنتینیە ـی ساختەوە بووە [87]،ئەوە بەخششە بوو كە پاپاكان لە سەدەی (٨)زهەشتەمدا وەكو پشتیوانیەكی مێژوویی بۆ دەسەڵاتی دونییان دایـان هێنـابوو ، گوایـە سـەدەی چـوارەم قوسـتەنتین دوای گواسـتنەوەی پایتـەخت لـە ڕۆمـاوە بـۆ(كوسـتەنتینۆپل) ەوە مـاف دەسەڵات دارێتی ڕۆماو دەوروبەری بە پاپا بەخشیووە [88]، بەڵگەنامەكە ئاماژەی بـەوە كردووە كەوا قوسـتەنتینی گـەورە چـەند ئیمتیـازێكی گـەورەی بەخـشیوە بـە كەنیـسەو كردویەتی بـە سـەرۆكی هـەموو كەنیـسەكان [89] ، وەهـەر لـە سـەدەی (٨) زهەشـتەمدا پاپەویەت لە داواكارییەكانی سەروەری جیهانی سیاسی و ئایینی شدا پشتی بە (بەخشی قوستەنتین ) دەبەست ،وە ئەم بەڵگەنامەیە چەكێكی بەهێز بوو كە بـۆ مـاوەی نزیكـەی (٧)سەدە مایەوە بە دەستی پاپەویەت[90] وەساختەیی ئـەم بەڵگەنامەیـە ئاشـكرا نـەكرا هەتاوەكو ساڵی (١٤٤٠)ز لە لایەن مێژوو نووس (لورنزوفالا) وە [91]،سەیر لەوەدایە كـەوا (الیوسف ) لە پەرتووكەكەیدا باس لەوە دەكات كەوا بەڵگەنامەكە ئامازەی بەوە كردووە ئەم كارە پێش گواستنەوەی كەنیسەی ڕۆما بووە بۆ قوستەنتینیە[92]، كەچی (ئەحمەد) باسی لەوە كردووە كەوا دوای گواستنەوەكە بووە ، ئێمـە زیـاتر لـە گـەڵ بۆچـوونەكەی (الیوسف )داین .

وەهەر لە چوار چێوەی هەوڵەکانی کەنیسە بۆ دەستێوەردانی کاروباری سیاسی دا دەبینین درێژەی هەیە ،ئەوەتا پاپا (گریگۆری حەوتەم ) سەرکەوتنێکی گەورەی بە سەر ئمپراتۆر (هنری چوارەم) (١٠٥٦-١١٠٦)زدا بە دەست هێنا وەپاشانیش لە سەردەمی پاپا (ئینوسنتی سێهەم) (١١٩٨-١٢١٦) زدا ، دەسەڵاتی پاپا گەیشتە لوتکەی بەهێزی[٩٣] ئەمە وێرای ئەوەی کەوا لە نێو خودی کەنیسەو پیاوانی دا گۆڕانکاری دروست بووە ، وەڕاوبۆچوونی جودا جودا هەبووە لە نێو ئایینی مەسیحیدا هەروەکو دواتر وە بە تایبەتی لە سەردەمی چاکسازی ئایینی دا ، سێ ڕێبازی جیاواز لە یەکتر پەیدا دەبێت ،ئاشکرایە لە سەرەتا (کاتۆلیك وئارثوذکس) هەبووە بەڵام لە سەردەمی مارتن لۆتەر (١٤٨٣-١٥٤٦) زدا مەزهەبی (پرۆستانت ) یش دێتە ئاراوە ،ئەمەش زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دۆخەی کەوا کەنیسە تێیدا بووە ،چونکە لەم کاتەدا جێگیر بوون و ترسیان نەماووە ،تاڕادەیەکی زۆر باش دەسەڵاتیشیان گرتە دەست ، جا بۆیە نابێت سەیر بێت بە لامانەوە کەوا لە نێو خودی ئایینەکەشدا بۆچوونی جیاجیا لە ئارادا بێت ، ئەوەتا لە ساڵی (١٠٥٤) ز بە یەکجاری هەردوو کەنیسەی (کوستەنتینۆپل) ڕۆژهەڵات (ئەرسوذکس) و کەنیسەی (ڕۆمانی) ڕۆژئاوایی (کاتۆلیك) لە یەکدی جودا بوونەوە[٩٤]، لەبەر ڕۆشنایی ئەم باسانەوە کەوا زیاتر خۆی لە ململانێی نێوان کەنیسەی مەسیحی ودەسەڵاتی زەمەنیدا دەبینێتەوە ، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کەوا دەسەڵاتی کەنیسەی مەسیحی لە سەدەکانی ناوەڕاست دا خاوەن دەسەڵاتێکی فراوان بووە ، بێگومان ئەمەش لە سەر حسابی دەسەڵاتی ئیمپراتۆردا بووە ،لە گەڵ ئەوەشدا ئەوە دەخوێندرێتەوە کە دەسەڵاتی سیاسی یاخود ئیمپراتۆر لەم ماوەیەدا پەرچەکردارێکی وەهای نەبووە هەتاوەکو کەنیسەو پیاوانی بخاتە مەترسییەوە ،وەچیتر خۆیان لە کاروباری ئیمپراتۆردا هەڵنەقورتێنن ، بەڵام ڕەنگبێ بێ دەنگی و ئارامگرتن و

داپۆشی کردنی دەسەڵات و ئیمپراتۆر بۆ کەنیسە بگەڕێتەوە وەبۆهۆکارێکی زۆر گرنگ . ئەویش ئەوەیە دەسەڵاتی سیاسی یاخود زەمەنی بە باش دەیزانی کەوا ئایینی مەسیحی وپیاوانی ڕەگ و ڕیشەی لە نێو ناخ و هەناوی کۆمەڵگاکەی داکوتاوە ، وەخەڵکانێکی زۆری لە دەور کۆبووەتەوە ، وە لەوە دەرچووە بتوانرێت بە ئاسانی زاڵبێت بە سەریدا وەلە لایەکی تریشەوە کەنیسە و پیاوانی هەموو ئەو کارو کردەوەانەی کە دەیانکرد بە بیانووی ئەوەوە گوایە پیاوانی توانای ئەوەیان هەیە کەوا خودی ئایینەکەو بەرنامەکەی بە مرۆڤ بگەیەنن . وەلایان وابووە تاکە ڕێگەی پەیوەندی نێوان مرۆڤ ویەزدان وەکلیلی نهێنیەکان لە دەستی ئەواندایە و داهێنانی چەند پەیڕەوێکی ناڕوون و غەیبی ، بە تایبەتی حەوت نهێنیەکان کەوا لە سەدەی دوازدەوە بە تەواوی بەرجەستە بوون کە بریتین لە ((ڕاگیرکردن – چەسپاندن –قوربانی پیرۆز – تۆبە کردن –سڕینەوەی پیرۆز – نهێنی قەشە –نهێنی هاوسەرگیری ))[٩٥]، هەموو ئەمانە بانگەشە کردنی فەرمانڕەواییەکی تاکو ڕەهایی لێدەکەوێتەوە .

پەراوێز و سەرچاوەکان :

---

١–مـراد ،خليـل علـي وآخـرون: دراسـات في تـاريخ الأوروبـي الحـديث والمعاصـر،جامعة الموصـل ، ١٩٨٨،ص ١٣.

٢–فرح ،نعيم : تاريخ أوربا السياسي في العصور الوسطى ، جامعة دمشق ، ٢٠٠١ –٢٠٠٢،ص٣.

٣– مراد ،المصدر السابق ،ص١٣.

٤– فرح ،المصدر السابق ،ص٣.

٥– مراد ،المصدر السابق ،ص١٣.

٦– فرح ،المصدر السابق ،ص٥.

٧–ترحيني ، محمد أحمد :معالم التاريخ البيزنطي ،بيروت ،٢٠٠٣.ص١١.

–٨العريني ،سيد الباز: الحاضرة والنظم الأوروبيـة في العـصور الوسـطى ،بـيروت ،١٩٦٣،القسم الأول ، ص٨٣.

٩–ترحيني ،المصدر السابق ،ص١٢.

١٠– فرح ،المصدر السابق ،ص٥–٦.

١١–العريني ،المصدر السابق ،ص٨٣.

١٢– مراد ،المصدر السابق ،ص١٤.

١٣– ترحيني ،المصدر السابق ،ص١٢.

١٤– ترحيني،المصدرنفسه ،ص١٤.

١٥– مراد ،المصدر السابق ،ص١٥.

١٦– مراد ،المصدر نفسه ،ص١٥–١٦.

١٧– عمران ،محمود سعيد : تاريخ أوربا في العصور الوسطى ،بيروت ،٢٠٠٦،ص٢٩.

١٨– فرح ،المصدر السابق ،ص١١.

١٩– العريني ،المصدر السابق ،ص٨٥.

٢٠– مراد ،المصدر السابق ،ص٢٠.

٢٠- ويلسون،كولن : سقوط الحضارة ،أنيس زكي حسن ،بيروت ،١٩٨٧،ص١٤١.

٢١- فرح ،المصدر السابق ،ص٧.

٢٢- اليوسف ،عبدالقادر أحمد : العصور الوسطى الأوروبية ، بيروت ،١٩٦٧،ص١٤.

٢٣- فرح ،المصدر السابق ،ص٨.

٢٤- اليوسف،المصدر السابق ،ص١٤.

٢٦- مراد ،المصدر السابق ،ص١٤.

٢٧- بۆ زیاتر زانیاری لەمبارەبەوە ، دەڕوانرێتە ، اليوسف ،المصدر السابق ، ص١٣-٢٧.

٢٨-عمرا ن، المصدر السابق ،ص٢٠.

٢٩- اليوسف،المصدر السابق ،ص١٣٩-١٤٠.

٣٠- عمرا ن، المصدر السابق ،ص٢٩.

٣١- عمرا ن، المصدر نفسه،ص٣٠-٣١.

٣٢- الجميل ،شوقي عطاالله ، إبراهيم ،عبدالله عبدالرزاق :تاريخ أوربا من النهضة حتى الحرب الباردة .القاهرة ،٢٠٠٠،ص١٥.

٣٣- عمران ،المصدر السابق ،ص٣٢.

٣٤-حنا ،جورج ،چیرۆکی ئادەمیزاد ، و: ڕۆوف زوهدی ، سلیمانی ،٢٠٠٧،ل ١٠٥.

٣٥- ديورانت ،ول :قصة الحضارة (قيصر والمسيح) ، ت:محمد بدران ، مصر ،٢٠٠١ ،ج(١١-١٢) ، من المجلد (٦) ،ص٢١٣.

٣٦- مالرب ، میشل : مرۆڤ وئایینەکان ، و: عمران هاواری ، سلیمانی ،٢٠٠٩،ل٨٢.

٣٧- کەنەدی ،علی :مێژوو نامە ،هەولێر ،٢٠٠٧،بەرگی یەکەم ،ل١٥.

٣٨- ديورانت ،المصدر السابق،ص٢١٢.

٣٩- مراد، المصدر السابق ،ص٢٠.

٤٠-الملاح ،هاشم يحيى:المفصل في فلسفة التأريخ،بيروت ،٢٠٠٧،ص٨٢.

٤١-المصدر السابق،ص٢٠٢.

٤٢-حنا،سەرچاوەی پێشوو، ل١١٠.

٤٢–حنا ،هەمان سەرچاوە ،ل١٠٧.

٤٤– حنا ،هەمان سەرچاوە ،ل١٠٦.

٤٥–أحمد،سامان حسين:ڕەهەندەکانی ڕیفۆرمی ئایینی لە ئەورووپا ،دهۆك ،٢٠٠٧،ص٤٠.

٤٦– حنا،سەرچاوەی پێشوو، ل١١٤–١١٥.

٤٧– کندی ،سەرچاوەی پێشوو،ل١٦.

٤٨– أحمد،سەرچاوەی پێشوو،ل٤١.

٤٩– مراد، المصدر السابق ،ص٢١.

٥٠– عبدالجبار ،نبيل عبدالحميد ، تاريخ الفكر الاجتماعي ،أربيل ،٢٠٠٥،ص٩٦.

٥١– اليوسف،المصدر السابق ،ص٣٦.

٥٢– مراد، المصدر السابق ،ص٢٠.

٥٣– اليوسف،المصدر السابق ،ص٣٦.

٥٤– مراد، المصدر السابق ،ص٢٠.

٥٥– اليوسف،المصدر السابق ،ص٣٦.

٥٦–اليوسف ،المصدر نفسه ،ص٣٧.

٥٧– اليوسف ،المصدر نفسه ،ص٣٦.

٥٨– عمرا ن، المصدر السابق ،ص٤٤.

٥٩– ديورانت ،المصدر السابق،ص٣٨٥.

٦٠– عمرا ن، المصدر السابق ،ص٤٥.

٦١– أحمد،سەرچاوەی پێشوو،ل٤١.

٦٢–أنور ،کەیوان ئازاد ،مێژووی ئایینەکان ، سلیمانی ،٢٠٠٩،بەرگی یەکەم ،ل١١٦–١١٧.

٦٣– أحمد،سەرچاوەی پێشوو،ل٤٢.

٦٤–پۆلادی ،کمال :مێژووی هزری سیاسی لە ڕۆژئاوا ، و:ئازاد وەلد بەگی وسیروان زەندی ،هەولێر ،٢٠٠٥،بەرگی یەکەم ،ل١٢٠.

٦٥– ترحيني :المصدر السابق ،ص٢٥.

٦٥-المقرحي ،أ.ميلاد:موجزتاريخ أوروبا الحديث والمعاصر،بنغازي ،١٩٩٨،ص١١٧.

٦٦-پوڵادی ،سەرچاوەی پێشوو،ل١٢١.

٦٧- سليمان ،علي حيدر ،تاريخ حضارة الأوروبية الحديثة ،بغداد ،١٩٩٠،ص٢٧.

٦٨- أحمد،سەرچاوەی پێشوو،ل٤٦.

٦٩- صالح ،غانم محمد ،بیری سیاسی کۆن وناوڕاست ،و:سلام کريم ،سيد صادق،٢٠٠٥،ل٣٠١-٣٠٢.

٧٠- اليوسف،المصدر السابق ،ص٦٠.

٧١- صالح ،سەرچاوەی پێشوو ،ل٣٠٢.

٧٢-صالح،هەمان سەرچاوە ،٣٠٤.

٧٤- أحمد،سەرچاوەی پێشوو،ل٤٢-٤٣.

٧٥- صالح ،محمد محمد ،تاريخ اوربا من عصر النهضة وحتى الثورة الفرنسية ،بغداد،١٩٨٢،ص١٧٩.

٧٦- أحمد،سەرچاوەی پێشوو،ل٤٦-٤٧.

٧٧- اليوسف،المصدر السابق ،ص٦٦.

٧٨- عمرا ن، المصدر السابق ،ص١٨٠.

٧٩- مراد، المصدر السابق ،ص٢٣.

٨٠- عمرا ن، المصدر السابق ،ص١٨٠.

٨١- صالح ،سەرچاوەی پێشوو ،ل٢٩٤.

٨٢- عمرا ن، المصدر السابق ،ص١٨٤-١٨٥.

٨٣- مراد، المصدر السابق ،ص٢٣.

٨٤- سليمان ،المصدر السابق، ص٢٧.

٨٥- حنا،سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٩-١٦٠.

٨٦- صالح، المصدر السابق ،ص١٧٣.

٨٧- الشامي ،فاطمة قدورة، علم التأريخ،بيروت ،٢٠٠١، ٧٢.

٨٨- أحمد،سەرچاوەی پێشوو،ل٣٦.

٨٩- اليوسف،المصدر السابق ،ص٧١.

٩٠- مراد، المصدر السابق ،ص٢٣.

٩١- اليوسف،المصدر السابق ،ص٧٠.

٩٢- المصدر السابق ،ص٧١.

٩٣- أحمد،سەرچاوەی پێشوو،ل٤٧.

٩٤- أحمد،هەمان سەرچاوە ،ل٤٣.

٩٥- أحمد،هەمان سەرچاوە ،ل٤٧-٤٨.

# کورد و وڵاتەکەی لە ساڵانی ( ١٦-٤١ك / ٦٣٧-٦٦١ز ) لە کتێبی " تاریخ الامم والملوك" ی تەبەریدا

هۆگر رحمان قادر
زانکۆی سەلاحەدین

تەوەرەی یەکەم:

فەتح کردنی شار و ئاوەدانیە کوردنشینەکانی هەرێمی چیاکان لەسەرەتاوە تا ساڵی بیستەمی کۆچی

**یەکەم فەتح کردنی جەلەولا لەساڵی(١٦ك [1]/٦٣٧ن) لەلای الطبری:**

دوای فەتح کردنی(المدائن–مەدائن) لەلایەن سوپای ئیسلامیەوە هەواڵی ئەوە بەموسڵمانەکان گەیشت، کەبەشێك لەهێزەکانی سوپای فارس و ئیمپراتۆریەتی ئەو کاتی ساسانی لەجەلەولا کۆبونەتەوە و خۆیان ئامادەکردوە بۆ ڕووبەڕووبونەوە و جەنگان دژ بەسوپای موسڵمانەکان[2] لەم کاتەدا (سعد بن أبی وقاص/ سەعد کوڕی ئەبی وەقاس)[3]یش ئەم هەواڵەی بەخەلیفە (عمر بن خگاب/عومەر کوڕی خەتاب) ڕاگەیاند خەلیفەش نوسراوێکی بۆ سەعد نووسی و لەمیانەی ئەم نووسراوە دا پێ ی ڕاگەیاند کە (هاشم بن عتبە /هاشم کوڕی عوتبە)[4] بنێرە بۆ بەرەی جەلەولا بۆ سەرکردایەتی کردنی دوازدە هەزار جەنگاوەری موسڵمانان[5]، لەو سەروبەندە دا خەڵکی ناوچەکانی ئازەربیجان وخەڵکی چیاکان و فارس بەهەر پاڵنەرێك بووبێت کۆبونەوە و خۆیان بۆ جەنگان و ڕووبەڕووبونەوەی موسڵمانەکان ئامادەکرد و لەم کاتەدا

(یەزدەجردی سێ یەم)[6] لەحەلوان نیشتەجێ ببوو، بەجەنگاوەرو سامان یارمەتی ئەم خەڵکانەی دا[7].

کەواتە لەنێو خەڵکی کۆبوەوەی ئازەربیجان و چیاکان دا بێگومان کوردیشی تیادا بووە، ئەگەر بە جەنگاوەرانێکی کەمیش بووبێت لەنێو ئەو خەڵکانەدابوون کەخۆیان سازوئامادەکردووە بۆ ڕووبەڕووبونەوەی موسڵمانەکان شان بەشانی خەڵك و نەتەوەی تری ناو چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی ساسانی ئەوکاتە ئەمە جگە لەوەی کە یەزدەجردیش ناوچەیەکی کوردنشینی وەکو حەلوان ی بەکارهێناوە،ئەگەرچی بەشێوەیەکی کاتیش بووبێت بەمەبەستی نیشتەجێ بوونی کاتی خۆی و دەست و پێوەندەکانی و سەرپەرشتی کردنی ئەم بەرەو شەڕە ئەگەرچی لەدووزەوەش بێت و یارمەتی دانی ئەم بەرەیە بە پیاو و سامان . هەر لەبارەی جەنگی جەلەولاوە (خلیفة بن خیاط) ی مێژوونوس دەڵێت: ((یەزدەجرد نوسراوی بۆ کاربەدەستان و خەڵکانی هەرێمی چیاکان نووسی و جەنگاوەری کۆکردەوە و ناردی بۆ جەلەولا))[8].

کەواتە بەدوور نازانرێت ئەم جەنگاوەرانەی کە یەزدەجرد کۆیکردونەتەوە لەهەرێمی چیاکان بە هەر ژمارەیەك بووبێ، کەم یان زۆر، کوردیشی تێدا بووبێ چونکە بەشی ڕۆژئاوای ناوچەکانی هەرێمی چیاکان کوردنشین بوو و نێردرابن بەفەرمانی یەزدەجرد بەمەبەستی ڕووبەڕووبونەوەی سوپای موسڵمانەکان.

ئیتر بەم چەشنە عەجەمەکان بە ژمارەیەکی گەلێك زۆر لەجەلەولا کۆبوونەوە،ئەمە جگەلەوەی کەیارمەتی و هاوکاری هەموو ڕۆژێك لەکاتی شەڕەکەدا دەگەیشتە بەرەی جەلەولای ساسانی لە حەلوان و لەلایەن خەڵکی چیاکانیشەوە دواتر جەنگێکی سەخت و توند لەنێوان موسڵمانەکان وبەرەی ئیمپراتۆریەتی ساسانی لە جەلەولا ڕووی دا کە لە دەرئەنجامی ئەم جەنگەدا هێزەکانی سوپای موسڵمانان سەرکەوتن و هێزەکانی بەرەی

ئیمپراتۆریەتی ساسانی لە جەلەولادا شکان[٩]، کەواتە لەم زانیاریەوە دەردەکەوێت کە حەلوان و ناوچەی (هەرێمی چیاکان)بایەخێکی گرنگیان دەبێ لەیارمەتی دانی بەرەی جەلەولای ساسانی ،چونکە حەلوان و بەشی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان دووناوچەی کوردنشین بوون و بایەخێکی گەورەی ماددی و مەعنەویان هەبوو لەناردنی ئەم هاوکاری و یارمەتیانە بۆ بەرەی جەلەولای ساسانی،هەر لەدەرئەنجامی شەڕەکەدا ژمارەیەکی زۆری سەربازی سوپای یەزدەجرد کوژران ئەمە جگەلەوەی کە (سوپای موسڵمانان) دەستیان بەسەر سامان و چەك و دیلی ژن و منداڵ و غەنائمێکی زۆرداگرت و شارەکە بەتۆبزی (زۆری) و دوای شەڕێکی سەخت فەتح کرا[١٠]. بێگومان ئەم بەشداریەی کوردەکان وەك جەنگاوەر لەڕیزەکانی سوپای ساسانی لەجەلەولادا بەهەر پاڵنەرێك بووبێت چ بەزۆر لەلایەن ئیمپراتۆریەتی ئەوسای ساسانی بەشداریان پێکرا بێت، چ فریو درابن، چ هاندرابن یاخود هەستی بەرگریکردن لە ناوچەکانیان وولاتیان پاڵیان پێوە نابن و ئەم هێزەیان بە مەترسی یەکی گەورە زانیبێ ( هێزوسوپای موسڵمانەکان) یان ئەم هێزەیان ڕەنگە بە ترسناك لەبەرامبەردا نیشان درابێ لەلایەن ساسانیەکان.

ئیتر بەم چەشنە کوردەکان بەژمارەیەکی کەم یان زۆر و بەهەر پاڵنەرێك بووبێ بەشداریان لەم جەنگەدا کرد کە لە بنەڕەتدا ئەم بەشداریەی کوردان و بەشداری خەڵکی ناوچەکانی تریش لەناو چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی ساسانی ئەو کاتە لەبەرەی جەلەولای ساسانی لە بەرژەوەندی یەزدەجرد و ئیمپراتۆریەتی ساسانی بووە بەمەبەستی لەدەست نەدان و مانەوەی دەسەلاتی یەزدەجرد و ئیمپراتۆریەتی لەسەر لێواری هەڵوەشاوی ساسانی، لەم بەشداریەی کوردەکان لەبەرەی جەلەولای ساسانی و بوونی خاکەکەشی بە گۆڕەپانی شەڕەکە کورد زیانی زۆری لێکەوت.

الطبری دەڵێت: ((کاتێك کەووتەی خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب بەخەڵکی فارس گەیشت لەبارەی ناوچەکانی ڕەشەخاك و ناوچەکانی دوای ئەو ئیتر خەڵکی فارس ووتیان ئێمە ڕازین وەك ئەوەی کە ئەوان ڕازی بوون پێ ی، کوردەکانی هەموو وڵاتی ناوچەیەك، ڕازی نابن کە گوندەکانیان بەدەست بهێنرێت ،دەستی بەسەردابگیرێت))[11].

کەواتە لەم دەقەوە دەردەکەوێت کە کوردەکان بەتایبەتی ئەو کوردانەی کە لەناوچە دوورە دەستەکان و گوندەکان دەژیان بەئاسانی نەهاتوونەتە ژێر بار و دەسەلآت و فەرمانەکانی دەسەلآتی نوێ ی ئیسلامی بەڵکو بەپێ ی توانایان هەوڵیان داوە کەپارێزگاری لەمۆرکی ژیانی ئاسایی خۆیان بکەن و نەکەونە ژێر دەسەلآتی تازەی ئیسلامیەوە لەڕووی سیاسی و ئابووری و لایەنی ترەوە لەمەشداهەڵ ومەرجی خۆیان و شوێنی جوگرافی ووڵاتەکەیان یارمەتی دەربوو.

دەشێ لەبارەی شەڕی جەلەولاوە بڵێین بەتایبەتی پەیوەندیداربوونی ئەم جەنگە بەکورد و ووڵاتەکەیەوە لەدەرئەنجامی شەڕەکە کە موسڵمانەکان سەرکەوتن بەسەر سوپای ساسانی لەم شەڕەدا (جەلەولا) وەك ناوچەیەکی کوردنشین بوو بەگۆڕەپانی شەڕەکە کەواتە شەڕەکە لەسەرخاکی کوردان ڕووی داوە، جگەلەمە کوردەکان بەژمارەیەکی دیار و بەرچاو بەشداریان لە شەڕەکەدا کرد شان بە شانی ڕەگەز و نەتەوەکانی ترلەڕیزەکانی سوپای ساسانی و بەسەرکردایەتی یەزدەجرد و ساسانیەکان بەشداریان لەشەڕی جەلەولادا کرد بەهەر پاڵنەر و هۆکارێك بووبێت بێگومان لەنێو کوژراوانی سوپای ساسانی کوردیش کوژراوی هەبووە لەشەڕەکەدا،بەلآم ئەم بەشداریەی کورد و نەتەوە و ڕەگەزەکانی تری ناو ئیمپراتۆریەتی ساسانی لەبنەڕەت دا بۆ خزمەت کردنی دەسەلآت دارانی ساسانی و یەزدەجرد بووە بەلآم لەکۆتاییدا ئەم ئامانجەی ساسانیەکان بەدینەهات، ئیتر لەئەنجامی شەڕەکەدا جەلەولا و خەڵکەکەی کەوتنە ژێر

فەرمانڕەوایی کردنی موسڵمانەکان و سەردەمێکی تازە لەمێژووی شارەکە و خەڵکەکەی دەستی پێکرد.

هەروەها دوای فەتح کردنی جەلەولا خانەقین یش بەهۆی ناردنی هێزێکەوە لەلایەن هاشم کوڕی عتبە فەتح کرا، و کاتێ هەواڵی تێکشکانی ساسانیەکان بە یەزدەجرد گەیشت ئەولە(حەلوان) بوو و بەرە و چیاکان هەڵات و موسڵمانەکانیش لەم کاتەدا دەستیان بەسەر(حەلوان) داگرت[12]. لەئەنجامی فەتح کردنی خانەقین دەسکەوتی زۆر بۆموسڵمانەکان مەیسەر بوو[13].

ئیتر بەم شێوەیە دوای فەتح کردنی جەلەولا دوو ناوچەی تری کوردنشین یەك لەدوای یەك فەتح کران ئەوانیش خانەقین و حەلوان بوون. دوای ئەوەی کە جەلەولا لەلایەن موسڵمانەکانەوە فەتح کرا ئەم هەواڵەیان بۆ خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب نووسی و باسی دەست بەسەر داگرتنی حەلوان یشیان بۆکرد و موسڵمانەکان لەمیانەی ئەم نووسراوەدا داوای مۆڵەتیان ڕێ پێدانیان کرد لەخەلیفە عومەری کوڕی خەتاب بۆ ڕاوەدونانی هێزەکانی ساسانی بەلاّم خەلیفە عومەر ئەم بۆچونەی ڕەت کردەوە و ووتی: ((دەمەوێت لەنێوان ڕەشەخاك و هەرێمی چیادا لەمپەرێك هەبێت کە هیچ لایەکمان هێرش نەکەینە سەر یەکتری و ئێمە گوندەکانی ڕەشەخاکمان بەسە و من سەلامەتی موسڵمانان بەباشتر دەزانم[14] لەئەنفال))[15]. کەواتە ئەم ووتەیەی خەلیفە عومەر بەڵگەی ئەوەیە کە گرتنی ئەم ناوچانە، کە ژمارەیەکی دیار لەناوچە کوردنشینەکانیشی دەگرتەوە ،بەهۆی سەختیەکەیەوە لەقۆناغەکەدا، لەوکات دا ئاسان نەبووە.

**دووەم: فەتح کردنی ماسبذان لەساڵی ١٦ك/٦٣٧ز لەلای طبري:**

دوای فەتح کردنی جەلەولا موسڵمانەکان ئامادەکاریان کرد بۆ گرتنی ماسبذان،ئەوە بوو هەواڵ بە(سەعد کوڕی ئەبی وەقاس) گەیشت کە هێزێکی ساسانیەکان لە دەشتەوە

بۆ موسڵمانەکان دێن ئیتر سەعدیش ئەم هەواڵەی بۆ خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب نووسی و خەلیفەش نووسراوێکی بۆ ناردەوە کە تیایدا پلانی شەڕەکە و چۆنیەتی ناردنی سەرکردەکانی و سوپاکەی پێڕاگەیاند، ئیتر دوای ئەمە موسڵمانەکان بەمەبەستی فەتح کردنی ماسبذان پێشڕەویان کرد و ڕۆیشتن تاوەکو لە دەشتی ماسبذان لە شوێنێك کە پێی دەوترێت (بهندف) [١٦] بەساسانیەکان گەیشتن و لەوێدا هەردوولا جەنگان، لەدەرئەنجامی جەنگەکەدا موسڵمانەکان سەرکەوتن و ساسانیەکان شکان و ماسبذان دوای شەڕو بەزۆری فەتح کرا [١٧]،و لەکاتی شەڕەکەدا خەڵکەکەی خۆیان لە چیاکان دا حەشار دا بەڵام دوای شەڕەکە لەسەر داوای موسڵمانەکان خەڵکەکە گەڕانەوە شارەکە [١٨].

هەرلەبارەی فەتح کردنی ماسبذان (البلاذري) دەڵێت: ((ماسبذان بەئاشتی فەتح کرا لەلایەن(أبوموسى الاشعري/ئەبو موسای ئەشعەری)[١٩] وخەڵکەکەی جەنگی سوپای موسڵمانەکانیان نەکرد ولەبەرامبەر ئەم ئاشتی یەدا بڕیار درا کە خەڵکی ماسبژان جزیە و خەراج بدەن))[٢٠]، بەڵام لە ڕاستی دا ماسبژان بەشەڕ فەتح کراوە و خەڵکی ماسبذان جەنگی سوپای موسڵمانانیان نەکرد بەڵکو دەسەڵاتدارانی ساسانی ئەو کاتە جەنگی موسڵمانانیان کرد، بەڵام ئەم شارە بە زۆری و دوای شەڕ فەتح کراوە کەواتە ئەم ڕایە لۆژیکی تر و پەسەند ترە. هەر لەم ڕووداوەدا ماسبذان کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانەکان و سەردەمێکی تازە لەمێژووی ئەم شارە لەبوارەکانی سیاسی و ئابووری و کارگێڕی دەستی پێکردووە، لەبارەی هەڵاتنی خەڵکی شارەکەش بۆ چیاکان، وا پێدەچێت خەڵکەکە لەترسی سوپای ئیسلام هەڵاتبن بەڵام دواتر لەسەر داوای موسڵمانەکان و دوای تەواو بوونی شەڕەکە گەڕاونەتەوە شارەکە.

**سێ یەم: فەتح کردنی سوق الاهواز لەساڵی ١٧ك[٢١] ٦٣٨ز لەلای الطبري:**

کێشەیەك ڕووی دا لەنێوان هورمزان لەلایەك و(غالب و کلیب) لەلایەکی ترەوە، ئەنجامی ئەم ململانێ و کێشەیەدا وا بینراکە (غالب و کلیب) لەسەر حەقن بەڵام هورمزان لەسەر حەق نیە، ئیتر ناخۆشی لەنێوان هەردوولادا ڕوویدا و لەم ململانێیەدا هورمزان)پشتی بەکوردەکان بەست بۆیە ژمارەی سوپاکەی بەهۆی کوردەکانەوە زۆربوون.

لەبەرامبەردا( سلمی و حرملە و غالب وکلیب) یش نوسراویان بۆ (عتبە بن غزوان/عوتبە کوڕی غەزوان) نووسی و تیایدا باسیان لەستەم و خراپەکاریەکانی هورمزان کرد، و عوتبەش لەم بارەیەوە بۆ خەلیفە عومەری نووسی و خەلیفەش نوسراوێکی بۆ نووسیەوە و بەهۆی ناردنی (حرقوص بن زهیرالسعدی/حرقوس کوڕی زوهێر ئەلسەعدی)[٢٢] یارمەتی دان لە ساڵی(١٧ك/٦٣٨ز)[٢٣].

ئیتر لەسەر پردی ئەهواز شەڕێکی سەخت ڕووی دا کە (سوق الاهواز)ی بە دوادا دێت کە لە دەر ئەنجامی شەڕەکە دا هورمزان تێکشکا و بەرە و ڕامهرمز ڕۆیشت، و حرقوسیش (سوق الاهواز)ی فەتح کرد، و خستیە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، چووە ناویەوە، ئیتر بەم چەشنە وولاتی (سوق الاهواز)یان فەتح کرد و جزیەیان بەسەردا سەپاند و حرقوس هەواڵی فەتح و پێنج یەکی بۆ خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب نووسی و نارد[٢٤].

(البلاذري) لە کتێبەکەی دا لەبارەی فەتح کردنی ئەهواز دەنووسێت: (مغیرە بن شعبە/موغەیەرە کوڕی شوعبە[٢٥] شاڵاوی کردە سەر سوق الاهواز لەو کاتەی کەوالی بوو لەبەصرە و هێزێکی بەسەرکردایەتی عوتبە کوڕی غەزوان دیاری کرد و نارد لە بەصرە

لە کۆتایی ساڵی ١٥ك/٦٣٦ز و سەرەتای ساڵی ١٦ك/٦٣٧ز، پاش ئەنجام دانی شەڕێك سوق الأهواز بەئاشتی فەتح کرا[٢٦].

(البلاذري) لە ڕیوایەتێکی تردا دەنووسێت: ئەبو موسای ئەشعەری شاڵاوی کردە سەر (سوق الاهواز) لەو کاتەی کە خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب لەبەصرە کردیە والی. لەم کاتەدا (سوق الاهواز)ی بەزۆری فەتح کرد[٢٧].

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین کە (سوق الاهواز) بەزۆری و دوای شەڕ فەتح کراوە لەلایەن موسڵمانەکان و لەم ڕووداوەدا بۆمان دەردەکەوێت کەئەم ناوچەیە زۆرینەی کورد بووە و کوردەکان بەهەر ژمارەیەك بووبێت لەڕیزەکانی سوپای هورمزان دا جەنگاون و هورمزان لەم جەنگەی دا لەبەرامبەر سوپای موسڵمانەکان پشتی بەجەنگاوەری کورد بەستووە بەڵام لەدەرئەنجامی شەڕەکەدا هورمزان و هێزەکانی تێکشکاون، وبەدوور نازانرێت کەکورد وەکو جەنگاوەری بەشداربووی شەڕەکە لەڕیزەکانی سوپای هورمزان دا قوربانیان دابێت چونکە هەروەکو ئاماژەمان پێدا کە سوق الاهواز بەزۆری و دوای شەڕ فەتح کراوە.

**چوارەم: فەتح کردنی (جندیسابور،جندی شابور،گوندی شابور) لەلای طبری:**

جندیسابور لەساڵی ١٧ك/٦٣٨ز بەئاشتی فەتح کرا[٢٨]:

بەڵام مێژوونوس (خلیفة بن خیاط) دەڵێت: جندیسابور لەساڵی ١٨ك فەتح کراوە بەئاشتی[٢٩]. بۆ سەلماندنی کوردنشین بوونی ئەم شارە المقدسی دەڵێت: جندیسابور شارێکی ئاوەدان و کۆن بوو کوردەکان بەسەریدا زاڵبوون[٣٠]. کاتێ جندیسابور بەئاسانی و بەئاشتی فەتح کرا لەلایەن موسڵمانەکان، ئەم هەواڵەیان بەخەلیفە عومەری کوڕی خەتاب ڕاگەیاند بەڵام لەبەرامبەر ئەم ئاشتی پێدانەدا موسڵمانەکان جزیەیان لەسەر خەڵکەکە دانا و ئەمان و دڵنیاییان دا بەخەڵکەکە[٣١].

کەواتە جندیسابور بەبێ شەڕ و بەئاشتی فەتح کراوە، ئەم ناوچەیەش ناوچەیەکی کوردنشین بوو و دەکەوێتە ناو چوارچێوەی وڵاتی کوردانەوە و لەم ڕووداوەدا کەوتە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانەکان لەڕووی سیاسی و ئابووری و کارگێڕی و لایەنی ترەوە.

تەوەرەی دووەم

فەتح کردن و ڕووداوەکانی پەیوەندیدار بەکورد و وڵاتەکەی لەم ڕووداوانە لەلای الطبری

**یەکەم : فەتح کردنی نەهاوەند لەساڵی ٢١ک[٣٢]/٦٤١ز :**

نەهاوەند لەساڵی ٢١ک/ ٦٤١ز فەتح کرا[٣٣].

لەساڵی ٢١ک/٦٤١ز ئامادەکاری لەلایەن موسڵمانەکان دەستپێکرد بەمەبەستی فەتح کردنی نەهاوەند بۆ ئەم مەبەستە بەفەرمانی خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب (النعمان بن مقرن/نەعمان کوڕی مقرن)[٣٤] دیاریکرا وەك سەرکردەی سوپای موسڵمانەکان بۆ فەتح کردنی نەهاوەند[٣٥].

ئیتر بەم شێوەیە موسڵمانەکان هێزێکیان کۆکردەوە و ژمارەی جەنگاوەرەکانیان بوو بەسی هەزار جەنگاوەر کەلەنێو ئەم جەنگاوەرانەدا هاوەڵانی پێغەمبەر (د.خ)[٣٦] ی تیادابوو ئیتر ئەم هێزە کۆبوونەوە و بەسەرکردایەتی نەعمان بەرە و فەتح کردنی نەهاوەند بەڕێکەوتن[٣٧]، بەڵام لەبارەی بەرەی ساسانیەوە ئەوا پادشا یەزدەجرد نوسراوی بۆ خەڵکی جیاکان نووسی و بۆی ناردن بەتایبەتی ناوچەکانی نێوان باب و سند و خوراسان و حەلوان ئەوانیش بەدەنگ نووسراوەکەوە چوون و گەیشتنە نەهاوەند[٣٨]

سوپاو لەشکری یەزدەجرد و ساسانی لەبەرەی نەهاوەند لەخەڵکی زۆر ناوچەی ژێردەسەڵاتی ساسانیەکانی ئەو کاتە پێکهاتبوون بەناوچە کوردنشینەکانیشەوە ئەوەتا الطبری لەم بارەیەوە دەڵێت: خەڵکەکە بەپیر نووسراوی یەزدەجردی پادشاوە هاتن و

کۆبوونەوە و هاتنە نەهاوەند، واتە خەڵکەکە کۆبونەوە لەنێوان خوراسان بۆ حەلوان، و لە نێوان باب بۆ حەلوان، و لە نێوان سجستان بۆ حەلوان و هەروەها خەڵکی فارس و الفهلوج وخەڵکی چیاکان لەنێوان باب تا حەلوان کۆبوونەوە و ژمارەیان بوو بە سی هەزار جەنگاوەر و لەنێوان خوراسان بۆ حەلوان (٦٠) هەزار جەنگاوەر کۆبونەوە ولەنێوان سجستان بۆ فارس و حەلوان ٦٠هەزار جەنگاوەر کۆبونەوە ئیتر بەم شێوەیەئەم ژمارە زۆرە خەڵکە جەنگاوەرە عەجەمە کۆبونەوە و هاتنە نەهاوەند[٣٩].

هەر لەبارەی کۆبونەوەی بەرەی یەزدەجردی ساسانی لەنەهاوەند (الدینوری) دەڵێت: یەزدەجرد نووسراوی بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتەکەی نارد بەمەبەستی سەرباز کۆکردنەوە وخەڵکی پادشانشینەکەشی لەهەموو لایەکەوە بەپیر بانگەوازەکەیەوە هاتن بۆئەم مەبەستە خەڵکی ناوچەکانی (قومس[٤٠] و طبرستان و جرجان و دنباوند و الری و أصبهان و همذان و الماهین (ماە الکوفەوماە البصرە) و خەڵکێکی زۆر لەم ناوچانە هاتن و بۆ یەزدەجرد کۆبونەوە ومردان شای کوڕی هرمز سەرکردایەتی ئەم خەڵکە،جەنگاوەرانەی کرد و بەرە و نەهاوەندی ناردن[٤١].

بەم شێوەیە لەدەرئەنجامی ڕوودانی شەڕی نەهاوەند موسڵمانەکان سەرکەوتن و عەجەمەکان و بەرەی ساسانی لەم شەڕەدا دۆڕان و ژمارەیەکی یەکجار زۆر لەریزەکانیان کوژران[٤٢].

موسڵمانەکان لەدوای فەتح کردنی نەهاوەند دا دەستیان بەسەرغەنائمێکی زۆردا گرت بەلاَم (النعمان کوڕی مقرن) [٤٣] ی سەرکردەی سوپای موسڵمانەکان لەم جەنگەدا کوژرا[٤٤].

بۆیەجەنگی نەهاوەند بەدوا جەنگە یەکلایی کەرەوەکەی موسڵمانەکان دژ بە ساسانیەکان دەژمێردرێت، چونکە ئەم جەنگە گرنگیەکی گەورەی هەبوو بۆ

موسڵمانەکان، بەلای موسڵمانەکانەوە بە فتح الفتوح ( فەتحی فەتحەکان) دەناسرێت، بەڵام بەلای ساسانیەکانەوە ئەمە جەنگێکی کارەسات باوی بوو چونکە ساسانیەکان لەم جەنگەدا بەشێوەیەکی زۆر خراپ تێکشکان(٤٥).

لەئەنجامی هەڵسەنگاندمان بۆ شەڕی نەهاوەندی ساڵی ٢١ک/٦٤١ز و پەیوەندیدار بوونی ئەم شەڕە لەبارەی کورد و وڵاتەکەیەوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە نەهاوەند وەك ناوچەیەکی، شارێکی، کوردنشین دەبێتە گۆڕەپانی ڕاستەقینەی شەڕەکە ئەمە جگەلەوەی کە بەرەی جەنگاوەرانی ساسانی بەعەجەم ناویان هاتووە کە بێگومان کوردیش لەنێو ئەم ناولێنانەدا هەبوونە، جگە لەمانەش ناوچەکانی چیاکان کە بێگومان بەشی ڕۆژئاوای چیاکان کوردنشین بوو لەگەڵ حەلوان دا لەم دەقانەی کە ئاماژەمان پێدا ناویان دێت بەمەش دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە ئەم ناوچە کوردنشینانە وەك ناوچەکانی تری ناو چوارچێوەی دەسەڵاتداریتی ساسانی ئەو کاتە جەنگاوەری لێ ئامادەکراوە لە بەرژەوەندی یەزدەجرد، کەواتە گومانی تێدا نیە کە کۆمەڵە جەنگاوەرێکی دیاری کورد لە ریزەکانی بەرەی یەزدەجرد دا جەنگابن بۆ ڕووبەڕووبونەوەی سوپای موسڵمانەکان، بەلام لە دەرەنجامی شەڕەکەدا شکاون وموسڵمانەکان سەرکەوتوون و بە دوور نازانرێت کە ژمارەیەکی دیار لەجەنگاوەری کوردی ناوچەکوردنشینەکان لەم ڕووبەڕووبونەوەیەدا کوژرابن و قوربانیان دابێت هەروەك چۆن لەموسڵمانەکان (عەرەب) و فارسیش کوژراو هەبووە. لەدەرئەنجامی شەڕەکەدا ناوچەی نەهاوەندی کوردنشین کەوتە ژێر دەسەڵاتداریەتێکی تازەو فەتح کرا و لەم شەڕەدا کورد زیانی لێکەوت چونکە هەم لەلایەن ساسانیەکان بەهەر پاڵنەرێك بووبێت بەکارهات، بەمەبەستی پاراستن و لە دەستنەدانی بەرژەوەندیەکانیان، و لەهەمان کاتیش دا کورد قوربانیشی دا لە کاتی شەڕەکەدا.

**دووەم: فەتح کردنی هەمەذان لەساڵی ٢٢ك[٤٦]/ ٦٤٣ز[٤٧] لەلای طبري:**

دوای ئەوەی کە نەهاوەند لەلایەن موسڵمانەکانەوە فەتح کرا موسڵمانەکان ئەو کات گەیشتنە هەمەژان و بە ئاشتی و پێکهاتن دەستیان بەسەر هەمەژان داگرت بەڵام ئەو کات هێزی موسڵمانەکان لەوێدا کشانەوە، دواتر بەهۆی ئەم کشانەوەیە ئاشتی بەستنەکە هەڵوەشایەوە وجارێکی تر هەمەذان فەتح دەکرێت، بۆیە خەلیفە عومەر نووسراوێکی نارد بۆ (نعیم بن مقرن/نەعیم کوڕی مقرن)[٤٨] و فەرمانی پێدا تابەرەو هەمەذان بڕوات و فەتحی بکات.

ئیتر بەم شێوەیە نعیم کوڕی مقرن بەهێزێکەوە دەرچوو تا لە (پنیە العسل) دابەزی ،دواتر نەعیم لە (پنیە) جوڵا و هاتە خوارەوە تا لەشاری هەمەذان دابەزی ولەئەنجام دا دەستی بەسەر سەرجەم یاخود تەواوی وڵاتی هەمەذان داگرت، و کاتێك کە خەڵکی شارەکە ئەم بارەیان دیت داوای ئاشتیان کرد[٤٩]، بەڵام (خلیفة بن خیاط) لەبارەی فەتح کردنی هەمەذان دەڵێت: موغەیەرە کوڕی شوعبە لەو کاتەی کە والی بوو لەکوفە کەسایەتی (جریر بن عبدالله/جەریر کوڕی عەبدوڵڵا)[٥٠]ی نارد و هەمەذانی فەتح کرد))[٥١]. بەڵام البلاذري دەڵێت: ((هەمەذان لەساڵی٢٣ك/٦٤٤ز فەتح کراوە لەلایەن عەبدوڵڵا ئەلبەجلی ئەم کەسایەتیەش لەلایەن موغەیەرەوە ڕەوانە کرا بۆ فەتح کردنی هەمەذان دوای ئەنجام دانی شەڕێك لەگەڵ خەڵکەکەی بەزۆری فەتحی کرد))[٥٢].

لەئەنجامی هەڵسەنگاندنمان بۆ ئەم ڕووداوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی ئەگەرچی لەسەرەتادا شارەکە هێرشی کرابێتەسەر، بەڵام لەدەرئەنجام دا بەئاشتی فەتح کراوە وخەڵکەکەی بەهەر پاڵنەرێك بووبێت داوای ئاشتیان کردوە، موسڵمانەکانیش بەپیر داوای خەڵکەکە چوونە و بەئاشتی شارەکەیان فەتح کردوە ئەمەش لەبەر ئەوەی هەمەذان سوپای ساسانی لێنەبووە و سوپای ساسانی پاش شەڕی نەهاوەند شپرزە و

کەنەفت بوو بۆیە توانای بەرگری کردنی نەمابوو ئیتر بەم چەشنە ئەم شارە کوردنشینە بەئاشتی کەوتۆتە ژێردەسەڵاتی موسڵمانەکان و سەردەمێکی تازە لەمێژووی ئەم شارەدا دەستی پێکردووە.

**سێ یەم: فەتح کردنی (فسا)[٥٣] و (دارابجرد)[٥٤] لەساڵی ٢٣ک/٦٤٤ز[٥٥] لەلای طبري:**

موسڵمانەکان خۆیان ئامادەکرد بۆ فەتح کردنی فساو دارابجرد بۆ ئەم مەبەستە موسڵمانەکان بەسەرکردایەتی (ساریە بن زنیم/ساریە کوڕی زنیم[٥٦]) هێزێکیان ئامادەکرد بەمەبەستی فەتح کردنی فسا و دارابجرد، ئیتر ئەم هێزە پێشڕەوی کرد تاوەکو ئابلۆقەی هێزەکانی ساسانیان دا لەبەرامبەردا هێزەکانی بەرەی یەزدەجرد و ساسانی لەگەڵ کوردەکانی فارس کۆبونەوە بەمەبەستی بەرەنگاربونەوەی هێزەکانی موسڵمانان،بەلاَم لەدەرئەنجامی ڕوودانی شەڕێك لەنێوان هەردوولادا موسڵمانەکان سەرکەوتن و بەرەی ساسانی شکان و موسڵمانەکان هەواڵی ئەم فەتحەیان بۆ خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب نووسی و پێڕاگەیاند، هەرلەدەرئەنجامی شەڕەکەدا موسڵمانەکان دەستیان بەسەر غەنیمەیەکی زۆرداگرت ئیتر ئەم غەنائیمانەیان لەگەڵ هەواڵی فەتح کردنەکە بۆ خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب نارد[٥٧].

کەواتە لەئەنجامی فەتح کردنی فساودارابجرد دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کەژمارەیەکی دیاروبەرچاو لەکوردەکانی وولاتی فارس لەڕیزەکانی سوپای ساسانی دا جەنگاون لەم ڕووداوەدا دژبەهەڵمەتەکانی سوپای موسڵمانان ئەگەرچی ئەنجامی شەڕەکەش لەبەرژەوەندی سوپای ئیسلام و موسڵمانان کۆتایی پێهاتووە بۆیە گریمانەی ئەوە دەکرێت و بەدوور نازانرێت کە ژمارەیەکی بەرچاو لەکوردەکانی فارس لەئەنجامی ئەم شەڕەدا بووبنە قوربانی بەبێ ئەوەی کەئەم بەشداریەی کوردەکان لەبەرژەوەندی و قازانجی کوردەکان بووبێت.

**چوارەم: ڕوداوی بیروژ لە ئەهواز لەساڵی ٢٣ك/٦٤٤ز:**

لەساڵی ٢٣ك/٦٤٤ز کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر لەکوردەکان وخەڵکی تر لەناوچەی (بیروژ)(ناوچەیەکی پیرۆزی زەردەشتیەکان بوو) کۆبونەوە[٥٨]، ئیتر بەم چەشنە کۆمەڵێ جەنگاوەری کوردەکان و هەندێ خەڵکی فارس یش هاتنە پاڵیان و کۆبونەوەی ئەم خەڵکانە بەشێوەیەکی گشتی وەك یاخی بوون و دژایەتی کردنی دەسەلاتی موسڵمانەکان لەقەڵەم درا، و ئەم خەڵکانە بەهەر پاڵنەر و هۆکارێك بوو بێت دژ بەدەسەلاتی موسڵمانەکان کۆبونەوە، دواتر ئەبوموسای ئەشعەری بەسەرکردایەتی هێزێکی موسڵمانان ڕووبەڕویان بۆوە لە خاکی (بیروژ) لەنزیك ڕووباری تیری ئیتر لەئەنجامی ڕوودانی شەڕێك لەنێوان هەردوولادا موسڵمانەکان سەرکەوتن و (بەرەی کوردەکان و هاوکارەکانیان) شکان دواتر هەواڵی فەتح و پێنج یەك لەغەنیمە بۆ خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب نێردرا[٥٩].

کەواتە لەئەنجامی شیکردنەوەمان بۆئەم شالاو ناردنەی موسڵمانەکان بۆسەر کوردەکان کە إبن کثیر ناوی دەنێت (غزوة الأکراد)[٦٠] دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە کوردەکان لەم ڕووداوەدا بەلای دەسەلاتدارانی موسڵمانانەوە بەکەسانی،خەڵکانی،یاخیگەرونەیاری ڕاستەقینە سەیرکراون بەجۆرێك کە ڕووبەڕووبونەوە و لەناوبردنیان بەپێویست زانراوە بەلای موسڵمانەکانەوە، جگەلەمەش هەر لەدەرئەنجامی شیکردنەوەمان بۆئەم دەقەی الطبری دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کەژمارەیەکی زۆر لەکوردەکان دووچاری زیانی گیانی و ماڵی جەرگبڕ بونەتەوە بەهۆی ئەوەی کە دووچاری پەلاماردان و هێرش کردنە سەر هاتوون بۆیە کوردەکان دووچاری زیانی گیانی و زیانی تری سەخت هاتوون چونکە لەم ڕووداوەدا کوردەکان شەڕیان

ـەجیاتی یـەزدەجرد و ئیمپراتۆریـەتی ساسـانی نـەكردووە بـەڵكو بـە تـەنها شـالاویان كراوەتە سەر و كوشتارو زیانی گیانی و ماددیان زۆریان بەركەوتوە.

**پێنجەم: ڕووداوی (سلمة بن قيس الأشجعي/سەلمە كوڕی قـەیس ئەلئەشـجەعی)[٦١] و كوردەكان لەساڵی ٢٣ك/٦٤٤ز[٦٢] لەلای الطبری:**

لەبارەی ئەم ڕووداوە الطبری دەڵێت: ((خەلیفـە عومـەری كـوڕی خـەتاب سـوپایەكی ئامادە و كۆكردەوە و سـەركردایەتی كردنـی ئـەم سـوپایەی بـە سـەلمە سـپارد و داوای لێكرد كە جەنگی هاوبەش پەیداكەرەكان بكـات بـەلاّم لەهـەمان كـات دا خەلیفـە عومـەر ئامۆژگـاری جـەنگاوەرەكانی كـرد و ووتـی: ((ئەگـەر جـەنگتان كـردن، زیـادە ڕەوی مەكەن،غەدرمەكەن، جەستەو لاشەی كوژراوەكانیان مەشـێوێنن ومنـداڵی بـچوك و تـازە لەدایك بوو مەكوژن))[٦٣].

دواتـر ئـەم سـوپایە لـەكاتی بەرێكـەوتن و ڕۆیـشتنی دا بـەكوردەكان گەیـشت پـاش ئەوەی كە كوردەكان ڕەتی ئیسلام بوون و دانی جزیەیان بەموسڵمانەكان كـردەوە ئـەوا لەم كاتەدا شەڕ لەنێوان هەردوولادا ڕوویدا و لەدەرئەنجامی شەڕەكەدا هێزەكانی سـەلمە و موسـڵمانەكان سـەركەوتن و كوردەكـان شـكان، هـەر لەدەرئـەنجامی ئـەم شـەڕەدا ژمارەیەكی زۆر جەنگاوەری كوردەكان كوژران، و ژمارەیـەك دیلـی ژن و منـداڵ دەسـتی بەسـەراگیرا دواتـر سـەلمە نێردراوێكـی پیـاوێكی نـارد و هـەواڵی فـەتح و غـەنائمی بـۆ خەلیفە عومەری كوڕی خەتاب برد[٦٤].

كەواتە لەم ڕووداوەوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی كە كوردەكان دووچـاری هێـرش و پەلاماردان هـاتوون چـونكە بـەلای ئـەم هێـزە پـەلاماردەرەی موسـڵمانەكان كوردەكـان هاوبـەش پەیداكەربوونـە و بـە مەرجـەكانیان ڕازی نەبوونـە، دوای ئـەوەی كـە بەمەرجەكانیشیان ڕازی نەبوونە كەوتوونەتە بەرەی نەیار و دوژمنی ئـەم سـوپایە بۆیـە

لە دەرئەنجامی ڕوودانی شەڕێك دا کوردەکان زەرەر و زیانی گەورەی گیانی وماڵیـان لێ دەکەوێت و بەبێ ئەوەی کە ژمارە و قەبارەی زیانەکان بزانرێت ،ئەمە جگەلـەوەی کـە شوێنە جوگرافیەکەش ڕوون نیە کە جەنگەکەی تیادا ڕوودادوە.

شەشەم: ڕووداوی نەهرەوان لە ساڵی ٣٨ك/٦٥٨ز:

ڕووداوی نەهرەوان ئەم ڕووداوە بوو کـە لـەنێوان خەلیفـە عـەلی کـوڕی ئـەبو طالـب و خەوارج[٦٥] ڕووی دا لەساڵی ٣٨ك/٦٥٨ز[٦٦].

ئیتر بـەم چەشـنە خەوارجـەکان لـە (حـروراء)[٦٧]، لەدەوروبـەری کوفـە کۆبونـەوە و لەڕۆژی نەهرەوان دا ئەمانە ژمارەیان دوازدە هەزار جەنگاوەر دەبوو[٦٨].

خەوارج بەناوبـژی کردنەکـەی نێـوان (معاویـە بـن ابـو سـفیان/موعاویـە کـوڕی ئـەبو سوفیان) و عەلی کوڕی ئەبو طالب (خوای لێ ڕازی بێت) ڕازی نەبوون و پێیان وابـوو کـە ئەبو موسای ئەشعەری کە لەلایەن خەلیفە (عـەلی) (خـوای لێ ڕازی بێـت) نێردرابـوو بـۆ ناوبژی کردن حوکمی بەکتابی خودا (قوڕئان) نەکردووە، ئیتر لـەم کاتـەدا خەوارجـەکان لە خەلیفە عەلی دەرچوون و ووتیان (لاحکم إلالله) واتـە حـوکم تـەنها بـۆ خودایـە، ئـیتر بەم شێوەیە خەوارجەکان دەرچوون و لەنەهرەوان کۆبونەوە[٦٩].

ئیتر ئەوەبوو جـەنگێکی توندوتیـژ لـەنێوان عـەلی کـوڕی ئـەبو طالـب و خەوارجـەکان ڕوویدا لەنەهرەوان لەساڵی ٣٨ك/٦٥٨ز، کە لە دەرئەنجامی ئەم جەنگەدا خەلیفە عەلی و لایەنگرانی سەرکەوتن و خەوارجەکانیش تێکشکان[٧٠].

لەدەرئـەنجامی شـەڕەکەدا (عبدللـە بـن وهـب الراسـبی/عەبـدوڵلا کـوڕی وەهـەب ئەلراسـبی)[٧١] سـەرکردەی خـەوارج و زۆرینـەی هاوەڵانیـشی کـوژران[٧٢] و لەهاوەڵانی،جەنگاوەرانی،خەلیفـە عـەلیش ژمارەیـەکی زۆر کـەم کـوژران کـە نزیکـەی ١٢یاخود ١٣جەنگاوەر دەبوون[٧٣].

کەواتە لەڕووداوی نەهرەوانی ساڵی ٣٨ك/٦٥٨ز، نەهرەوان وەکو ناوچەیەکی کوردنشین بۆتە گۆڕەپانی ڕووداو و شەڕێکی توندو تیژ، کە تیایدا ڕووداو و ناوەڕۆك و ـەرئەنجامە جۆراو جۆرەکانی شەڕەکە لەسەر خاکی کوردان ڕووی داوە ،و ـەشێوەیەکی گشتی شەڕەکە هیچ دەرئەنجامێکی ڕوون و ئاشکرای بەسەرخەڵکی کوردەوە نەبوو،و ڕەنگە بەشێوەیەك لەشێوەکان بوونی شەڕێکی ئاوا گەورە ـەناوچەیەکی کوردنشین، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بووبێ ڕەنگە بووبێتە هۆی ـروست کردنی پشێوی و نائارامی لە ناوچەکەدا.

لەو کاتەی کە خەلیفە عەلی ، خەڵکی نەهرەوانی کوشت، زۆر خەڵك دژ بەکوشتنی خەوارج و خەڵکی نەهرەوان بوون، وخەڵکانێکی زۆر ویستیان خەراج نەدەن هەر بۆ ئەم مەبەستە خەڵکی ولأتەکە، شارۆچکەکە، مەبەست لەخاکی ئەهوازە، و(العلوج)[٧٤] وئەوانەی کە ویستیان خەراج نەدەن و هەوادارەکانیان لە کوردە سادەکان، ئەمانە هەموویان لەبەرەی دژ بە دەسەلأتی خەلیفە عەلی بوونە لەساڵی ٣٨ك و وویستویانە خەراج نەدەن.دواتر هێزەکانی خەلیفە ڕووبەڕووی ئەم خەڵکە نەیارانەی کە ویستیان خەراج نەدەن لەعلوج و کوردەکان بوونەوە، ئیتر لەدەرئەنجامی شەڕێکدا لەنێوان هەردوولادا هێزەکانی خەلیفە عەلی سەرکەوتن و نەیارەکانیشیان تێکشکان وهەر لەم شەڕەدا هێزەکانی خەلیفەعەلی نزیکەی (٣٠٠)کەسیان لە علوج و کوردەکان کوشت، و پاش سەرکەوتنی بەرەی خەلیفە عەلی لەم ڕووبەڕوبونەوەیەدا (معقل بن قیس/مەعقەل کوڕی ئەلقەیس) لەخاکی ئەهواز دانیشت و بۆ خەلیفە عەلی نووسی و هەواڵی فەتحی پێدا[٧٥].

کەواتە لەئەنجامی شیکردنەوەمان بۆ ئەم ڕووداوە بۆمان دەردەکەوێت کە کوردەکان دووچاری زەرەرو زیانی گیانی و جەرگبڕ بوونەتەوە و دووچاری کوشتن هاتوون لەگەڵ

علوجەکان، بەو پێ یەی کە خەراجیان نەداوە (ویستویانە خەراج) نەدەن، و کەوتونەتە بەرەی نەیار و دژی خەلیفە عەلی یەوە و لەدەرئەنجامیشدا کوردەکان هاوشان لەگەڵ علوجەکان دا دووچاری زیانێکی مرۆیی گەورە هاتن جگە لەمەش ئەم ڕووداوە ئەو ڕاستیەی دووپات کردەوە کە کورد بەهەر ڕێژەو ژمارەیەك بووبێت لەناوچەی ئەهواز دا ژیاون.

لەم بارەیەوە طبري دەڵێت: لەو کاتەی کە خەڵکی چیاکان ( بێگومان بەشی ڕوژئاوای چیاکان کوردنشین بوون)، پەیمانیان هەڵوەشاندەوە، وخەڵکی خەراج دەریش ئارەزووی شکان و نەدانی خەراجیان کرد و (سهل کوڕی حنیف/سەهل کوڕی حونەیف ی والی خەلیفە عەلیان لەفارس وەدەرنا، ئیتر ئەم ڕووداوە کاردانەوەی خراپی لەلای خەلیفە دروست کرد بۆ ئەم مەبەستە خەلیفە عەلی زیادی وەك والی بۆ وڵاتی فارس نارد، وەك سەرکردەی هێزێك ( کۆمەڵێك جەنگاوەر) بەڵام لەدەرئەنجام دا خەڵکی فارس لەم هەڵوێستەیان پەشیمان بونەوە و خەراجیان دا[٧٦].

کەواتە لەئەنجامی شیکردنەوەمان بۆئەم دەقە بۆمان دەردەکەوێت کە خەڵکی ناوچە کوردنشینەکانیش کە (لەبەشی ڕۆژئاوای چیاکان) دەژیان لەنێو ئەم خەڵکانەدا بوون کە ویستویانە خەراج نەدەنە کاربەدەستانی خەلیفە عەلی، لەناوچەکانیان دا، بەڵام لەئەنجام دا بەهۆی ناردنی هێزێك بەسەرکردایەتی زیاد لەلایەن خەلیفە عەلی، ناوچە یاخی بووەکان وخەراج نەدەرەکان لەنێویشیان دا ناوچە کوردنشینەکان بەهێز دەگەڕێنرێنەوە ژێر دەسەڵاتی خەلیفە عەلی(خوای لێ ڕازی بێت).

### تەوەرەی سێ یەم

### فەتح کردن و ڕووداوەکانی پەیوەندیدار بە کورد و وولاتەکەی لەم ڕووداوانە

### یەکەم: فەتح کردن و ڕوداوەکانی هەرێمی جەزیرە لەلای طبري لەساڵی ١٧-٤١ك/٦٣٨-٦٦٢ز:

### جەزیرە لە ساڵی ١٧ك[٧٧]/٦٣٨ك لەلایەن موسڵمانەکان فەتح کرا[٧٨]:

خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب لەساڵی ١٧ك نووسراوێکی بۆ (سعد بن مالك/سەعد کوڕی مالك) نووسی و فەرمانی پێدا هێزێك بۆ جەزیرە بنێرێت، و بێتە (الرقە)، و عبدلله بن عتبان/عەبدوڵلا کوڕی عوتبان) بۆ نصیبین بنێرێت و (ولید بن العقبە/وەلید کوڕی ئەلعوقبە)ش بۆ سەر عەرەبی جەزیرە لە (ربیعه وتنوخ) بنێرێت، وفەرمانی پێدا کە (عیاض بن غنم/عەیاز کوڕی غەنەم)[٧٩] یش بنێرێت و ئەگەر جەنگ ڕووی دا ئەوا کاروباریان، سەرکردایەتی کردنیان هەمووی بخرێتە ژێر دەسەڵاتی عەیاز،خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب نووسراوێکی بۆ سەعد کوڕی ئەبی وەقاس نووسی و لەم نووسراوەدا ئاماژەی بەوەدا کە: خودای گەورە شام و عێراقی بۆ موسڵمانەکان فەتح کردو تۆش جەنگاوەرەکانی خۆت بۆ جەزیرە بنێرە و یەکێ لەم سیانە بکە بە سەرکردەیان (خالد بن عرفطة/خالید کوڕی عەرفتە) یان(هاشم بن عتبە/هاشم کوڕی عوتبە) یان عەیاز کوڕی غەنەم)[٨٠].

کاتێ کە ئەم نووسراوەی خەلیفە عومەر بەسەعد گەیشت ئیتر سەعد کوڕی ئەبی وەقاسیش عەیازی هەڵبژارد و کردی بەسەرکردەی سوپایەك و بەرەو جەزیرەی نارد ئیتر بەم شێوەیە عەیاز بەسەرکردایەتی کردنی سوپایەك دەرچوو بەرەو جەزیرە بەمەبەستی فەتح کردنی[٨١].

ئیتر بەو شێوەیە عەیاز بەخۆی و سەربازەکانیەوە (جەنگاوەرەکانیەوە) لە (الرها) دابەزی و ئاشتی و پێکهاتنی لەگەڵ خەڵکەکەی بەست لەبەرامبەر وەرگرتنی جزیە لەخەڵکەکەی ئەم شارەی فەتح کرد دوای ئەوە شاری حران یش بەهەمان شێوەی (الرها) بەئاشتی و لەبەرامبەر وەرگرتنی جزیە لە خەڵکەکەی ئەم شارە فەتح کرا، و (عەیاز کوڕی غەنەم) (ئەبو موسای ئەشعەری) بەرەو (نصیبین) ناردو فەتحی کرد و (عمر بن سەعد/عومەر کوڕی سەعد) بەرەو (رأس العین/الخابور) نارد و فەتحی کرد،عەیاز کوڕی غەنەم یش بەخۆی و جەنگاوەرەکانیەوە بەرەو (دارا)چوو و لەوێد نیشتەجێ بووو فەتحی کرد[٨٢].

(البلاذري) لەبارەی فەتح کردنی جەزیرەوە دەڵێت: جەزیرە هەمووی لەلایەن عەیار فەتح کرا ئەمەش دوای ئەوەی کە ئەبو عبیدە مرد لەم کاتەدا خەلیفە عومەری ئەرکی فەتح کردنی جەزیرەی بە عەیاز سپارد[٨٣].

بەڵام (البلاذري) هەر لەبارەی فەتح کردنی جەزیرەوە دەڵێت: عەیاز کوڕی غەنەم شارەکانی (الرقە) و (حران) و (الرها)و (نصیبین) و (میافارقین) و (قرقیسیا) و گوندەکانی فورات و شارەکانی بە ئاشتی فەتح کرد وخاکەکەشیانی، واتە دەوروبەری شارەکان (ناوچە دوورە دەستەکان) بەزۆری فەتح کرا[٨٤].

یەعقوبیش دەڵێت: عەیاز کوڕی غەنەم شارەکانی (الرقە و سروج و نصیبین) و سەرجەم شارەکانی جەزیرەی بە ئاشتی و پێکهاتن فەتح کرد[٨٥].

کەواتە هەرێمی جەزیرە زۆر بەئاسانی و بەشی هەرە زۆری بە ئاشتی فەتح کرا هەروەك لەم بارەیەوە طبري بەڕوونی گوزارشت لەم فەتح کردنە دەکات و دەنووسێت: (کاروباری جەزیرە لە هەموو وڵاتەکان ئاسانتر بوو (واتە بەئاسانی کەوتە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانەکان) وجەزیرە لەهەموو هەرێمەکانی تر، ناوچەکانی تر فەتح کردنەکەی ئاسانتر بوو)[٨٦].

پاش ئەوەی کەجەزیرە فەتح کرا لەلایەن موسڵمانەکانەوە خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب (حبیب بن مسلمه/حەبیب کوڕی موسلیمە)(٨٧)ی دانا بەسەر هەڵسوڕاندنی کاروباری عەجەمی جەزیرە و جەنگیان، و کەسایەتی (وەلید کوڕی عوقبە)(٨٨)ی دانا بەسەر عەرەبی جەزیرەوە، ئەمانە هەردووکیان هەڵسان بەڕاپەڕاندنی ئەرکەکانیان لەجەزیرە و لەوێ نیشتەجێ بوون(٨٩).

کەواتە لە ژێر ڕۆشنایی ئەم دەقەی (الطبری)ەوە دەگەینە ئەو هەڵسەنگاندنەی کەمەبەست لەعەجەمی جەزیرە (بەشی هەرە زۆری کوردەکانن) کەلێرەدا کاروباریان لەڕووی کارگێڕی و جەنگی و لایەنی تر بە حەبیب دەسپێردرێت چونکە لەشارەکانی جەزیرەدا لەلایەك ژمارەیەکی زۆر کورد دەژیان، لەلایەکی تریشەوە کۆمەڵەشارێکی زۆر بەتەواوی کوردنشین بوون، هەروەك چۆن لەم دەقەدا کە بە عەجەمی جەزیرە ناویان دێت بەجیاواز لە عەرەبی جەزیرە کەوادیارە مەبەستی موسڵمانە هاتووەکانە کە لەگەڵ فەتح لێی نیشتەجێبوون، بەم شێوەیە لەم ڕووداوەوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی بەشێوەیەکی گشتی سەرجەم شارەکانی جەزیرە بەئاشتی و ڕێکەوتن فەتح کراوە، ڕەنگە هەندێ ناوچەی دوورە دەست و چۆڵەوانی هەبووبێ کە بەهێز و بەزۆری فەتح کرابێ، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی سەرجەم شارەکانی جەزیرە بە ئاشتی و پێکهاتن و زۆر بەئاسانی لە بەرامبەر وەرگرتنی جزیە لە خەڵکەکەی فەتح کراوە، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نزیکی بەشێك لەناوچەکانی جەزیرە لەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیسلامی، و بەدەست هێنانی زنجیرەیەك سەرکەوتنی یەك لەدوای یەك لەلایەن سوپای موسڵمانانەوە دژ بە ئیمپراتۆریەتی ساسانی کە ئەم زنجیرە سەرکەوتنانەش گوڕوتین و هێزی زیاتری بەموسڵمانەکان بەخشی بۆبەدیهێنانی سەرکەوتنی تر، جگە لەمانەش هەرێمی جەزیرە دوور بووە لە مەڵبەندی دەسەڵاتی ساسانیەکان و دەسەڵاتدارانی

ساسانی لە جەزیرەدا لە سەروبەندی فتوحاتەکاندا ڕۆڵێکی وایان نەبینیوە بۆیە خەڵکی جەزیرە کە دواتر بە هەرێمی جەزیرە ناسرا، لەکاتی هەڵمەتەکانی فتوحاتی ئیسلامی ناچارنەکراون، کە شەڕ لەدژی موسڵمانەکان بکەن و ڕووبەڕوویان ببنەوە، ئەوانەی کە شارەکانیان ئاشتیانە فەتح کراون وناوچە دوورە دەستەکان شەڕی لێکراوە سەلمێنەری ئەوەیە، کە ئەم ناوچانە بەئاسانی پەیامی ئیسلامیان نەگەیشتۆتێ و لەوێ سەربزێوی و بەرگری کردن ئاسانتر بووە.

ئیتر لەئەنجامی فەتح کردنی جەزیرەدا ناوچەیەکی بەرفراوان کە بریتی بوو لە کۆمەڵێ شارو ئاوەدانی و خاکی زۆر کەوتە ژێر دەسەلاتی موسڵمانەکان، و لەنێو شارو ئاوەدانیە فەتح کراوەکانی جەزیرەدا کۆمەڵە شارو ناوچەیەکی فراوانی کوردنشین کەوتنە ژێر دەسەلات و فەرمانڕەوایی کردنی موسڵمانەکان و لێرە بەدواوە سەردەمێکی تازە لە مێژووی جەزیرەو شارە کوردنشینەکانی و خەڵکەکەی دەستی پێکرد و ئەم ناوچانە و خەڵکەکەیان چوونە نێو بارودۆخێکی تازەی سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی و کەلتوری ئیسلامەوە.

**دووەم: فەتح کردنی ئازەربیجان لەساڵی ٢٢ك/ ٦٤٣ز:**

**وڵاتی ئازەربیجان لەساڵی ٢٢ك/٦٤٣ز فەتح کرا[٩٠]:**

(بکیر بن عبدالله/بەکیر کوڕی عەبدوڵڵا) بەرەو ئازەربیجان نێردرا بوو بەمەبەستی فەتح کردنی دواتر (سماك بن خرشە/سەماك کوڕی خەرشە)[٩١] ش بەسەرکردایەتی کردنی هێزێك بەرەو بەکیر ڕۆیشت لەئازەربیجان بەمەبەستی یارمەتی دانی ئەو،بەکیر بەرەو پێشەوە چوو ،پێشڕەوی کرد بەرەو ناوەوەی ئازەربیجان تا لەئەنجام دا ڕووبەڕوی (اسفندیاذ بن الفخرزاذ) بۆوە لە(واج روذ)، ئەمەش یەکەم ڕووبەڕوبونەوەی هێزێکی موسڵمانان بوو لەناو خاکی ئازەربیجان کە لەدەرئەنجامی شەڕەکەدا سوپای

ـسفندیاذ تێکشکاو بکیر (اسفندیاذی) بەدیل گرت ئیتر دوای ئەم ڕووداوە بکیر بەئاشـتـی ـەگەڵ خەڵکی ئازەربیجان ڕێکەوت[٩٢].

لەدوای ئەم ڕووداوە ولاتی ئازەربیجـان کەوتـە ژێـر دەسـەلاتی بکـیر، دواتـر سـەماك ـەکۆمەکی بەکیر هات و ئەو ناوچەیەی کە لـەدوای ئازەربیجانـەوە دێـت فـەتحی کـرد، و هەندێ ناوچەی تری دوای ئازەربیجان لەلایەن(عتبەبن فرقد/عوتبـە کـوڕی فەرقـەد)ەوە فەتح کرا، بەلام لەدواتردا بەپێ فەرمانی خەلیفە عومەری کـوڕی خـەتاب(خـوای لێ ڕازی بێت) ئازەربیجـان هـەمووی کۆکرایـەوەو بـەڕێوەبردن و هەڵسوڕاندنی کاروبـاری هـەموو ئازەربیجان بە عوتبە [٩٣] سپێردرا[٩٤].

دوای ئەوەی کە عتبە (بهرام بن الفرخـزاذي) تێکـشکاند دوای ئـەنجام دانـی شـەڕێك، پاشان ئاشتی و ڕێکەوتن بەستراو ئازەربیجان بەئاشتی گەڕایەوە بۆ موسڵمانان و بـەکیر و عوتبەش ئەم هەواڵەیان بۆ خەلیفە عومەر نووسی و پێنج یەکیان بۆ نارد[٩٥].

عوتبە کـوڕی فەرقـەد نووسـراوێکی نووسـی لـەنێوان خـۆی و خـەڵکی ئازەربیجـان کەئەم نووسراوە لەشێوەی پەیمان نامەیەك بوو لەنێوان دەسـەلاتی ئیـسلامی و خـەڵکی ئازەربیجان ئەمەش دەقی نووسراوەکەیە ((بەناوی خـودای گـەورەو میهرەبـان، ئەمەیـە ئەو نووسراوەی کـە عوتبـە کـوڕی فەرقـەد والی، کاربەدەسـتی خەلیفـە عومـەری کـوڕی خـەتاب دای بـە خـەڵکی ئازەربیجـان، دەشـتی، چـیاکانی، ناوچـە دوورە دەسـتەکانی، خەڵکەکـەی بەگـشتی،با دڵنیـا بـن لـەخۆیان و لەسـامانیان و لـە خـەڵکیان و ئاینیـان ، بەجۆرێك کەلە بەرامبەردا جزیە بدەن بـەپـێ ی توانایـان جزیـەش لەسـەر کەسـانی تـازە پێگەیشتوو و لاو و ژن و نەخۆش کە هیچ شتێکی لەدنیادا نیە، داناندرێت و جزیە لەسەر خودا پەرست، مەبەست لە پیاوانی ئاینی غەیرە ئیسلامە ئەمانـە جزیـەیان لەسـەر نیـە ئەمە بۆ ئەوان وئەوەی کە لەگەڵ ئەوانیش نیشتەجێیە))[٩٦].

بەڵام البلاذري لەبارەی فەتح کردنی ئازەربیجان ڕایەکی جیاواز، زانیاریەکی جیاو لەوەی کە لەپێشتر باسمان کرد دەهێنێت و دەنووسێت: موغەیەرە کوڕی شوعـ بەهۆی ئەوەی کە ببووە والی خەلیفە عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) بۆیە هاتە کوفە کاتـ کە موغەیەرە هاتە کوفە نووسراوێکی پێبوو ئەم نووسراوەی بۆحوزەیفە کوڕی یەمـ نارد تا پایەی ویلایەتی ئازەربیجان وەربگرێت، حذیفە ئەو کاتە لە نەهاوەند بوو بەپـ ی فەرمانی موغەیەرە بەڕێکەوت هاتە ئەردەبیل کە ئەمەش شارێکی ئازەربیجان بو لەم کاتەدا مەرزەبانی ئەردەبیل جەنگێکی قورسی دژ بە موسڵمانەکان بۆ ماوەی چە ڕۆژێك ئەنجامدا بەڵام لەدواتردا مەرزەبان پەیمانی لەگەڵ حذیفە بەست و لەگەر ڕێکەوت بەناوی هەموو خەڵکی ئازەربیجان، لەسەر هەشت سەد هەزار درهەم، بەپێ ئەم ڕێکەوتن نامەیەی نێوان حوزەیفە و مەرزەبان هاتبوو کە خەڵکی ئازەربیجا کەسیان لێ نەکوژرێت وکەسیان لێ بەدیل نەگیرێت وخانەو خووێ ئاگرتێك نەدرێت. کوردەکانی (البلاسجان و سبلان و ساترودان) دووچاری کێشە نەبنەوە و ڕێگە لە خەڵکر (شین)[٩٧] نەگیرێت کەخەڵکی ئازەربیجان بوون، بەتایبەتی لەیادکردنەوەی جەژنەکانیا دەرخستن و ئەنجام دانی ئەو ڕێوڕەسمانەی کە پێشتر ئەنجامیان دەدا[٩٨].

دوای ئەم ڕووداوە خەلیفە عومەر سەرکردە (حوزەیفە) ی لاداو (عتبە بن فرقـ السلمی/عوتبە کوڕی فرقد ئەلسەلمی) کردە والی لەسەر ئازەربیجان،کاتێ عوتبە هاتـ ناو ئەردەبیل بینی کەخەڵکەکە لەسەر پەیمانی خۆیان ماون بەڵام ناوچـ دوورەدەستەکانی ئازەربیجان پەیمانیان هەڵوەشاندۆتەوە، بۆیە بەسەرکردایەتی کردنـ هێزێك شالاوی کردنە سەرو جەنگی کردن ولەدەرئەنجام دا سەرکەوت بەسەریان دو غەنیمەی دەسکەوت[٩٩].

کەواتە لە ئەنجامی فەتح کردنی ئازەربیجان لەلایەن موسڵمانەکانەوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی، کە فەتح کردنی ئەم هەرێمە بایەخێکی گرنگی هەبوو بەلای موسڵمانەکانەوە، لەهەمان کات دا ژمارەیەکی دیار و بەرچاو کورد لە ئازەربیجان دا دەژیان وەکو کوردەکانی (البلاسجان و سبلان و ساترودان) کە لە ئازەربیجان دا دەژیان ولە رێکەوتن نامەکەی نێوان (حذیفە کوڕی یەمان) و مەرزەبان ناویان دێت کەواتە کورد بەهەر رێژەو ژمارەیەك بووبێت لەهەرێمی ئازەربیجان ژیاون ولەئەنجامی فەتح کردنی ئیسلامی بۆ ئەویٚ پانتایەکی بەرفراوان لەخاکە کوردنشینەکان و کوردیش کەوتونەتە ژێر دەسەلآت و قەڵەمرەوی دەسەلأتداریەتی ئیسلامیەوە، بەشی زۆری هەرێمی ئازەربیجان بەئاشتی فەتح کرا و ناوچەکە چووە قۆناغێکی تری مێژووییەوە و سەردەمێکی تازە ئەگەرچی بەدوو قۆناغیش فەتح کرا لەمێژووی ئازەربیجان و خەڵکەکەی لەڕووی سیاسی و سەربازی و ئابووری و کەلتوری دەستی پێکرد.

**سێ یەم: فەتح کردنی ئەرمینیا لەساڵی ٢٢ك/٦٤٣ز لەلای طبري:**

دوای فەتح کردنی (باب الأبواب[١٠٠])لەلایەن (سراقە بن عمرو/ سوراقە کوڕی عەمر[١٠١])، سوراقە والی خەلیفەعومەری کوڕی خەتاب نوسراوێکی دەرکرد ئەمەش دەقەکەیەتی: ئەمە ئەو نوسراوەیە کە سوراقە کوڕی عەمر کاربەدەستی خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب دای بە(شهربراز) و دانیشتوانی ئەرمەنیە و ئەرمەن بە ئەمان و دڵنیایی، دڵنیایی دانیٚ بۆ خۆیان و سامانیان و خەڵکەکەیان کە زیانیان بۆ موسڵمانان نەبێت و ئەم پەیمانە نەشکێنن و ئەم نووسراوە بۆ خەڵکی (ئەرمەنیە و الابواب) ە بەجۆرێك کە جزیە دادەنرێت بۆ ئەوانەی وەڵامی ئەم داوایەیان دایەوە[١٠٢].

دواتر سوراقە هێزەکانی موسڵمانانی بۆسەر چیاکانی دەوروبەری ئەرمینیە نارد و سوراقە بەکیری نارد بەرە و موقان، وحەبیب ی بەرەو (تفلیس)[١٠٣] نارد، و (حذیفە بن

أسید/حوزەیفە كوڕی ئوسەید[١٠٤])ی نارد بەرەو چیاكانی (اللان)[١٠٥]، و (سلمان بن ربیعة/سەلمان كوڕی ڕەبیعە)[١٠٦] بەرە و لایەكی تری ئەرمینیا نارد بەم چەشنە سراقە هەواڵی فەتحی ئەرمینیای بۆ خەلیفە عومەری كوڕی خەتاب نووسی[١٠٧].
دواتر سراقە مرد و (عبدالرحمن بن ربیعة/عەبدولڕەحمان كوڕی ڕەبیعە) شوێنی گرتەوە[١٠٨].

(أحمد بن أعثم الكوفي) مێژوونوس لەبارەی فەتح كردنی وولاتی ئەرمینیە دەنووسێت: سەلمان كوڕی ڕەبیعە و ئەو جەنگاوەرانەی كە لەگەڵی دابوون لەخەڵكی عێراق بەرەو ولاتی ئەرمینیا بەڕێكەوتن، هەندێ لەپادشاكانی ئەرمینیا كە ئەم بارەیان دیت هەلاتن و خۆیان مەلاس داو قایم كرد لە چیا و قەلاكان و شوێنە قایمەكان، لەم كاتەدا سەلمان بەرەو پێشەوە چوو بەرەو ناوەوەی ئەرمینیا و لەكاتی بەرەو پێش چوونی دا كۆمەڵێ قەلاو شاری فەتح كرد تا گەیشتە (بیلقان) لە ولاتی ئاران، و خەڵكی (بیلقان) یش ئاشتی و پێكهاتنیان لەگەڵ بەست لەبەرامبەردا هەندێ پارەیان دایێ و سەلمان یش ئەمەی لێ قبول كردن[١٠٩].

دواتر سەلمان لە (بیلقان)ەوە بەڕێكەوت و لەقەلای برذعة دابەزی و ئاشتی لەگەڵ خەڵكەكەی بەست لەبەرامبەر وەرگرتنی بڕێك پارەو سامان دواتر بەرەو (جرزان) ڕۆیشت وئاشتی لەگەڵ خەڵكەكەی بەست لەسەر شتێكی دیار لەسامان كە هەموو ساڵێك بیدەنێ دواتر خۆی و جەنگاوەرەكانی لە خاكی (شروان) دابەزین و لەگەڵ پادشاكەی ئاشتی بەست و لەبەرامبەردا هەندێك سامانی لێوەرگرت دواتر لە (شروان)ەوە هاتە (شابران) و(مسقط) دواتر (سلمان كوڕی ربیعەالباهلی) بانگەوازی بۆ پادشاكانی چیاكان نارد و داوای ئیسلامبوونی لێ كردن ولەئەنجام دا پادشای (اللكن) و پادشای (فیلان) و پادشای (طبرستان) داواكەیان قبوڵ كردوو و سامان ودیاریشیان بۆ نارد و ڕێكەوتن لەگەڵی كە هەموو ساڵێك شتێكی لەسامان بدەنێ، (سلمان) یش ئەمەی لێ قبول كردن[١١٠].

ئیتر بەو شێوەیە سەلمان لەئەنجامی بەدیهێنانی سەرکەوتنەکان زیاتر پێشڕەوی دەکات بەرەو پێشەوە تا لەئەنجام دا لەکاتی خەریك بونی سەلمان بەگرتنی بلنجر توشی شەڕێکی گەورە دەبێ لەگەڵ خاقان کە ژمارەی هێزەکانی نزیکەی سێ سەد هەزار جەنگاوەر دەبێ(ئەو ژمارەیە زیادەڕەوی تێدایە) ئیتر لەئەنجامی شەڕێك لەنێوان هەردوولادا سەلمان و تەواوی موسڵمانەکانی، ئەو جەنگاوەرانەی کە لەگەڵی دەبێت دەکوژرێت بەم شێوەیە شەپۆڵێ هێرش و سەرکەوتنەکانی سەلمان و جەنگاوەرەکانی دەوەستێت[111].

لەئەنجامی فەتح کردنی ئەرمینیا لەلایەن موسڵمانەکانەوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە بەشێکی زۆر و گەورە لەشارەکانی ئەرمینیا بەئاشتی و ڕێکەوتن فەتح کراوە و لەنێو شارە فەتح کراوەکانی ئەرمینیادا کۆمەڵێ شاری کوردنشین فەتح کراون و کەوتونەتە ژێر دەسەلاتی موسڵمانەکان و لەدەرئەنجامیشدا ژمارەیەکی بەرچاو لەکورد و پانتایەکی دیاریش لەخاکەکەی بەرئەم هەڵمەتانەی فتوحاتی ئیسلامی کەوتون و هاتونەتە ژێر دەسەلاتداریەتێکی تازەوە و ئەم ناوچە فەتح کراوانە و خەڵکەکەشی بەو ژمارە کوردە دیاریکراوەشەوە کە لەوێ دا ژیاون چونەتە نێو قۆناغێکی مێژوویی تازەوە و گۆڕانکاریەکی بەرچاو و دیار بەسەر بارودۆخیان داهاتووە لەڕووی ئاینی و سیاسی و سەربازی و ئابووری و کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری کە ئەمە بۆ هێزی بەرەی موسڵمانەکان و دانیشتوانی ناوچەکە گۆڕانێکی گرنگ و ئیجابی بوو، بەلام ڕەنگە ئەم گۆڕانە تازەیە بۆ هەندێ دەسەلاتدار و پادشای ئەرمینیا ئیجابی نەبووبێ بەڵکو خراپ بووە و بەرژەوەندیە سیاسی و ئابووریەکانیان دووچاری هەڕەشە لێ کردنی ڕاستەقینە هاتووە، بۆیە ڕەنگە هەندێ لە پادشاکانی ئەرمینیا دژایەتی گۆڕانە تازەکەیان کردبێت.

**چوارەم: شالاو ناردن بۆسەر ئازەربیجان و ئەرمینیە لەسالی ٢٤ك/٦٤٥ز[112]:**

وەلید کوڕی عوقبە شاڵاوی بردە سەر ئازەربیجان و ئەرمینیە لەساڵی ٢٤ك/٦٤٥ز بەمەبەستی ڕێگەنەدان بەخەڵکەکەی تا ئەو ئاشتی نامەیە هەڵنەوەشێننەوە کە موسڵمانان لەڕۆژگاری خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب لەگەڵیان دا ڕێکەوتبوون[113].

وەلید لەکاتی والی بونی لەسەر کوفە لەسەردەمی دەسەلآتداریتی خەلیفە عوسمانی کوڕی عەففان(خوای لێ ڕازی بێت) شالآوی بردەسەر ئازەربیجان و ئەرمینیە بۆ ئەم مەبەستە وەلید لەگەڵ کۆمەڵێ لەجەنگاوەرەکانی دەرچوو بەمەبەستی چونە ناو خاکی ئەرمینیا بۆیەلەکاتی پێشڕەوی کردنی خۆی و جەنگاوەرەکانی دا چووەناو خاکی ئازەربیجان دواتر وەلید هێزێکی چوار هەزار جەنگاوەری نارد، ئەم هێزەش شالآویان بردە سەر خەڵکی (موقان) و (الببر) و (الطیلسان)، لە ئەنجامی ئەم شالآو بردنەدا لەسامانەکەیان پێکایان و غەنیمەوهەندێك دیلیشی دەسکەوت و ئەم دەسکەوتانەی هێنایەوە و هاتەوە لای وەلید [114].

دوای ئەمە وەلید کوڕی عوقبە ئاشتینامەی لەگەڵ خەڵکی ئازەربیجان بەستەوە لەبەرامبەر هەشت سەد هەزار درهەم، ئەمە کارپێکردنەوەی هەمان ئەو ڕێکەوتنامەیەبوو، کە حوزەیفە کوڕی یەمان لەساڵی ٢٢ك لەگەڵ مەرزەبانی ئەردەبیل بەستبووی بەلآم لایەنی مەرزەبان ئەم ڕێکەوتن نامەیان جێ بەجێ نەکرد و هەڵیان وەشاندەوە، لە دوای یاخود لەکاتی شەهید بوونی خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب، بەلآم کاتێ کە عوسمانی کوڕی عەففان لە ساڵی (٢٣ك) بوو بە خەلیفە، وەلید کوڕی عوقبەی کردە والی لە کوفە، وەلیدیش بەسوپاو هێزێکەوە چووە نێو ئازەربیجان، خەڵکی ئازەربیجانیش کاتێ کە ئەم بارەیان دیت داوایان لە وەلید کرد کە کاربەڕێکەوتنامەکەی پێشوو بکات، ئەویش وایکرد[115].

ئیتر بەم شێوەیە کار بە ئاشتی نامەکەی- ڕێکەوتن نامەکەی نێوان حوزەیفە و مەرزەبانی ئەردەبیل لەئازەربیجان کرایەوە.

دواتر وەلید سەلمانی نارد بۆ ئەرمینیە لە دوازدە هەزار جەنگاوەر لەساڵی ٢٤ك بۆ ئەم مەبەستە سەلمان چووە ناو خاکی ئەرمینیا لەئەنجام دا کوشتن و دیل دەستکەوتن و غەنیمەو دەسکەوتی بەدەست هێنا ،هەرلەئەنجامی ئەم شاڵاو بردنە سەلمان دەستی پڕو لێوان لێو بوو لەدەسکەوت و سامان تاهاتە لای وەلید بەم شێوەیە وەلیدیش ئەرکی تەواو بوو و ڕۆیی و سەرکەوت و پێویستیەکانی پێکا لەشاڵاو ناردن و سەرکەوتن و فەتح کردن(١١٦).ئیتر بەم چەشنە وەلید لەشاڵاو ناردنەکەی بۆسەر ئەرمینیا سەرکەوتووبوو.

کەواتە لەئەنجامی شیکردنەوەی دەقەکانی (الطبری) لەم ڕووداوەدا دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە شاڵاو ناردن و شاڵاو کردنە سەر هەردوو هەرێمی ئازەربیجان و ئەرمینیا لە ساڵی ٢٤ك لەلایەن موسڵمانەکانەوە وەك فەتح کردنەوەو بەدەست هێنانەوەی ئەم دوو هەرێمە بووە بۆلای موسڵمانەکان بۆ جاری دووەم،لەبارەی ئازەربیجانیش بریتی بووە لەکارکردن بەڕێکەوتن نامەی نێوان حوزەیفە کوڕی یەمان و مەرزەبان لەئازەربیجان ودووبارە کارکردنەوە بەم ڕێکەوتن نامەیە گرنگیەکی گەورەی هەبووە بەلای موسڵمانەکانەوە، ئەمە جگە لەوەی کە ژمارەیەکی بەرچاو لە کوردەکانی (البلاسجان و سبلان و ساترودان) لە ئازەربیجان دا ژیاون و لە ڕێکەوتننامەی نێوان مەرزەبان و حوزەیفە ساڵی ٢٢ك ئاماژەیان پێدەدرێت.

کەواتە ژمارەیەکی دیار لە کورد لە ئازەربیجان دا ژیاون شان بە شانی نەتەوەی تر تەنانەت لە نەدانی بڕە پارەکە و هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکە و دووبارە کارپێکردنەوەی پەیماننامەکە ڕۆلیان بە پێی ژمارە و ڕێژەی خۆیان هەبووە بەو پێیەی کە بەشێکی

گرنگی دانیشتوانی ئازەربیجانیان پێکهێناوە وکوردەکانی ئازەربیجـان بـەپێی ڕێـژەیان، ژمارەیان، بەم ڕووداوەکاریگەر بوونە.

لەبارەی شاڵاوناردن بۆسەر ئەرمینیاش بەهەمان ئەندازە بەشێك لەخـەڵکی کـورد لـە شارەکانی ئەرمینیادا ژیاون و بەدوور نازاندرێت کەلەو کوشـتارو دیـل گـرتن و غەنیمـە و دەستکەوتانەدا کە جەنگاوەرە موسـڵمانەکان بەدەسـتیان دەهێنـا کـورد بەقـەد ڕێـژەی خۆی زیانی لێکەوتبێت لەڕووی مرۆیی و مەعنەوی و ئابووری و لایەنی ترەوە، ئەمە جگە لەوەی کە لە ئازەربیجانـەوە شـاڵاو کراوەتـە سـەر ئـەرمینیا لەلایـەن موسـڵمانەکانەوە، لێرەدا ئازەربیجان وەك سەرەڕێگا و بنکەی هێـرش کردنـە سـەر ئـەرمینیا بـەکارهاتووە کەلەدەرئەنجامیـشدا سـەرکەوتنی گـرنگ و گـەورە لەئـەنجامی ئـەم شـاڵاو ناردنانـەوە بەدیهاتوون و ناوچەی تازە فەتح کراون و دووبارە دەستیان بەسەرداگیراوەتەوە کە ئەم شاڵاو ناردنانە بەلای موسڵمانەکانەوە دەرئەنجامی گەورەو ئیجابیان لێکەوتۆتەوە بـەڵام بەلای زیان لێکەوتوانەوە دەرئەنجامی کارەسات باوی و خوێناوی و مەرگەسات بوون.

**شیکردنەوەی گشتی بۆ بارودۆخی کورد و وڵاتەکەی لەساڵانی ١٦-٤١ك/٦٣٧-٦٦١ز:**

شـیکردنەوەمان بـۆ بـارودۆخی کـورد و وڵاتەکـەی لـەم قۆناغـەدا دەمانگەیەنێتـە کۆمـەڵێ دەرئـەنجامی جۆراوجـۆر، چـونکە لـەدوای تێکـشکانی سـوپای ساسـانی لـە مـەدائن(طیـسفون، سـلمان پـاك) لەلایـەن سـوپای موسـڵمانەکانەوە دوای ئـەم ڕووداوە هـەروەك (الطـبری) ئامـاژەی پێـداوە سـوپای ئیـسلام لـە هەڵمەتـەکانیان دا پێـشڕەوی دەکەن و یەکەم بەیەك گەیشتنی سوپای ساسانی لە ناوچەیەکی کوردنشین لـە جەلـەولا لەساڵی ١٦ك/٦٣٧ز تۆمار دەکرێت.

ئـیتر بـەم چەشـنەلەئەنجامی فـەتح کردنـی ناوچـە و وڵاتـانێکی بـەرفراوان لەلایـەن موسڵمانەکانەوە پانتاییەکی بەرفراوان لە خـاك و وڵات و شـارەکان فـەتح کـران، لـەنێو

ئـەم شـار و خاکـە فـەتح کراوانـەش دا ناوچـەو شـار و پانتایـەکی بـەرفراوان لەناوچـە کوردنشینەکان بەر هەڵمەتـەکانی فتوحـاتی ئیـسلامی کـەوتن و کەوتنـە ژێـر دەسـەڵاتی ئیـسلامی و سـەردەمێکی تـازە لەمێـژووی شـارەکان وناوچەکان و خەڵکـە کوردەکـەی دەست پێدەکات.

لەفـەتح کردنـی ناوچـە فراوانـە کوردنـشینەکان دا شـار و ناوچـەیەکی بـەرفراوانی کوردنشین بەئاشتی بەبێ شەڕ و لەبەرامبەر وەرگرتنی جزیە لە خەڵکەکەی فـەتح کـران بـەڵام لـە هەنـدێك شـار و ناوچـەی تـری کوردنـشین بەتایبـەتی ئـەو شـار و ناوچـە کوردنشینانەی کە لە ژێر فەرمانڕەوایی کردنی ساسانیەکان بوون ئـەوا ژمارەیـەکیان بـە شەڕ و دوای ڕشتنی خوێن فەتح کران.

بەڵام لەفەتح کردنی ناوچە و شار و ئاوەدانیە کوردنـشینەکان لەلایـەن موسـڵمانەکان بەتایبەتی ئەم ناوچە کوردنشینانەی کە بەشەڕ فەتح کران، ئەوا دەسەڵاتدارانی ساسانی لەمـەدا ڕۆڵێکـی کاریگـەریان بینیـوە بـەهۆی هانـدان و جۆشـدانی خەڵکەکـە ڕەنگـە دەسـەڵاتدارانی ساسـانی پاڵەپەستۆشـیان خـستبێتەسەر خـەڵکی ناوچـەکانی ژێـر دەسـەڵاتی ئیمپراتۆریەتەکـەیان بـە کوردیـشەوە بـۆ ڕووبەڕووبونـەوەی موسـڵمانەکان ئەمەش بەمەبەستی لەدەست نەدانی دەسەڵات و پاراستنی ناوچەکانی ژێـر دەسـەڵاتیان بەناوچە کوردنشینەکانیشەوە لەمەش دا شتێکی ئاسایی بووە کە خەڵکی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتەکەیان بـە کوردیـشەوە هانـدابێت بـۆ ڕووبەڕوبونـەوەی موسـڵمانەکان، جـا ڕەنگە بەزۆر ساسـانیەکان جـەنگیان بـە خەڵکەکـە کردبێـت یـاخود بـەدوورنازانرێت کـە کوردەکـان هەسـتی بـەرگری کـردن لـە خۆیـان و وولاّتیـان پـاڵی پێوەنـابن تـا بـەرگری لەناوچەکانیان، لەخۆیان و سەقامگیریان بکەن.

بەشێوەیەکی گشتی ئەم بەشداریەی کوردەکان دژ بە هەڵمەتەکانی فتوحاتی ئیسلامی کە بەکاریگەری و فەرمانی ساسانیەکان کورد بەشداری لە شەڕەکانی دژ بە فتوحاتی ئیسلامی کرد، جا بەشداری کورد چ لەسەرەتای ڕووداوەکان وچ لە دەرئەنجامەکەشی هەر چۆنێك بوایە لە بەرژەوەندی کورد و وڵاتەکەی نەدەبوو بەڵکو ساسانیەکان لەپێناو لەدەست نەدانی دەسەڵاتیان و بۆبەرژەوەندی خۆیان و وەستانی هەڵمەتەخێراکانی فتوحاتی ئیسلامی کوردیان وەك میللەتەکانی،نەتەوەکانی تری ژێر دەسەڵات و ناو چوارچێوەی ئیمپڕاتۆریەتەکەیان بەکارهێنا بەڵام لە دەرئەنجام دا ئەم ئامانجەیان بەدینەهات و تێکشکان.

ئەوەی جێگای ئامارە پێدانە ئەوەیەکە کوردەکان لە پێش دەستپێکردنی هەڵمەتەکانی فتوحاتی ئیسلامی خاوەنی ئیمپڕاتۆریەت یان دەوڵەت یان میرنشینی تایبەت بەخۆیان نەبوون کە دەلالەت و هێمابن بۆ کۆبونەوەی ناوچەیەکی بەرفراوانی کوردی یان کۆبونەوەی خەڵکی ناوچە کوردنشینەکان، بەڵکو کورد و وڵاتەکەی سەر بە دوو ئیمپڕاتۆریەتی زلهێزی ناوچەکەو سەردەمەکە بوون ئەوانیش ساسانیەکان و بیزەنتیەکان بوون.

بەڵام دوای هەڵمەتەکانی فتوحاتی ئیسلامی هەروەك ئاماژەمان پێدا پانتاییەکی بەرفراوان لە ناوچە کوردنشینەکان کەوتنە ژێر دەسەڵاتی ئیسلامی و کورد لەدەرئەنجامی ئەم هەڵمەتانەوە (فتوحاتی ئیسلامی) ڕزگاری بوو لە ژێر دەسەڵاتی ساسانیەکان و بیزەنتیەکان و کەوتەوە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانەکان.

کاتێ هەڵمەتەکانی فتوحاتی ئیسلامی ڕووە و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی هەردوو ئیمپڕاتۆریەتی ساسانی و بیزەنتی دەستی پێکرد ئەوا لەم کاتەدا بەشێکی زۆری ناوچە کوردنشینەکان سەرەڕێ و ڕێگای هەڵمەت بردن بوون دژ بەم دوو ئیمپڕاتۆریەتە،ئەگەر

چی بۆ نموونە ساسانیەکان هەندیێ لە شەڕەکانیان هێنایە ووڵاتی کوردان ئەمەش وەك بەرگری کردن لەخۆیان شتێکی ئاسایی بوو بەڵام ئەم شارە کوردنشینانەی کە بەئاشتی فەتح کران بەدەرن لەم تێڕوانینە.

بەم شێوەیەکورد و ووڵاتەکەی ڕزگاریان بوو لەژێر دەسەڵات و فەرمانڕەوایی کردنی هەردوو ئیمپڕاتۆریەتی ساسانی و بیزەنتی بەسەر خۆیان و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیان و کەوتنە ژێر دەسەلاتی ئیسلامی لەبوارەکانی ئایینی و سیاسی و سەربازی و ئابووری و کارگێڕی و کەلتووری و کۆمەلایەتی واتە کورد و ووڵاتەکەی لەم بوارانەی کە ئاماژەمان پێدان بوونە بەشێك لەناوچەکانی ژێر دەسەلاتی ئیسلامی، واتە ئەم هاتنە پاڵەی کورد و وولاتەکەی بۆ ناو قەڵەمڕەو و چوارچێوەی دەوڵەتی ئیسلامی هەر تەنها هاتنە پاڵ و ئاوێتەبوونێکی سیاسی و سەربازی و کارگێڕی نەبوو بە تەنها بەڵکو ئەگەرچی لەسەرەتاش نەبوویێ بەلام لەدواتردا کورد لەڕووی ئایینی و فەرهەنگی و سیستەمی کۆمەلایەتیش بەهەموو ووردەکاریەکانیەوە هاتنە ناو چوارچێوەی ئەم دەولەتە و ئاوێتە بوون و هاتە ناو گۆڕانەکە بە گشتی جا هەندێك لە دەمج و ئاوێزان، ئاوێتە بوونەکان وەکو لایەنەکانی سەربازی و سیاسی و کارگێڕی ڕەنگە ئاسایی تر، سادەتر ڕۆچوبێ بەناو کورددا لەلایەنە ئایینی و کۆمەلایەتیەکە ئەمەش نەك بەخێرایی بەڵکو بەرەبەرە بەلام خێراش بە ڕەچاو کردنی کات و سەردەم و قۆناغەکە.

ئیتر بەم شێوەیە دوای هەڵمەتەکانی فتوحاتی ئیسلامی کورد و ووڵاتەکەی کەوتنە ناو چوارچێوە و دەسەلاتداریێتی دەوڵەتی ئیسلامی، کوردە موسڵمانەکان مامەڵەی موسڵمانیان لەگەڵدا کرا و کوردە ناموسڵمانەکانیش لە بەرامبەر دانی جزیە لەسەر ئاینی خۆیان مانەوە .

بەشێوەیەكی گشتی لەدوای هەڵمەتەكانی فتوحاتی ئیسلامی كورد پەیوەست كرا بە دەوڵەتی ئیسلامی، بۆ كوردە موسڵمانبووەكان هۆكاری ئاینی و باڵادەستی هێزی ئیسلامی موسڵمانەكان، بۆ ئەو كوردانەشی كە لەسەر ئاینی خۆیان مابونەوە باڵادەستی هێزی ئیسلامی، موسڵمانەكان، ڕۆڵێكی گەورەیان گێڕا لەم پەیوەست بونەی كورد و وولاتەكەی بە دەوڵەتی ئیسلامی تازە دامەزراو.

## پەراوێزەکان:

[1] لەبارەی ساڵی فەتح کردنی جەلەولا ڕا جیاوازی لەنێو مێژوو نووسە کۆنەکان دا هەیە بۆ نموونە خلیفة بن خیاط دەڵێت جەلەولا لەساڵی (١٧)ك فەتح کراوە . (خلیفة بن خیاط : تأریخ خلیفة بن خیاط :ج١ ،ص١٢٧ .بەڵام البلاذری دەڵێت لەکۆتایی ساڵی (١٦ك) فەتح کراوە .(البلاذري :فتوح البلدان ، ص٢٦١) . بەڵام الیعقوبی دەڵێت : ئەم شارە لەساڵی (١٩ك) فەتح کراوە . الیعقوبی : تأریخ الیعقوبی ، ج٢:ص١٥١ . بەڵام من پێم وایە ئەم شارە لەساڵی (١٦ك) فەتح کراوە .

[2] الطبري :تأريخ الأمم والملوك : ج٢:ص٥٤٦ "إبن الأثير :الكامل في التأريخ : ج٢ :ص٣٦٤" إبن كثير :البداية والنهاية:ج٧ : ص٥٦.

[3] هاشم کوڕی عوتبە :ئەم کەسایەتیە کوڕی ئەبی وقاص الزهری بوو نازناوی (المرقال ) بوو چونکە لە جەنگ دا پەلەی دەکرد،و بەشداری شەڕی یەرموك و فەتحی دیمەشقی کردبوو ،سەرکردەیەکی جەنگی لێهاتووبوو و لە ڕووداوی جەلەولادا لەلایەن خەلیفە عومەری کوڕی خەتابەوە هەڵدەبژێردرێت بۆ سەرکردایەتی کردنی بەرەی جەلەولای موسڵمانەکان دواترلە شەڕی (صفین) لە ساڵی٣٧ك کوژرا ؛ الذهبي : سير أعلام النبلاء : تحقيق: محمد العرقسوسي ومأمون صاغرجي : ط١ :( بيروت:١٩٨١م ) : ص ٤٨٦ .

[4] سەعد کوڕی ئەبو وەقاس : ناوی ئەبو وقاص مالك کوڕی وهیب کوڕی عبد المناف کوڕی زهرە کوڕی کلاب کوڕی مرەیە ،نازناوی باوکی أسحاق بوو،دایکی ناوی (حمنە) کچی سفیان کوڕی أمیە کوڕی عبدشمس کوڕی عبد المناف کوڕی قصی بوو ، سەعد لەتەمەنی ١٧ ساڵی موسڵمان ببوو و یەکێ بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر (د . خ )، سەعد لە ساڵی ٥٥ك مرد لە کاتێك دا کە تەمەنی لە سەروی (٧٠)ساڵیەوە بوو . ابن سعد: الطبقات الكبرى :(بيروت :١٩٨٠م): ج٦،ج٣ ص١٣،١٣٧،١٤١).

[5] الطبري:تاريخ الأمم والملوك :تحقيق :مصطفى السيد وطارق سالم :(القاهرة: د.ت) :ج٢: ص٥٤٦" إبن الأثير : الكامل في التاريخ :ج٢،تحقيق :أبي الفداء عبدالله القاضي :ط٤: ( بيروت: ٢٠٠٣م): ص٣٦٤ " إبن الوردي: تأريخ إبن الوردي: ط١: (بيروت : ١٩٩٦م):ج١ :ص١٣٩،١٣٨ " إبن كثير :البداية والنهاية : ج٧:ص٥٦. بۆ زیاتر زانیاری لەو بارەیەوە بڕوانە ئەم سەرچاوانە: عبدالحميد بخيت :عصر الخلفاء

الراشدين :ط٢:(القاهرة:١٩٦٥م): ص٤٩٧ " السيد عبدالعزيز سالم : تأريخ الدولة العربية :(اسكندرية : ٢٠٠٤م) :ج٢ :ص٢٤٢" محمد حسين محاسنة وأخرون: دراسات في التأريخ الأسلامى :ط١ : (أربد :١٩٩٠م) : ص٣٦" أحمد شلبي: موسوعة التأريخ الأسلامي :ط١٠: (القاهرة :١٩٨١م) :ج١،ص٥٨٠،٥٧٨" عبد علي ياسين :تأريخ صدر الأسلام :(عمان : ٢٠٠٣م) :ص٣٠٦،٣٠٥ " السيد عبد العزيز سالم و سحر السيد عبد العزيز سالم :معالم التأريخ الأسلامي: (اسكندرية : ٢٠٠٤م) :ص٢٤٢.

(٦) یەزدەجردی سیّ یەم : ناوی یەزدەجرد كوڕی شەهریار كوڕی كیسرا پرویز بوو ،لەساڵی ٦٣٣ز وەك پادشا بۆ سەر تەختی ساسانی هەڵبژێردرا لەو كاتەی كە دەوڵەتی ساسانی لەئاژاوە و پشێوی ناوخۆیی گەورەدا دەژیا بەجۆرێك كە دەسەلاتی بەسەر هەرێمەكانی ساسانی لەدەست دا بوو بۆیە یەزدەجرد هەوڵی چاككردنی ئەم بارودۆخەی دا بەلام لەمەدا سەركەوتوو نەبوو بەهۆی گەورەبوونی هێزی خانەدانەكان لەلایەك و دەست پێكردنی هەڵمەتەكانی فتوحاتی ئیسلامی لەلایەكی ترەوە بەم شێوەیە دوای ئەوەی كە ئیمپراتۆریەتی ساسانی توشی زنجیرەیەك هەرەس بوو یەزدەجردیش رۆژگاری بەرەو ئاوابوون دەڕۆیشت دواتر لەهەرێمی( مرو)لەساڵی ٦٥١ز لەسەر دەستی ئاشەوانێك كوژرا .(أرثر كريستنسن : إيران في العهد الساساني: ترجمة يحيى الخشاب : (بيروت : د .ت ) : ص٤٨٥،٤٨٩.

(٧) الطبري :م. س : ج٢: ص٥٤٦ "إبن الأثير :م . س : ج٢:ص٣٤٦ " إبن كثير: م. س : ج٧: ص٥٦ .

(٨) تأريخ خليفة بن خياط :تحقيق: سهيل زكار : (دمشق :١٩٦٨م) :ج١: ص١٢٧.

(٩) الطبري: م. س :ج٢: ص٥٤٧،٥٤٨،٥٥١ .بةراوردى بكة بة" خليفة بن خياط : م. س : القسم الأول : ص١٢٧"اليعقوبي : تأريخ اليعقوبي : (بيروت : د. ت ) : ج٢، ص١٥١.بۆ زیاتر زانیاری لەم بارەیەوە بڕوانە ئەم سەرچاوانە: الذهبي :العبر في خبر من غبر: تحقيق :صلاح الدين المنجد :(الكويت :١٩٦٠م): ص٢١" الذهبي : نزهة الفضلاء: ص٦٢" إبن المبرد : محض الصواب : تحقيق : عبدالعزيز بن محمد بن عبدالمحسن الفريح : ط١: (الرياض :٢٠٠٠م) :ج٢،ص٤٤٤ " كمال السيد أبو مصطفى و أسامة أحمد حماد : محاضرات في تأريخ الدولة العربية إلاسلامية : (الأسكندرية : ٢٠٠٦م) : ص١٢٧.

(١٠) خليفة بن خياط :م . س : القسم الأول : ص١٢٧ " البلخي : كتاب البدء و التأريخ(بيروت:د.ت) : ج٢: ص٢٠٥.

(11) الطبري :م.س: ج٢: ص٥٥١ .

(12) الطبري : م.س: ج٢ :ص٥٤٨ " إبن الأثير :م.س:ج٢ :ص٣٦٥ " إبن الوردي : تأريخ إبن الوردي: ج١ : ص١٣٨،١٣٩" إبن كثير : م. س : ج٧، ص٥٧ " أحمد بن زيني دحلان :م.س :ج١،ص١١٢ " السيد عبد العزيز سالم : م.س :ج٢ ،ص٢٤٢ " عمر حسن : م.س : ص٧٠ " محمد رضا : الخلفاء الراشدون : (بيروت :٢٠٠٥م ) : ص١٨٣ .

(13) الطبري :ج٢،ص٥٤٩.

(14) الطبري : م.س : ج٢، ص ٥٤٩ "إبن ألأثير : م.س : ج٢ ،ص٣٣٥-٣٣٦.

(15) ئەنفال : طبري لەکتێبەکەی دا ( تفسير الطبري ) چەند لێکدانەوەیەك دەهێنێت بۆ شیکردنەوەی مانای ئەنفال وەکو : ئەنفال بریتی یە لەغەنائم واتە دەستکەوتەکانی شەڕ ئەو دەستکەوتانەی کە موسڵمانەکان لەبەرامبەر بێباوەڕەکان و هاوبەش پەیداکەرانی خودا دوای شەڕ بەدەستیان دەهێنا .

ئەنفال ئەو شتانەش دەگرێتەوە کەلەلای بێباوەڕەکان و هاوبەش پەیداکەرانی خودا دەستی بەسەر دا دەگیرێت و دەچێت بۆلای موسڵمانەکان لەمرۆڤ و مەڕوماڵات و شتی هاوشێوەی ئەمانە .

النفل : بریتی یە لەو پێنج یەکەی کە خودا بۆ خەڵکی پێنج یەکی داناوە.

ئەنفال بەواتای ئەو شتانەش دەگرێتەوە کەلای هاوبەش پەیداکەرانی خودا دەگەڕێتەوە بۆلای موسڵمانان لەمرۆڤ (بەندە) و زریّ پۆش و ئەسپ و شتی تری هاوشێوەی ئەمانە کەوا بەهێز و بەزۆری پەدەست نەهاتبن و بەهۆی ئەم ئەنفالانەوە خەڵکی ئیسلامی پیّ چاك بکرێت، ئەنفال هەموو ئەو شتانەش دەگرێتەوە کە سوپا بەزۆری ، بەهێز دەستی بەسەرا دەگرێت . الطبري : تفسير الطبري : ط١: (بيروت :٢٠٠٢م) :ج٤: ص٥.

(١٦)بهندف:شارۆچکەیەکە لە دەوروبەری بەغدا لە نزیك نەهرەوانە،لەنێوان بادرایا و واسط موسڵمانەکان لە ساڵی (١٦ك/٦٣٧ز)فەتحیان کرد.ياقوت الحموي:معجم البلدان،ج١،ص٥١٦.

(17) الطبري :م.س :ج٢ : ص٥٥٤ " إبن الأثير : م. س،ج٢ ، ص٣٦٩،٣٧٠ "أبو الفداء: م . س ،ج١ ، ص٢٢٦ " إبن الوردي : م. س: ج١،ص ١٣٩" إبن كثير : م . س ، ج ٧ ، ص٥٨،٥٩"محمد رضا :م . س : ص١٨٤ " عبد علي ياسين : م . س : ص٣٠٧ .

(١٨) الطبري: م . س ،ج٢: ص٥٥٤ " إبن الأثير: م. س، ج٢ : ص٣٧ " إبن كثير : م. س :ج٧ ،ص٥٩ "محمد رضا: م. س : ص١٨٤.

(١٩) ئەبوموسای ئەشعەری: ناوی عبداللەکوڕی قیس کوڕی سلیم کوڕی حضاري کوڕی حربة ، دایکی ناوی ظبیەی کچی وهبە، لەساڵی ٥٢ک لەسەردەمی خەلافەتی معاویە کوڕی ئەبو سوفیان مرد .إبن سعد : الطبقات الکبری : ج٤:ص١٠٥،١١٦ .

(٢٠) البلاذري : فتوح البلدان : ط١، (بيروت :١٩٨٣م) : ص٣٠٠.

(٢١) لەبارەی ساڵی فەتح کردنی (سوق الاهوان) ڕای جیاوازی هەیە چونکە البلاذري پێی وایە ئەم شارە لەنێوان ساڵی (١٥-١٦ک) فەتح کراوە . البلاذري : م .س ،ص٣٦٦،٣٦٧ . بەڵام اليعقوبی پێی وایە ئەم شارە لەساڵی ٢٣ک فەتح کراوە . اليعقوبي : تأريخ اليعقوبي ، ص١٥٧ . بەڵام من پێم وایە ئەم شارە لەساڵی ١٧ک فەتح کراوە .

(٢٢) حرقوس کوڕی زوهێر ئەلسەعدی،بەشداری هەبووە لە فەتح کردنەکانی عێراق،بە فەرمانی خەلیفە(عومەری کوڕی خەتاب)(سوق الاهوان)ی فەتح کرد و لە ڕیزەکانی خەوارج لە ڕووداوی نەهرەواندا کوژرا.(العسقلانی:الاصابة فی تمییز الصحابة،ص٢٦٦).

(٢٣) الطبري : م.س : ج٢:ص٥٧٨"ابن الأثير : م: س : ج٢: ص٣٨٦،٣٨٧" إبن كثير : م.س : ج٧ : ص٦٦،٦٧" أحمد بن زيني دحلان : م.س : ج١ : ص١١٦،١١٧" محمد رضا : م . س :ص٢٣٨ .

(٢٤) الطبري : م . س :ج٢ ، ص٥٧٩ " ابن الأثير : م . س ،ج٢ :ص٣٨٨ " ابن كثير :م . س : ج٧ : ص٦٧ " أحمد بن زيني دحلان : م . س ،ج١ : ص١١٧ .

(٢٥) مغیرە کوڕی شعبە: کوڕی ئەبو عامر کوڕی مسعود کوڕی معتب کوڕی مالك کوڕی کعب نازناوی باوکی(عبدالله)بوو ،دایکی ناوی(اسماء کضی الافقم کوڕی ئەبو عمر) بوو، کەسایەتیەکی زیرەك و لێزان و فێڵبازی هەبوو، لە ساڵی (٥ك) موسڵمان بوو دوای شەڕی خەندەق، بەشداری ڕێکەوتننامەی(حودەیبیەی کرد،دواتر پایەی والێتی بەصرەی لەلایەن خەلیفە عومەر پێ بەخشرا پاشان چۆوە مەدینە،بەشداری شەڕی نەهاوەندی کرد،لە ساڵی(٢١ك) پایەی ویلایەتی کوفەی وەرگرت تا سەردەمی خەلیفە عوسمان ئینجا لادرا،کاتێ موعاویە بووە خەلیفە کردیەوە بە والی لە کوفە لەم

پایەیە مایەوە تا لە سالّی(٥٠ك/٦٧٠ن) بە نەخۆشی طاعون مرد.ابن سعد،طبقات الکبری،ج٤،ص٢٨٥،٢٨٤.

(٢٦) فتوح البلدان : ص٣٦٦.

(٢٧) نفسه:ص٣٦٦ .

(٢٨) الطبري : م . س :ج٢ : ص٥٨٩ " ابن الأثير : م . س : ج٢: ص٣٩٤ " ابن كثير : م. س . ج٧ : ص٧١ " أحمد بن زيني دحلان : م . س . ج١ : ص١٢٠ " أكرم ضياء العمري :م .س : ص٣٦٢ .

(٢٩) تأريخ خليفة بن خياط : ق١ :ص١٣٢ .

(٣٠) المقدسي:أحسن التقاسيم في معرفة الأقاليم :ص٣٠٤.

(٣١) الطبري : تأريخ :ج٢ :ص٥٨٩–٥٩٠ " إبن الأثير : الكامل: ج٢: ص٣٩٤،٣٩٥ .

(٣٢) لەبارەی سالّی فەتح کردنی شاری نەهاوەند ڕای جیاوازی هەیە بۆ نموونە خلیفە بن خیاگ دەلّیت : ئەم شارە لەسالّی ٢١ك فەتح کراوە . خلیفە بن خیاگ : م . س ، ج١ ، ص١٤٣ "البلاژری دەلّیت : ئەم شارە لەسالّی (٢٠ك) فەتح کراوە . البلاذري :م .س ، ص٢٩٨ " کەچی الدینوری دەلّیت لەسالّی ٢١ك فەتح کراوە . الدینوری :الاخبار الطوال ، ص١٢٦ " (الیعقوبی)یش دەلّیت ئەم شارە لەسالّی ٢١ك فەتح کراوە . الیعقوبی : تأریخ الیعقوبي : ج٢،ص١٥٦ .منیش پێم وایە ئەم شارە لەسالّی( ٢١ك) فەتح کراوە .

(٣٣) الطبري : م . س: ج٢ : ص٦٠١ " بەراوردی بکە بە: خلیفة بن خیاط :م . س : القسم الأول : ص١٤٣ "الدینوري : الأخبار الطوال : تحقیق : عبدالنعم عامر : ( مصر : د . ت ) : ص١٢٦ " إبن الأعثم الکوفي :کتاب الفتوح :ط١ : (بیروت :١٩٢٦م) : ج٢:ص٣٢" أبو الفداء :م . س :ج١: ص١٤١ " بۆ زیاتر زانیاری لەم بارەیەوە بڕوانە ئەم سەرچاوانە: إبن الوردي :م . س : ج١: ص١٤١ " البکجري الحنفي : مختصر تأریخ الخلفاء للمغلطاي :تحقیق : أسیا کلیبان علي بارح : (بیروت :٢٠٠٤م ) :ص٩٠ " الیافعي : مرآة الجنان و عبرة الیقظان : ط١،(بیروت :١٩٩٧م) :ج١: ص٦٦"القلقشذي : مآثر الأنافة في معالم الخلافة:تحقیق : عبد الستار أحمد فراج : ط١ : (بیروت :١٩٨٠م ) : ج١: ص٩٠ .

(٣٤) نەعمان کوڕی مقرن : نازناوی باوکی حکیم بوو و پێشیان دەگووت باوکی عمرو المزینی . هەروەها سەرکردەی ئەم سوپایە بوو کە نەهاوەندی فەتح کرد بەڵام هەر لەم ڕووداوەدا لەساڵی ٢١ك /٦٤١ز کوژرا .(الذهبي : سیر أعلام النبلاء : ج٢:ص٢٥٦،٢٥٧ ).

(٣٥) الطبري : م . س ،ج٢: ص٦٠١" البكجري الحنفي : م.س : ص٩٠ "الذهبي : م . س ،ج١: ص٦٨ .

(٣٦) ئەمەش ناوی ئەو هاوەڵانەی پێغەمبەرە ( د. خ) کە بەشداریان کرد لەجەنگی نەهاوەند وەك جەنگاوەر لە ڕیزەکانی سوپای موسڵمانەکان دژ بە هێزەکانی بەرەی یەزدەجرد و ساسانی . ((عبداللەکوڕی عومەر وجریر کوڕی عبدالله البجلی و حذیفة کوڕی یەمان و مغیرة کوڕی شعبة و عمروی کوڕی معدی کرب الزبیدی و طلیحە کوڕی خویلدی الاسدی و قیس کوڕی مکشوح المرادی)) .ابن کثیر:م.س :ج٧:ص٨٨.

(٣٧) الطبري :م . س ،ج٢، ص٦٠٦ " إبن الأثیر :م . س ، ج٢،ص٤١١ " إبن کثیر : م . س ، ج٧. ص٨٥،٨٦ .

(٣٨) الطبري:م.س :ج٢ :ص٦٠٥ " عمر حسن :م.س،ص٧١ .

(٣٩) الطبري : م. س:ج٢: ص٦٠٦" إبن الأثیر : م.س :ج٢:ص٤١١ " إبن کثیر : م. س :ج٧: ص٨٥-٨٦ .

(٤٠) قومس: هەرێمێکی گەورە و فراوانە، زۆر شار و گوند و کێڵگە لە خۆوە دەگرێت، دەکەوێتە لاپاڵی چیاکانی (طبرستان) ناوەندەکەی(دامغان)ە کە لە نێوان ڕەی و نیسابوردایە.یاقوت الحموی:معجم البلدان،ج٤،ص٤١٤،٤١٥.

(٤١) الاخبارالطوال:ص١٢٦" خلیفة بن خیاط:القسم الاول،ص١٤٣" ابن الاثیر،ج٢،م.س،ص٤١١ " ابن کثیر:ج٧:ص٨٥-٨٦.

(٤٢) خلیفة بن خیاط القسم الاول ،ص١٤٣" الدینوری:م.س:ص١٢٩ " أبو الفداء :م.س،ج١،ص ٢٢٩ " الذهبی:ج١-م.س،ص٦٧" إبن الوردی :ج:ص١٤١ " احمد بن زینی دحلان.ج١-م.س :ص١٢٦ .

(٤٣) النعمان کوڕی مقرن: المزینی، لە ساڵی(٥ك) موسڵمان بوو،بەشداری شەڕی(خەندەق) و غەزوەکانی تری کرد،سوار چاکێکی ئازا و سەرکردەیەکی گەورە بوو،وە بەشداری شەڕی ڕەدە و

قادسیە و نەهاوەندی کرد لەکاتی فەتح کردنی نەهاوەند دا کوژرا و هەر لەوێش نێژرا.ابن سعد:م.س،ج٤،ص٢٣٧.

(٤٤) الطبري : م. س : ج٢:ص٦٠٢ " إبن الأثير : م . س :ج٢: ص٤١٩ " إبن كثير : م . س : ج٧:ص٩٠ -٩١.

(٤٥)اليعقوبي:تاريخ اليعقوبي،ج٢،ص١٥٦ " الطبري: م.س، ج٢، ص٦١٣" إبن الجوزي : الخليفة العادل عمر بن خطاب : (عمان :٢٠٠٤م ) :ص٦٦ " إبن المبرد :م . س : ج٢: ص٤٥٠ " . أكرم ضياء العمري :م . س : ص٣٦٤ .بۆ زیاتر زانیاری لەم بارەیەوە بڕوانە ئەم سەرچاوانە: لازاريف : تأريخ كوردستان : ترجمة : عبدي حاجي :ط١ :(دهوك :٢٠٠٦م ) : ص٣٧ " أرثر كريتنسن : ايران در زمان ساسانيان :ترجمة رشيد ياسمى ويراستار و حسن رضايى باغ بيدى :ضاث سوم : (تهران :١٣٨٢ ) : ص٣٦٢ " ساندرامك كى : ايرانى ها،إيران اسلام و روح يك ملت : ترجمة شيوارو يطريان :ضاث أول :( تهران :١٣٨٠ ) : ص٥٤ ، ٥٥ .

**Francesco Gabrie: Ashort History of the Arabs: Translated by: salvator Attanasio Robert Hale :( Great Britain: ١٩٦٥): P:٥٤**

(٤٦) لەبارەی ساڵی فەتح کردنی هەمەژان ڕاجیاوازی هەیە بۆ نموونە البلاژری دەڵێت لە ساڵی (٢٤ك) فەتح کراوە.البلاژری :فتوح البلدان،ص٢٦١.منیش پێم وایە لە ساڵی (٢٢ك) فەتح کراوە.

(٤٧) الطبري: م.س.ج٢: ص٦٢٠" إبن الأثير:م.س:ج٢:ص٤٢٥ "إبن كثير:م.س.ج٧: ص٩٨ " إبن المبرد:م.س:ج٢: ص٤٥٢" أكرم ضياء العمري:م،س:ص٣٦٥ " أحمد بن زيني دحلان:م.س.ج١:ص١٢٩.

(٤٨) نەعیم کوڕی مقرن: برای (نەعمان کوڕی مقرنی المزینی) بوو،کاتێ براکەی لە نەهاوەند کوژرا جێی براکەی گرتەوە،هاوەڵی پێغەمبەر (د.خ) بوو،فارس لەسەر دەستی ئەو فەتح کرا،خەلیفە عومەر چاکەی ئەو دووبرایەی دەزانی. ابن الاثير:اسد الغابة فى معرفة الصحابة،ج٥،ص٣٦٤.

(٤٩) الطبري : م.س:ج٢: ص٦٢١" إبن الأثير :م.س.ج٢: ص٤٢٥ "إبن كثير:م.س.ج٧:ص٩٨.

(٥٠) جەریر کوری عەبدوللا: البجلی،الآحمسی الیمنی،چل رۆژ پێش مردنی پێغەمبەر (د.خ) موسلمان بوو،لەگەل موسلمانان بەشداری رۆژی(مەدائن)ی کرد و بەشداری زۆر فتوحاتی تری عێراق و عەجەمی کرد ،ئەم کەسایەتیانە (البخاری ومسلم و ابو داود و الترمذی و النسائی و ابن ماجة) هەندێ ریوایەتی،ووتەی پێغەمبەر(د.خ) یان لەوەوە وەرگرتووە، لە (قرقیسیا) مرد لەسالی(٥١ك) و دەشگوترێت سالی(٥٤ك). (الصفدی:م.س،ج١١:ص٥٩،٥٨
.)

(٥١) تأريخ خليفة بن خياط :ج١: ص١٦٠.

(٥٢) فتوح البلدان : ص٣٠٢ .

(٥٣) فسا: جوانترین شاری فارسە بەلام فسا گەورەترین شاری نێو (کورە) ی دارابجردە،شارێکی فراوان و کۆنە، قەلا و قایمکاری و خەندەقی لێیە. یاقوت الحموی:معجم البلدان،ج٤،ص٢٦٠،٢٦١.

(٥٤) دارا بجرد: ویلایەتێکە لە فارس. یاقوت الحموی:معجم البلدان،ج٢،ص٤١٩.

(٥٥) الطبري : م . س : ج٢: ص٦٤٠ " إبن الأثير :م . س : ج٢:ص٤٤١ " إبن كثير : م . س : ج٧:ص١٠٥،١٠٦ " أحمد بن زيني دحلان : م . س : ج١:ص١٣٩.

(٤) ساریە کوری زنیم: ناوی ساریە کوری زنیم کوری عمرو کوری جابر، لە سالی(٢٣ك) مرد.ابن الاثیر:اسد الغابة فی معرفة الصحابة،ج٢،ص٣٦٤.

(٥٧) الطبري : م . س : ج٢، ص٦٤٠ " إبن الأثير :م . س : ج٢، ص٤٤١-٤٤٢" إبن كثير :م . س : ج٧: ص١٠٧ .

(١) الطبري : م. س : ج٢: ص٦٤٣ " إبن الأثير : م . س : ج٢: ص٤٤٤ " إبن كثير : م . س : ج٧: ص١٠٧ .

(٥٩) الطبری:م.س،ج٢،ص٦٤٤"ابن كثير : م . س : ج٧:ص١٠٧ " أحمد بن زيني دحلان : م . س : ج١:ص١٤٢ " علي محمد محمد الصلابي : فصل الخطاب في سيرة أمير المؤمنين عمر بن الخطاب : ط١ : (القاهرة : د . ت ) : ص١٧٢ .

(٦٠) البداية والنهاية : م . س :ج٧:ص١٠٧.

(٦١) سەلمە کوڕی قەیس ئەلئەشجەعی : یەکێك بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر ( د. خ ) کە لەساڵی ٢٣ك بە فەرمانی خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب شاڵاوی هێنایە سەر کوردەکان . إبن سعد : الطبقات الکبری " ج٦:ص٣٢ .

(٦٢) الطبري : م . س : ج٢: ص٦٤٥ " إبن الأثير :م . س : ج٢، ص٤٤٥ " إبن کثير : ج٧، ص١٠٧ " أحمد بن زيني دحلان : م. س :ج١،ص١٤٣ .

(٦٣) الطبري : م . س : ج٢: ص٦٤٥" إبن الأثير : م . س : ج٢: ص٤٤٥،٤٤٦" إبن کثير : م . س : ج٧، ص١٠٧،١٠٨ ".

(٦٤) الطبري : م . س : ج٢: ص٦٤٥" إبن الأثير :م . س : ج٢: ص٤٤٥،٤٤٦ " إبن کثير : م. س : ج٧: ص١٠٧،١٠٨ .

(٦٥) خەوارج : هەر دەرچوویێك کە دەرچووبێت لە ئیمامی حەق ، ئەو ئیمامە حەقەی کە بەکۆمەڵ ڕێکەوتبن لەسەری ئەوا ئەو دەرچووە ، کەسە پێ ی دەوترێت خارجی ، دەرچوو ،جا ئەم دەرچوونە چ لە ڕۆژگاری هاوەڵانی پێغەمبەر (د.خ ) بووبێت بەسەر ئیمامەکانی ڕاشدین ، چ لە دوای ئەوان بووبێت ،شوێن کەووتوان یاخود ئیمامەت و پێشڕەوایەتی لە هەموو سەردەم وکاتێك دا،خەوارجەکان ئەنجامدەری گوناهە گەورەکانیان بە کافر دەزانی، وە تەکفیری خەلیفە عوسمان و ئیمامی عەلی و هاوەڵانی(الجمل) و هەموو ئەوانەی کە ڕازی بوون بە(تحکيم) دەکرد، وە ئەگەر ئیمام سەرپێچی سوننەی کرد و ستەمکار بوو ئەوا دەرچوون لێیان بە مافێکی واجب دەزانی، جەختیان لەسەر ئەوەش کردەوە کە دەشێ ئیمام و پێشەوای موسڵمانان غەیرە قورەیشی بێت. الشهرستاني : الملل و النحل . قدم له و علق على حواشيه : صلاح الدين الهواري : ط١ :( بيروت :١٩٩٨) : ج١: ص١٣٠،١٢٩.

(٦٦) الدينوري :م . س : ص١٩٣،١٩٢"الطبري : م .س :ج٣، ص١٤٣ " المسعودي : التنبيه و الأشراف : (بيروت :١٩٨١م ): ص٢٧٢،٢٧٣ "إبن الطقطقي : الفخري في آداب السلطانية : ص٨٤ " الذهبي :م. س ، ج١، ص٤٤ " ابن کثير : م. س :ج٧،ص٢٥٨ .

(٦٧) حروراء:گوندێکە لە دەرەوەی کوفە،دەشگوترێت شوێنێك بوو کە خەوارجەکان(ئەوانەی کە سەرپێچی خەلیفە عەلی کوڕی ئەبو طالبيان کرد) لە دووری دوو میل لێیەوە دابەزین.(یاقوت:معجم البلدان،ج٢،ص٢٤٥).

(٦٨) الشهرستاني : م . س ، ج١،ص١٣١.

(٦٩) خليفة بن خياط : م . س : القسم الأول ، ص٢٢٤ "إبن عبدربه : العقد الفريد : تحقيق : محمد التونجي : ط١ : (بيروت : ٢٠٠١ م ) : ج٢، ص٣٢٩ " الشهرستاني :م . س : ج١، ص١٣٠" إبن المبرد : م . س، ص٢٩ " السيوطي :م . س :ص١٥٥،١٥٦ " لبيد إبراهيم و فاروق عمر : عصر النبوة و الخلافة الراشدة : ( أربيل : ١٩٨٧ م ) : ص٣٥٣،٣٥٤ .

(٧٠) اليافعي : مرآة الجنان و عبرة اليقظان : ج١، ص٨٧ .

(٧١) عبالله کوڕی وهب: کەسێکی خاوەن زانست و بە متمانە بوو ، لە ڕووداوی نەهرەوان لەساڵی(٣٨ك/٦٥٨ز) کوژرا.ابن سعد:الطبقات الكبرى،ج٧،ص٥١٨.

(٧٢) خليفة بن خياط : م . س ،القسم الأول : ص٢٢٤،٢٢٥" الكنجي الشافعي : كفاية الطالب في مناقب علي بن أبي طالب : تحقيق : محمد هادي الأميني : ط٢ :(النجف : ١٩٧٠م ) : ص١٨٠ " الذهبي : العبر : ج١، ص٤٤ " إبن المبرد : الكامل : ص٢٩ .

(٧٣) خليفة بن خياط :م. س : القسم الأول : ص٢٢٥ " محمد بكر اسماعيل : فقيه الأمة و مرجع الأئمة علي بن أبي طالب : ر . ض : ط١ : قاهرة : مصر :ص٤٧٩ .

(٧٤) العلوج : ئەم زاراوەیە لەوشەی (علج) یاخود ( العلج) هاتووە کە بەمانای پیاوی توند و ڕقن و تووڕە دێت و هەروەها العلج واتە پیاوێك لە کافرەکانی عەجەم ، و العلج : واتە کافر و بەپیاوێکی بەهێزی کەتە دەوترێت لە کافرەکان و بەمانای العلج یش دێت واتە پیاوێك لە کافرەکانی عەجەم و ئەوانی تر ، العلج : بەمانای کەری کێویش دێت لەبەر بەهێزی ڕسکانی جەستەیی و تورەبوونی و ڕقنی ، علج : بەمانای هەموو پتەوێکی توندو تیژدێت .( إبن منظور : لسان العرب :ط٣ : (بيروت : ٢٠٠٤م ) : ج١٠: ص٢٤٨.

(٧٥) الطبري:م.س،ج٣،ص١٦٤"ابن كثير:م.س،ج٧،ص٢٥٩،٢٥٨.

(٧٦) الطبري:م،س،ج٣،ص١٧٢.

(٧٧) لەبارەی فەتح کردنی هەرێمی جەزیرە ڕاجیاوازی هەیە بۆنموونە البلازري دەڵێت جەزیرە لە ساڵی (١٨ك)فەتح کراوە.البلازري:م.س،ص١٧٦ "بەڵام اليعقوبي دەڵێت لەساڵی (١٨ك)فەتح کراوە.اليعقوبي:تاريخ اليعقوبي،ج٢،ص١٥٠.

[٧٨] الطبری :م.س ،ج٢،ص٥٦٢ " إبن الاثیر:م.س:ج٢،ص٣٧٧" ابن کثیر:م.س،ج٧،ص٦١" ابن المبرد : م.س :ص٤٥٠ " عبد الواحد ذنون طه :دراسات في التاریخ و الحضارة:ط١ :(بیروت :٢٠٠٥م) :ص٢٠٥ " السید عبد العزیز سالم و سحر السید عبدالعزیز سالم :م.س :ص٢٤٤" الشیخ محمد الخضري:الدولة الامویة:ص٢٠٢ " محمد رضا:الخلفاء الراشدون :(بیروت :٢٠٠٥م ) ص١٨٩.

[٧٩] عیاض کوڕی غنم : ناوی عیاچ کوڕی غنم زهیر کوڕی أبی شەداد کوڕی ربیعە کوڕی هلال فهویە ؛ لە سەردەمێکی زووەوەلە پێش ڕێکەوتننامەی حودەیبیە موسڵمان بوو و بەشداری ڕێکەوتننامەی حودەیبیەی کرد لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ)، پیاوێکی باش و لە خوا ترس و بەخشندە بوو و جەزیرەی بەئاشتی فەتح کرد دواتر خەلیفە عومەر لە شام کردیە والی دوای دوو ساڵ والێتی لەساڵی ٢٠ك لە تەمەنی شەست ساڵی لە شام مرد. ابن سعد: الطبقات الکبری ، ج٧،ص٣٩٨.

[٨٠] الطبري : م . س : ج٢، ص٥٦٣،٥٦٤ " إبن الأثیر : م . س : ج٢، ص٣٧٧" إبن کثیر :م . س : ج٧- ص٦١،٦٢ " أحمد بن زیني دحلان : م . س ،ج١، ص٥٧ " محمد رضا : م. س : ص١٨٩ .

[٨١] الطبري : م . س : ج٢، ص٥٦٣،٥٦٤ " إبن الأثیر :م . س : ج٢، ص٣٧٧" إبن کثیر :م . س : ج٧،ص٦١،٦٢ " أحمد بن زیني دحلان :م . س ، ج١، ص٥٧ " محمد رضا :م . س : ص١٨٩ .

[٨٢] الطبري :م . س : ج٢، ص٥٦٤ " ابن الأثیر : م . س : ج٢، ص٣٧٩،٣٨٠ " إبن کثیر :م . س : ج٧، ص٦١،٦٢ " أحمد بن زیني دحلان : م . س ، ج١، ص٥٧،٥٨ " محمد رضا : م . س : ص١٨٩،١٩٠ .

[٨٣] فتوح البلدان : ص١٧٢ " إبن الأثیر : م. س :ص٣٧٧ " إبن کثیر : م . س : ج٧، ص٦١،٦٢ " محمد رضا :م . س : ص١٨٩،١٩٠.

[٨٤] فتوح البلدان : ص١٧٥ .

[٨٥] تأریخ الیعقوبي : ج٢: ص١٥٠.

[٨٦] تاریخ الطبری: ج٢، ص٥٦٥ " إبن الأثیر :م . س : ج٢:ص٣٧٧ " أحمد بن زیني دحلان : م . س : ج١،ص٥٧ " محمد رضا : م . س : ص١٩٠ .

[٨٧] حبیب کوڕی مسلمة : ناوی حبیب کوڕی مسلمة کوڕی مالك کوڕی وهب کوڕی ثعلبة ، القرشي ، الفهري بوو پێشی دەوترا حبیب الروم لەبەر زۆری جیهاد کردنی دژ بەڕۆمەکان و نازناوی (باوکی

عبدالرحمن)بوو خەلیفە (عمر کوری خطاب) پایەی والی کاروباری جەزیرەی دایەو (عیاض کوری غنم) ی لەوێ لاداو لەدواتردائەرمینیاو ئازەربیجانیشی خستە ژێر دەسەلاتی حبیب ، لەساڵی ٤٢ك لەشام مرد و دەشگوترێت لەئەرمینیا .( الصفدي : م .س : ج١١،ص٢٢٢).

(٨٨) وەلید کوری عقبە: ناوی وەلید کوری عقبە کوری ابو معیط کوری ابو عمرو کوری امیە کوری عبد الشمس کوری عبدالمناف،نازناوی (ابا وهب)بوو،دایکی ناوی(اروی کچی کریز ربیعە کوری حبیب کوری عبد الشمس کوری عبدالمناف ، وەلید لە کوفە دەرچوو وەك دوورە پەرێز گرتنێك لە خەلیفە عەلی ،دواتر لە جەزیرە دابەزی و دواتر چووە (الرقە) و لەوێدا مرد.(ابن سعد:م.س:ج٧،ص٤٧٧.

(٨٩) الطبري : م. س : ج٢، ص٥٦٥ " إبن الأثير : م . س : ج٢،ص٣٧٨ .

(٩٠) اليعقوبي:تاريخ اليعقوبي،ج٢،ص١٥٦"الطبري : م. س : ج٢، ص٦٢٠" القضاعي : تأريخ القضاعي :تحقيق:أحمد فريد مزيدي : ط١:(بيروت:٢٠٠٤م) :ص٨٩" إبن الجوزي : الخليفة العادل عمر بن الخطاب : ص٦٦ " أبو الفداء: م. س : ج١، ص٢٢٩ " اليافعي :م . س : ج١،ص٦٦ " ابن الأثير :م . س : ج٢، ص٤٢٩ .إبن المبرد : محض الصواب : ص٤٥٢ " السيوطي : م . س : ص١٢٠ " الحنبلي : م.س : ج١، ص٣٢ " الشيخ الخضري : الدولة الأموية : ص٢٠٧ " حسن إبراهيم حسن : تأريخ الاسلام : ط٧ : (بيروت :١٩٦٤م ) :ج١– ص٢٢٠ .

(٩١) سماك کوری خرشە : ناوی سماك کوری أوس کوری خرشە کوری لوزان کە پێشی دەوترێت (باوکی دجانة الأتصاري ) لەگەورە پیاوانی الانصار بوو بەشداری شەری بەدری کردو یەکێ لەجەنگاوەرە ئازاکانی بوو ، و لەشەری (أحد ) بەرگری لەپێغەمبەر (د . خ ) کرد لەرووداوی (اليمامة ) شەهید بوو و دەشگوترێت کە ئەو لەگەڵ خەلیفە عەلی لەشەری (صفين ) لەساڵی ٣٧ك شەهید بوو . (الصفدي : م .س : ج١٥، ص٢٧٤) .

(٩٢) الطبري : م. س : ج٢، ص٦٢٥ " إبن الأثير :م . س : ج٢، ص٤٢٩ " ابن كثير : م . س : ج٧،ص٩٩ " أحمد بن زيني دحلان :م . س : ج١، ص١٣١،١٣٢ " محمد رضا : م . س : ص٢٤٧ .

(٩٣) عتبةکوری فرقد : ناوی يربوع کوری حبيب کوری مالك کوری أسعده کوری بهپە کوری سليم کوری مەنصورە ، هاوەڵی پێغەمبەر ( د .خ ) بوو ،مرۆڤێکی باش بوو کاتێ کە لە کوفە دابەزی پێ

یان دەووت ( الفراقدة ) . خەلیفەعومەری کوڕی خەتاب ڕێزی زۆر لە (عتبة کوری فرقد) دەگرت و خۆشیدەویست ،لەساڵی٢٤ك مرد.إبن سعد : الطبقات الکبری : ج٦: ص٤١.

(٩٤) الطبري : م. س : ج٢، ص٦٢٥ " أبن الأثير : م . س : ج٢: ص٤٢٩ " إبن کثير : م،س : ج٧: ص٩٩.

(٩٥) الطبري : م . س : ج٢: ص٦٢٥،٦٢٦ .

(٩٦) نفسة : ج٢:ص٦٢٦ .

(٩٧) الشيز : شارێکە لەنێوان مراغە و زنجان و شهرەزوور و دینەوەر لەنێوان چیاکان . دەشگوترێت ناحیەیەکە لە ئازەر بیجان وکانزای زۆری لێبووە وەکو زێرو زیو و بەرد،پەرستگای زەردەشتی لێیە . ( یاقوت: معجم البلدان : ج٣،ص٣٨٣ ) .

(٩٨) فتوح البلدان : ص٣١٧ .

(٩٩) نفسة : ص٣١٨ .

(١٠٠) باب الابواب: یەکێکە لە شارەکانی نێو هەرێمی ئاران، دەکەوێتە سەر دەریای خەزەر. إبن حوقل: م.س، ص٢٩١"المقدسي: م.س، ص٢٨١.

(٢) سراقة کوڕی عمرو: نازناوی (ذا النور)بوو، لەلایەن خەلیفە عومەرەوە بۆ(الباب) نێردرا بەمەبەستی فەتح کردنی دواتر ئاشتی و پێکهاتنی بەست لەگەڵ خەڵکی ئەرمینیا، لەم بارەیەوە بۆ خەلیفە عومەری نووسی و هەر لەوێدا لە ساڵی(٣٢ك) مرد.ابن الاثير:اسد الغابة فی معرفة الصحابة،ج٢،ص٣٩٤.

(١٠٢) الطبري :م. س : ج٢: ص٦٢٧ .

(١٠٣) تفليس:شارێکە لە ئەرمینیا،هەندێك دەڵێن لە ئارانە،سەر بە ناحیەی (جرزان)ە،نزیك(باب الابواب)خەڵکەکەی موسڵمان و نەصرانین.(یاقوت الحموی،معجم البلدان،ج٢،ص٣٥ "القزويني:م.س:ص٥١٨).

(١٠٤) حژیفە کوڕی اسید: کوڕی خالد کوڕی الاغور کوڕی واقعە کوڕی حرام کوڕی غفار،لە کوفە مرد لە ساڵی(٢٤ك).ابن الاثير:اسد الغابة،ج١،ص٥٧٠.

(١٠٥) اللان:وولاَتێکی فراوانە لەلایەنی ئەرمینیاوە،نزیك(باب الابواب)ە،هاوسنوری خەزەرە.(یاقوت الحموی:معجم البلدان،ج٥:ص٨.

(١٠٦) سەلمان کوڕی ربیعه الباهلی،تابعی بوو،بەشداری شەڕی قادسیەی کرد، خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب(خوای لێ ڕازی بێت) کاروباری(قضاء)(المدائن)ی بەو سپارد،دواتر خەلیفە عومەر لەم پۆستە لایداو ئەویش دەرچوو بەمەبەستی شالآو کردنە سەر تورك،تا لە ئاكامداله ساڵی(٣٠ك)لە بلنجر شەهید بوو.(الخطیب البغدادی:م.س،ج٩،ص٢٠٧،٢٠٦).

(١٠٧) الطبري :م. ن: ج٢: ص٦٢٧ .

(١٠٨) احمد بن الاعثم الكوفی:كتاب الفتوح: ج٢: ص٦٢٧،٦٢٨ .

(١٠٩) كتاب الفتوح : ج٢: ص١١١،١١٢ .

(١١٠) نفسة : ج٢:ص١١٢،١١٣ .

(١١١) نفسة:ج٢: ص١١٣،١١٤ .

(١١٢) الطبري : م. س : ج٢، ص٦٨٣ " إبن الأثير : م . س : ج٢، ص٤٧٧،٤٧٨ " إبن كثير : م . س : ج٧،ص١٢١ " أحمد بن زيني دحلان : م . س : ج١، ص١٤٥.

(١١٣) الطبري:ج٢،ص٦٨٣ " إبن الأثير : م . س : ج٢،ص٤٧٧،٤٧٨ " إبن كثير : م . س : ج٢،ص١٢١ " محمد رضا : م . س : ص٢٨٦.

(١١٤) الطبري : ج٢،ص٦٨٣،٦٨٤ "إبن الأثير :م . س : ج٢، ص٤٧٧،٤٧٨ .

(١١٥) الطبري: ج٢، ص٦٨٤،٦٨٥ .

(١١٦) الطبري : م . س : ج٢، ص٦٨٤ " إبن الأثير :م . س : ج٢، ص٤٧٨ " إبن كثير : م.س : ج٧، ص١٢١ .

## سەرچاوەکان

### یەکەم: سەرچاوە ڕەسەنەکان:

### بەزمانی عەرەبی:

إبن الأثير: عزالدين ابي الحسن علي بن ابي الكرم محمد بن محمد بن عبدالكريم بن عبد الواحد الشيباني (ت: ٦٣٠ه/١٢٣٢م).

– أسد الغابة في معرفة الصحابة: دار احياء التراث العربى، ط١، (بيروت: ١٩٩٦م).

– الكامل في التأريخ: دار صادر، ط٤، (بيروت: ٢٠٠٣م)

ابن الأعثم: ابو محمد احمد بن اعثم الكوفى (ت: ٣١٤ه/٩٢٦م).

– كتاب الفتوح: دار الندوة الجديدة، ط١ (بيروت: ١٩٢٦م).

البغدادي: أبو منصور عبدالقاهر بن طاهر بن محمد (ت: ٤٢٩ه/١٠٣٧م)

– الفرق بين الفرق، تحقيق: محمد محي الدين عبدالحميد، دار الطلائع، ط١،(القاهرة: ٢٠٠٥م).

البكجري الحنفي: علاء الدين مغلطاي بن قلنج بن عبدالله (ت: ٧٦٢ه/١٣٦٠م)

– مختصر تأريخ الخلفاء ،تحقيق: اسيا كليبان علي بارح، المطبعة العصرية، ط١ (بيروت: ٢٠٠٤م).

البلاذري: احمد بن يحيى بن جابر (ت: ٢٧٩ه/٨٩٢م).

–انساب الاشراف:تحقيق،سهيل زكار و رياض زركلى،دار الفكر للطباعةوالنشر،ط١،(دمشق:١٩٩٦م).

– فتوح البلدان: بإشراف لجنة تحقيق التراث: منشورات مكتبة الهلال: ط١ (بيروت:١٩٨٣م).

البلخي: أبو زيد أحمد بن سهل (ت: ٣٢٢ه/٩٣٣م).

– البدء و التأريخ، دار الكتب العلمية، ط١ (بيروت: ١٩٩٧م).

إبن الجزري الشافعي: شمس الدين ابي الخير محمد بن محمد بن علي الدمشقي الشافعي: (ت: ٨٣٣ه/١٤٢٩م).

– غاية النهاية في طبقات القراء: دار الكتب العلمية: ط١ (بيروت: ١٩٣٢م).

إبن الجوزي: تاج السنة جمال الدين أبي الفرج عبدالرحمن بن علي ( ت: ٥٩٧ه/١٢٠٠م)

– الخليفة العادل عمر بن خطاب: دار اسراء، ط١، (عمان: ٢٠٠٤م).

الحنبلي: أبو الفلاح عبدالحي بن العماد (ت: ١٠٨٩ه/١٦٧٨م)

– شذرات الذهب في اخبار من ذهب، دار الكتب العلمية، ط١، (بيروت: د.ت).

ابن حوقل: أبو القاسم محمد بن علي النصيبي (ت: ٣٦٧ه/٩٧٧م).

– كتاب صورة الأرض، منشورات دار مكتبة الحياة (بيروت: ١٩٧٩م).

الخطيب البغدادي : أبو بكر أحمد بن علي ( ت : ٤٦٣ ه / ١٠٧٠ م ) .

– تأريخ بغداد أو مدينة السلام، دار الكتب العربي للنشر، ط١، (بيروت: د.ت).

خليفة بن خياط: أبو عمر وخليفة بن خياط بن أبي هبيرة (ت: ٢٤٠ ه/ ٨٥٤م).

– تأريخ خليفة بن خياط، تحقيق: سهيل زكار: منشورات وزارة الثقافة و السياحة والارشاد القومي، ط٢، (دمشق: ١٩٦٨م).

الدينوري: ابو حنيفة احمد بن داود (ت: ٢٨٢ه/٨٩٥م)

– الاخبار الطوال: تحقيق: عبدالمنعم عامر: منشورات وزارة الثقافة والارشاد القومي، ط١، (القاهرة: د.ت).

الذهبي: شمس الدين محمد بن أحمد بن عثمان بن قايماز التركماني (ت: ٧٤٨ه/١٣٤٧م).

– تأريخ الاسلام ووفيات المشاهير والاعلام: تحقيق :عمر عبدالسلام تدمري ،دار الكتاب العربي،ط٣ (بيروت:٢٠٠٢م).

– العبر في خبر من غبر،تحقيق: د.صلاح الدين المنجد، التراث العربي سلسلة تصدرها دائرة المطبوعات والنشر في الكويت، ط٢، (الكويت: ١٩٦٠م).

- سير أعلام النبلاء: ج١:تحقيق: حسين الأسد، مؤسسة الرسالة، ط١ (بيروت: ١٩٨١م)، ج٢: تحقيق: شعيب الأرنؤوط: مؤسسة الرسالة، ط١ (بيروت: ١٩٨١م)،ج٣: تحقيق: محمد نعيم العرقسوسي ومأمون صاغرجي: مؤسسة الرسالة، ط١ (د.م: ١٩٨١م)،ج٩:تحقيق: كامل الخراط: مؤسسة الرسالة، ط١ (بيروت :١٩٨١م) ،ج٧:تحقيق:علي ابو زيد: مؤسسة الرسالة،ط١ (بيروت: ١٩٨١م).

الرازي: ابوحاتم احمد بن حمدان احمد (ت:٣٢٢ه/٩٣٤م).

-مختار الصحاح،دار الكتاب العربي: ط١ (بيروت: ١٩٧٩م).

ابن سعد: محمد بن سعد الزهري: (ت: ٢٣٠ه/٨٤٤م).

- الطبقات الكبرى: تحقيق: إحسان عباس، دار صادر للطباعة والنشر، ط١، (بيروت: ١٩٨٠م).

السيوطي: جلال الدين عبدالرحمن بن أبي بكر (ت: ٩١١ه/١٥٠٥م).

- تأريخ الخلفاء: تحقيق: محمود الرياض الحلبي، دار المعرفة، ط٦ (بيروت: ٢٠٠٤م).

الشهرستاني: ابو الفتح محمد بن عبدالكريم: (ت: ٥٤٨ ه/١٠٥٣م).

-الملل والنحل: تحقيق: د.صلاح الدين الهواري: دار الهلال: ط١ (بيروت: ١٩٨٨م).

الصفدي: صلاح الدين خليل بن ابيك: (ت: ٧٦٤ه/١٣٦٢م).

- الوافي بالوفيات: تحقيق: أحمد الأرنؤوط و تركي مصطفى: دار أحياء التراث العربي: ط١، (بيروت: ٢٠٠٠م).

الطبري: ابو جعفر محمد بن جرير: (ت: ٣١٠ ه /٩٢٢ م).

- تأريخ الأمم والملوك: تحقيق: مصطفى السيد وطارق سالم، مطبعة التوفيقية: (القاهرة: د.ت).

– تفسير الطبري: تحقيق: بشار عواد معروف وعصام فارس الحرستاني: مؤسسة الرسالة للطباعة والنشر والتوزيع: ط١ (بيروت: ٢٠٠٢ م).

إبن الطقطقي: محمد بن علي بن طباطبا (ت: ٧٠٩ ه /١٣٠٩م).

– الفخري في الاداب السلطانية والدول الاسلامية: مطبعة المعارف: ط٢ (القاهرة: د.ت ).

ابن عبد ربة: ابو عمر احمد بن محمد الاندلسي(ت٣٢٨ ه/٩٣٩م)

– العقد الفريد:تحقيق: د.محمد التونجي: دار صادر، ط١ (بيروت:٢٠٠١م).

العسقلاني: احمد بن علي بن محمد بن علي الكتاني العسقلاني الشافعي المعروف بابن حجر (ت: ٨٥٢ه/١٤٤٨م)

– الاصابة في تميز الصحابة: اعتنى بة/حسان عبد المنان: دار الافكار الدولية: (بيروت: ٢٠٠٤م).

ابو الفداء: الملك المؤيد عمادالدين ابو الفداء إسماعيل بن علي بن محمود إبن عمر بن شاهنشاه بن أيوب (ت:٧٣٢ ه/١٣٣١م).

– المختصر في أخبار البشر: دار الكتب العلمية: ط١ (بيروت: ١٩٩٧م).

القزويني: إبو عبدالله زكريا بن محمد (ت: ٦٨٢ه/١٢٨٣م).

– أثار البلاد وأخبار العباد، دار صادر،( بيروت: ١٩٦٠م).

القضاعي: أبو عبدالله بن محمد بن سلامة بن جعفر (ت: ٤٥٤ ه/١٠٦٢م).

– تأريخ ابن القضاعي المسمي عيون المعارف وفنون أخبار الخلائف،تحقيق: أحمد فريد المزيدي، دار الكتب العلمية، ط١ (بيروت :٢٠٠٤م ) .

القلقشندي: إبو العباس احمد بن علي (ت: ٨٢١ ه/ ١٤١٨م).

– مآثر الانافة في معالم الخلافة، تحقيق: عبدالستار أحمد فراح ،دار عالم الكتب،ط٢، (بيروت: ١٩٨٠م).

إبن كثير: عمادالدين أبو الفداء إسماعيل بن كثير الدمشقي (ت: ٧٧٤ هـ/١٣٧٢م).

– البداية والنهاية: دار البيان الحديثة: ط١،(القاهرة: ٢٠٠٣م).

الكنجى الشافعى: أبو عبداللة محمد بن يوسف بن محمد القرشى: (٦٥٨هـ/١٢٦٠م)

كفاية الطالب فى مناقب على بن ابى طالب:تحقيق:محمدهادى الامينى: المطبعةالحيدرية، ط٢، (النجف:١٩٧٠م).

ابن المبرد: يوسف بن الحسن بن عبد الهادي الدمشقي الصالحي الحملي: (٩٠٩ هـ/١٥٠٣م).

–محض الصواب في فضائل امير المؤمنين عمر بن الخطاب: تحقيق: عبدالعزيز بن محمدبن عبدالمحسن الفريح: دار اضواء،ط١: (المدينة المنورة: ٢٠٠٠م).

المسعودي: ابو الحسن علي بن الحسين (ت:٣٤٦ هـ/٩٥٧م).

– مروج الذهب ومعادن الجوهر: شركة العالمية لكتاب، ط٢ (بيروت: ١٩٨٩م).

– التنبيه والاشراف، دار ومكتبة الهلال (بيروت: ١٩٨١م).

المقدسي: شمس الدين ابو عبدالله محمد بن أحمد بن ابي بكر ، (ت: ٣٨٧ هـ/٩٩٧م).

– أحسن التقاسيم في معرفة الأقاليم، دار الكتب العلمية،ط١ (بيروت: ٢٠٠٣ م).

ابن منظور: أبو فضل جمال الدين محمد بن مكرم الأفريقي المصري (ت:٧١١ هـ/١٣١١م).

– لسان العرب، دار صادر: ط٣،(بيروت: ٢٠٠٤م).

ابن الوردى: زين عمر بن مظفرات (ت: ٧٤٩هـ/١٣٤٨م).

– تاريخ ابن الوردى: دار الكتب العلمية: ط١(بيروت :١٩٩٦م) .

اليافعى: ابو عبداللة بن اسعد بن على بن سليمان اليافعي اليمني المكي (ت:٧٦٨هـ/١٣٦٦م).

–مراة الجنان وعبرة اليقظان في معرفة مايعتبر من حوادث الزمان،منشورات محمد علي بيضون،دار الكتب العلمية،ط١(بيروت: ١٩٩٧م).

ياقوت الحموي: شهاب الدين ابو عبدالله الحموي الرومي البغدادي (ت:٦٢٦ه/١٢٢٩م) .

– معجم البلدان ،دار صادر، ط٢(بيروت: د.ت).

اليعقوبي: احمد بن ابي يعقوب بن جعفر بن وهب ابن واضح (ت: ٢٩٢ه/٩٠٥م).

– تاريخ اليعقوبي، دار صادر (بيروت: ١٩٦٠م).

سەرچاوە نوێیەکان و وەرگێڕان:

* بەزمانی عەرەبی:

أرثر كريستنسن:

– إيران في العهد الساساني: ترجمة يحيى الخشاب: دار النهضة (بيروت:د.ت).

احمد بن زيني دحلان:

– الفتوحات الاسلامية: دار صادر ،ط١: (بيروت:١٩٩٧م).

أحمد شلبي: الدكتور

– موسوعة التأريخ الاسلامي: دار يافا العلمية للنشر والتوزيع: (عمان:٢٠٠٣م).

أكرم ضياء العمري: الدكتور

– عصر الخلافة الراشدة: مكتبة البيكان: ط٢ (الرياض: ١٩٩٨م).

بطرس البستاني:

–محيط المحيط: مكتبة لبنان/ساحة رياض الصلح: طبع في لبنان، (بيروت: ١٩٨٧م).

حسن ابراهيم حسن: الدكتور

– تاريخ الاسلام: دار احياء التراث العربي: ط٧(بيروت:١٩٦٤م).

السيد عبدالعزيز سالم و سحر السيد عبدالعزيز سالم: الدكتور

- معالم التاريخ الاسلامي: مؤسسة شباب الجامعة،(الاسكندرية: ٢٠٠٤م).
السيد عبدالعزيز سالم: الدكتور
- تاريخ الدولة العربية: مؤسسة شباب الجامعة: (الأسكندرية: ٢٠٠٤ م).
عبدالجبار ناجي و تحسين حميد وعماد إسماعيل و صلاح عبد الهادي: الدكتور
- الدولة العربية في العصر العباسي: مطبعة جامعة البصرة(البصرة :١٩٨٩م).
عبد الحميد بخيت: الدكتور
- عصر الخلفاء الراشدين: دار المعارف بمصر ،ط٢،(القاهرة: ١٩٦٥م).
- نشاة علم التاريخ عند العرب: دار المشرق شام،جميع الحقوق محفوظة: (بيروت: ١٩٨٦م).
عبد علي ياسين: الدكتور
- تاريخ صدر الاسلام: دار يافا العلمية للنشر والتوزيع: (عمان: ٢٠٠٣م).
عبدالواحد ذ نون طه: الدكتور
- دراسات في التأريخ والحضارة: دار المدى الاسلامي،ط١ (بيروت: ٢٠٠٥م).
عماد الدين خليل عمر: الدكتور
- في التاريخ الاسلامي: دار ابن كثير،للطباعة والنشر والتوزيع: ط١(بيروت: ٢٠٠٥م).
عمر حسن: الدكتور
- موسوعة التأريخ الاسلامي (عصر الخلفاء الراشدين): دار اليوسف للطباعة والنشر والتوزيع: (بيروت: د.ت).
-محاضرات في تأريخ الدولة العربية الاسلامية مطبعة مركز الاسكندرية للكتاب،(الاسكندرية: ٢٠٠٦م).
لازاريف وأخرون:

– تأريخ كوردستان: ترجمة: د.عبدي حاجي، دار سبيريز للطباعة والنشر: ط١ (دهوك: ٢٠٠٦م).

لبيد إبراهيم و فاروق عمر: الدكتور

– عصر النبوة والخلافة الراشدة: مطبعة جامعة صلاح الدين ( أربيل: ١٩٨٧م).

محمد حسين محاسنةوعصام عبدالعزيز أرشيدات و حمدان رشيد جمال و علي حسن البرقاوي:

– دراسات في التأريخ الأسلامي: دار الأمل للنشر والتوزيع: ط١ (الاردن: ١٩٩٠م).

٥٠٠م).

محمد رضا:

– الخلفاء الراشدون: دار الكتاب العربي ( بيروت: ٢٠٠٥م).

*بەزمانی فارسی:

– ارثر كريستنسن: ايران در زمان ساسانيان: ترجمة رشيد ياسمي ويرا ستار ود.حسن رضايي باغ بيدى: ضاث سوم: ضاث خانةم مهارت:(تهران: ١٣٨٢ه).

– ساندرامك كي،ايران: اسلام وروح يك ملت: ترجمة شيوا رويطريان: ضاث اول انتشارات ققنوس: (تهران:١٣٨٠ه).

*بەزمانی ئینگلیزی:

-Francesco Gabrieli: A short History of the ARABS .Translated by: Salvator Attansio and Robert Hale: first published :( Great Britain: ١٩٦٥).

# دەربارەی سەرهەڵدانی هزری ناسیۆنالیزم

د. حكيم أحمد

ناسیۆنالیزم بەمانا تازەکەی و لە ڕێڕەوی مێژووی مرۆڤایەتی بە ئەوروپاوە پەیوەستە، چونکە گوزارشتێکی سیاسیە بۆ گەلاڵەبوونی نەتەوە ئەوروپیەکان و هەروەها دامەزراندنی دەوڵەتەکانیان. هزری ناسیۆنالیستی لە ئەوروپا بێنە وبەردەیەکی گەورەی لە نێوەندەکانی هزرمەندە ڕۆژئاواییەکان نایەوە، و بۆ چەند بەشێك پۆلێن کرا وەك: ناسیۆنالیزمی خێر و ناسیۆنالیزمی شەڕ...هتد. لەلایەکی تریشەوە بە چەند ئاراستەیەکدا گەشەی سەند، ئەوەبوو جارێك بە دیموکراسیەوە گرێدراوە، جارێکی تریش بە نیشتمانییەوە، جارێکی تریش بە بیرۆکەی (نەتەوە)ەوە. تەنانەت کۆمەڵناسی ناودار جان جاك ڕۆسۆ لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەم، بە هەمان دید دەیڕوانیە ناسیۆنالیزم ونەتەوەگەری بێ جیاوازی. ئەمە پێش ئەوەی زاراوەی ناسیۆنالیزم وەك بەکارهێنانێکی توند وتۆڵ بێتە ئاراوە.

ڕۆسۆ بەشێوەیەك ڕەوتی نیشتمانێتی ناسیووە کە گونجاندوویەتی لەگەڵ ئاکاری ڕەوشتی، مەبەست لە چالاکی سیاسی و یاساکەی لە تیۆرەکەیدا بە گەورە زانینی دەوڵەت نەبووە، بەڵکو میللەت بووە، بەم شێوەیە ویستی گشتی دیاریدەکات.

ناسیۆنالیزمی سەردەمی ڕۆشنگەرایی بەگشتی عەقڵانی بوو زیاتر لەوەی سۆزداری پێوە دیار بێت. سەرەڕای بەرزیی دەنگی (نیشتمانی)ی ڕۆسۆ.

بەڵام جۆرێکی تر لە ناسیۆنالیزم لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم سەریهەڵدا، کە لەسەر بناغەیەك لە کولتوور و داب ونەریتەکان دامەزرا و لە هەمان کاتدا هزر و بۆچوونی ڕۆسۆشی چووە ناوەوە، ئەوە بوو ڕۆسۆ توانی گەشە بدات بە هاودژی لەنێوان سەرەتایی (بەرایی) و دروستکراو (البدائي والمصطنع) کەچی پێشینەی زیاتری بە یەکەمیان دا. ئەم بیرۆکەیەش هەڵقوڵزرایەوە ولەسەر دەستی ناسیۆنالیستە ڕۆمانتیکە ئەڵمانە بەراییەکانی وەك: هێردر وفیختە، بەسەر نەتەوەدا جێ بەجێ کرا. ئەوانە پێیان وابوو کە نەتەوە (سروشت) دروستی کردووە، هەر بۆیەش شتێکی پیرۆزە[1].

کەواتە ئەوروپا لەسەدەی هەژدەهەم بیرۆکەی ناسیۆنالیزمی ناسیووە، و چونکە هزرە ناسیۆنالیزمیەکانی ڕۆسۆ وهێردەر وفیختە بڵاوبۆتەوە. بەڵام دیارە بیرۆکەی ناسیۆنالیزم لە ئەوروپا کتوپڕ سەریهەڵنەداوە، بەڵکو ڕەگ وریشەی دەگەڕێتەوە بۆ سێ سەدە لە سەردەمی ڕۆژئاوایی نوێ لەنێوان ساڵانی (١٥٠٠-١٨٠٠ز)، و لەماوەی شۆڕشی فەرەنسیدا پتەو وتوندو تۆڵ بوو.

بیری ناسیۆنالیزم دووچاری ڕەخنەیەکی توند بووەوە لەلایەن چەندین سیاسەتمەداری هزرمەندەوە، ووتراوە کە ئەم بیرە پێچەوانە و دژە لەگەڵ ڕەوشت چونکە هەر وەك وەسف کراوە (ئامانجێکی نێو نەتەوەیی نیە، یان ڕەگەز پەرستی یە یان نامرۆڤایەتی یە) یان ناجیهانیە، هەروەك مۆری کرانستۆن دەڵێت:

ناسیۆنالیزم ناتوانێت شێوازێکی جیهانی وەربگرێت چونکە ڕەهەندی ڕەوشتی تێدا نیە کە وادەخوزێت هەموو ئایدیۆلۆجیاکان هەیانبێت.

هەروەها باربرا وارد دەڵێت: ناسیۆنالیزم وەلامێکی تێر و تەسەلی نیە بۆکێشە وگرفتەکانی هاریکاری مرۆڤایەتی چونکە سروشتە جەوهەرییەکەی ودەخوازێت کە خەڵکانی تر لە دەرەوەی خۆی جێ بهێڵێت(٢).

هەندێکی تریش وا دەبینن کە ناسیۆنالیزم پاساوێك بووە بۆفراوانخوازی، چونکە کاتێك کە فەرەنسیەکان لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم پرەنسیپی ناسیۆنالیستیان خستە ناو سیاسەتە ئەورووپیەکانەوە، دەستیان کرد بە خەباتگێڕی لە پێناو ئەم پرەنسیپە. جەنگەکانی ناپلیۆنیش گشتیان جەنگانێك بوون لەپێناو پرەنسیپێك(٣).

برنتۆن ئەم بۆچوونە پشت ڕاست دەکاتەوە ودەڵێت: "خۆرئاوا لە لێکدانەوەی ئەم بیرۆکەیە زیادەڕۆیی بە خۆیەوەبینی کە لەم چەندین سەردەمە ناسیۆنالیستیە خۆی دەنوێنێت، کەوا کۆمەڵەیەکی ناسیۆنالیستی بۆسەروەری بەرز دەکاتەوە وکۆمەڵەیەکی تریش بۆ ئاستی کۆیلایەتی دادەبەزێنێت، یان ئەم بیرۆکەیە دەیەوێت سەراپا زەمینی نیشتەجێ بکرێت بەیەك کۆمەڵەی هەڵبژاردە، و لەناوبردنی کۆمەڵەکانی تر... دیارە حاڵەتی ئەڵمان لە بیروباوەڕی نازیەت گەیشتە ئەوپەڕی دیارترین و بەناوبانگترین شێوەی جێ بەجێ کردنی ئەم بیرۆکە ناسیۆنالیستیە(٤).

مێژوونووسی ئینگلیزیش ئارنۆڵد توێنبی پشتگیری لەم ڕایە دەکات و وا وەسفی ناسیۆنالیزم دەکات کە بریتی یە: "لەم کرمۆڵە تۆقێنەرەی ڕەوشی

سیاسی کۆمەڵگەی خۆرئاوای مۆدێرنمان ژەهراو دەکات.. ئەو ئاینێکی قەڵپ و نەخۆشە.."(٥).

بەڕاستی هەڵمەتی ڕەخنەی ئاراستە کراو بۆ هزری ناسیۆنالیستی نە لە ناوەوەی خۆرئاوا و نە لەدەرەوە کپ نەبۆوە، ئەم هەڵمەتەش لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە پەیدابونی دەوڵەتە ناسیۆنالیستەکان هۆکاری بنەڕەتی هەڵگیرسانی هەردوو جەنگی جیهانی بوو. چونکە پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکان لەنێوان دەوڵەتە ناسیۆنالیستە جیاجیاکاندا- هەروەکو نانزمور گنتاو جەختی لەسەر دەکاتەوە- لە ڕاستیدا ململانێیە لە پێناو هێز و دەسەلات لەڕێگەی بەکارهێنانی هێز لەپێناو هێزی زیاتر(٦).

سەرەڕای ئەوەش هەرچەندە هوراسدافیز لە میانەی بەرگری کردنی لە بیرۆکەی ناسیۆنالیستی، بۆچوونی مارکسیەکان و (فەوزەویەکان) وڕاسترەوەکان و ئەوانی تری ڕەت دەکردەوە ولەگەڵ ئەو بیرۆکەیە نەبوو کە دەڵێت دەوڵەتە ناسیۆنالیستەکان هۆکاری شەڕ هەڵگیرسانبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەرەنجام دان بەوەدا دەنێت "کە ناسیۆنالیزم زیاتر دیاردەیەکی هاوشانی جەنگەکانە نەك هۆکارێك بێت بۆ بەرپابوونیان(٧).

کەواتە بیرۆکەی ناسیۆنالیزم -بەگوێرەی ئەم بۆچوونەی پێشوو- هەرچەندە تەنها هاوشان و هاوکاتی جەنگەکانە، نەك هۆکاری بەرپابوونیان، بەڵام بنچینەی دروستبوونی نەتەوە و پەیدابوونی دەوڵەتە ناسیۆنالیزمەکەیەتی کە بەلای جیابوونەوە وتایبەتمەندی و ململانێ لەگەڵ نەتەوەکانی تردا دەچێت بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندییە ناسیۆنالیستیەکانی.

ئەمەی پێشەوە زۆر بە کورتی وێنەی هزری ناسیۆنالیزمە کە سەرچاوەکەی ئەورووپییە، بەڵام ئایا لە کەیەوە هزری ناسیۆنالیستی لای میللەتانی ئیسلام سەریهەڵدا؟ و سەرچاوەکانی هزری ناسیۆنالیزمی تورکی چین؟

بێگومان وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە تا ڕادەیەکی زۆر چۆنیەتی سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزمی کوردیمان بۆ دەردەخات.

سەرەتا بابزانین ئایا تورکە عوسمانیەکان خۆیان لە نەتەوەکانی تری ژێر چەتری دەوڵەتی عوسمانی جیا دەکردەوە؟ لە ڕاستیدا واقیعە مێژووییەکان ڕوونی دەکەنەوە کە تورکە عوسمانیەکان پێش نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم هیچ ڕەوت و مەیلێکی نەتەوەیی یان ڕەگەز پەرستیان نەبووە. بۆ ماوەی نۆ سەدەی یەك بەدوای یەك، لەژێرسایەی ئیسلام دەژیان و ئینتیمایان بۆ بیروباوەڕی ئاینی پێش هەموو شتێکی تربوو، تەنانەت دانیان بە توورك بوونی خۆشیاندا نەدەنا، واتە شانازیان پێوە نەدەکرد و خۆیان پێ هەڵنەدەکێشا. و زمانی تورکی لە سەردەمی سەلجوقەکان لە دیوان وفەرمانگاکاندا بەکار نەدەهێنرا، هەروەها زمانی ئەدەب و زانست نەبوو، بەڵکو زمانی عەرەبی و فارسی بوو(٨).

لە دەیەی دووەمی سەدەی بیستەم مێژوونووسێکی ئەمریکی لوسروب ستودارد وەسفی ساڵانی پێش سەرهەڵدانی هزری ناسیۆنالیزمی تورکی دەکات و دەڵێت: "سێ تا چوار دەیە بەر لە ئێستا هیچ شتێك لە ئارادا نەبوو کە ئەم بزاڤە ناسیۆنالیزمەی پێوەدیاربێت، و ئارمینۆس ڤامبری پێی ڕاگەیاندم، کاتێك بۆیەکەمجار لەساڵی ١٨٥٦ز سەردانی قوستەنتینیەی کرد، ووشەی تورکلك (تورك) هاوواتای ووشکی و ڕەقی و دواکەوتوویی و نەزانی بوو، هەروەاش دەژمێردراو لای

خەڵكی باو بوو. وە كاتێ: هەڵدەستام بە تێگەیاندنی خەڵك سەبارەت بەم مەترسیە گەورەیەی پێویستە لە بەرچاو بگیرێت لە هەمبەر بنەچەی ڕەگەزی تورك (كە لە ئەردەنەوە تاكو باسفیك بڵاو بووبوونەوە، وا بەرسڤیان دەدامەوە: توخوا وازمان لێ بێنە و مەمانخەرە ریزی قرغیز و نەتەوەكان.."(٩).

ج ئەگەر ئەمە وێنەی گشتی هزری ناسیۆنالیزمی توركی بێت لای عەوامی خەڵك، دەبێ حاڵی دەسەڵاتی سیاسی چۆن بووبێت؟ ئایا هەستكردن بە ئینتیما بۆ نەتەوەی تورك هەبوو؟ تیۆردارێژی هزری ناسیۆنالیزمی عەرەبی (ساطع الحسري) لەم بارەیوە دەڵێت: توركبوون لە نەریتی پیاوانی دەوڵەت و نووسەران هاومانای سادەیی و عەوام بوو، تەنها بەمانای خەڵكی بازاڕ و كەسانی سادە و كرچ و كاڵ بەكار دەهات، تەنانەت هەندێ مێژوونووس كاتێك ناچار دەبوون ووشەی (توركەكان) بەكاربهێنن هاوماناكەیان دەنووسی بە تەنیشتیەوە كە دەستەواژەی (بێ ئیدراك) بوو واتە كەسانی نەفام و ناحاڵی و دوورە عەقڵ(١٠). هەروەها دەڵێت: "عوسمانیەكان زۆر دووربوون لە هەستكردن بە ناسیۆنالیزمی توركی"(١١).

هەروها ئینسكلۆپیدیای ئیسلامییش جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە "تاوەكو سەدەی نۆزدەهەم توركەكان هیچ ڕەوت و مەیلێكی ناسیۆنالیستیان نەبووە، بەڵكو بە پێچەوانەوە (تورك) لەلایان مانای كەسێكی دێنشینی زبر و توند و ڕەزاگران (ئێسك قورس) بوو"(١٢).

لەم گەواهیدانانەی (ستوردارد و ساتع ئەلحەسری و ئینسكلۆپیدیای ئیسلام) بەبێ هیچ گومانێك ئەمە دەردەخات كە توركەكان چەند دووربوون لە هەر مەیلی نەتەوەیی یاخود ڕەگەزی یان هەر ئینتیمایەكی تری نا ئیسلامی. بەهەر حاڵ بەم

شێوەیە بەردەوام نەبوو، ئەوەبوو ئەم بایەخپێدانە کتوپڕەی کە لەم ماوەیەدا لە ئەورووپا سەریهەڵدا و فرەیی ئەو نووسین و لێکۆڵینەوانەی کە گرنگیان بە ڕەگەزی تورك دەدا لە ڕووی مێژوویی جوگرافیەوە، دواتر لەم ناوەندانەی بە پەرۆشەوە هزریخۆیان قۆزتەوە، و جێگەی خۆی گرت و بەریگرت.

هەر لەبەرئەوەش هەروەکو ستیودارد دەڵێت سەیر نیە کە سەرهەڵدانی ڕەوتە ناسیۆنالیزمەکان و تەماعکارییە نشتمانیەکان لەنێو میللەتانی موسوڵمان، لەسەرەتادا لەماوەی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم لێڵی تەماوی پێوە دیارە و ڕوون نیە، بۆیە بیروباوەڕی دەمارگیریی ڕەگەزیی تاوەکو نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم بە ئاشکرا دیار نەکەوت، هەروەها گیانی ئەم دەمارگیرییە ڕەگەزییە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم لای ڕیفۆرمخوازی تورکەکانیش دەرکەوت بەهۆی فرچککگرتنیان بە بنەماو بۆچوونە خۆرئاواییەکان وبەهەند وەرگرتنی و وەرگرتنی زۆرێك لە بیروڕا ئەورووپیەکان دەربارەی ڕەگەزایەتی، ئەمەش بووە هۆی سەرهەڵدانی دەمارگیری ڕەگەزی لەلایان بەر لە میللەتانی تری موسوڵمان(١٣).

دیارە بەدواداچوونی سەرەتاکانی سەرهەڵدانی هزری ناسیۆنالیزمی تورکی زەرورەتێکە بۆ تێگەیشتنی هۆکار و چۆنیەتی سەرهەڵدانی هزری ناسیۆنالیستی کوردی لە ڕەنگدانەوە وکارنەوەی ناسیۆنالیزمی تورکیەوە کە لەناو ڕەحمی دەوڵەتی عوسمانی و بەهۆکاری دەرەکی (ئەورووپی) لە ڕووی تیۆری و پراکتیکیەوە وبەشێوەیەکی بەرنامەر ڕێژکراو سەریهەڵدا.

لە ڕاستیدا لێکۆڵینەو زانستیەکان ئەوە دەسەلمێنن کە هـزری ناسـیۆنالیزمی تورکی بەرهەمی دەستی ڕەگەزناسی خۆرئاوا و جولەکەکانـە. ئـەوەبوو لـە نیـوەی دووەمی سەدەی هـەژدەم ڕەگەزناسـە خۆرئاواییـەکان دەسـتیاندایە بایەخـدان بـە توکـەکان. هاوکـت –یـان لەچـەند کـاتێکی لێـك نزیـك– چـەندین لێکۆڵینــەوە لـە چەندەها وڵاتی ئەوروپی: فەرەنسا، ئەڵمانیا،نەمسا، ڕوسـی، ئینگلتـەرا دەرکـەوتن کە سەرنجیان بۆ گرنگی ڕەگەز تـورکی ڕادەکێشا. لـە سـاڵی ١٧٥٦ مێژوونووسـی فەرەنسی گ. دێغین کتێبێکی دانا لەسەر مێژووی گشتی هـون و تـورك و مـەغول و تەتەرە خۆرئاواییەکان. دواتر ئەم کتێبە بووە یەکێك لـە گـرنگترین سەرچـاوەکانی هــزری ناسیۆنالیــستی تـورکی و بـوو بــە ئیلهامبــەخش بـۆ نــەوەی یەکــەم لــە ناسیۆنالیستە تورکەکان، کە ڕێنمایی کـردن بـۆ یەکیـەتی ڕەگـەزی لـەنێوان هونـو تورك و مەغۆل و تەتەرە نیـشتەجێکانی ڕووبـەرێکی بـەرفراوانی ئاسـیا و ئـەوروپا. هەروەها گرنگی ئەم کتێبە لەوەدایە کە ئـەم بنـچینە مێژووییانـەی ئاشـکراکرد کـە دەکرێــت پــرۆژەی ناسیۆنالیــستی تــورکی لەســەر دابمــەزرێت. دوای ئــەوە بــە تێپەڕبوونی کات نیشانەکانی پرۆژەی ناسیۆنالیـستی تـورکی زیـاتر ڕوون دەبـۆوە، بەتایبەتی کاتێك جولەکەیەکی ئینگلیز بەناوی دێڤیـد لـوملی کتێبکـی دانـا بـەناوی ڕێزمانی تورکی کە تیایدا بنەما و ڕێساکانی ئەم زمانەی دارشـت، ئـەو زمانـەی کـە لەدیدی نوسەران و مێژوونووسانی شارەزا، زمانیئەدەب یان شـیعر نـەبوو، ئێـستا لەسەر دەستی لوملی بوو بەخاوەن ڕێسا و زمانی چەسپاو.

دوای دانــانی ئــەم کتێبــە ئاشــکرا بــوو کــە بــوونی مێــژوو و زمــان بــۆ تــورك پێویستیان بـە ئینتیمـا بـۆ نەتەوەیـەك و نیـشتمانێك هەیـە تـاوەکو ببنـە بناغـە و

ئامانج -لە هەمان کات- بۆ یەکبوونی میللەتانی هون و مەغۆل و تەتەر و تورك، هەر واش دەرچوو، ئەوەبوو لە ئەدەبیاتی خۆرئاوایی ناوەکانی (نەتەوەی تۆران) و (ناسیۆنالیستی تۆرانی) سەریانهەڵدا. هەندێك دەڵێن بۆ یەکەمجار (تۆران) و (تۆرانیزم) لە نەمسا لە ساڵی ١٨٣٩ز دەرکەوت کە مانای وەسفی نیشتمانێکی نموونەیی کە هەموو تۆرانیەکان بگرێتە خۆ، دەگەیاند.

بەڵام وەك بەکارهێنانێکی جوگرافی، فیردەوسی کە لە سەدەی دەیەمی زایینی ژیاوە، لە شاکاری (شاهنامە)دا، تۆماریکردووە کە دەڵێت "تۆرانیەکان نەتەوە بەربەرییەکانی باکور پێکدێنن (مەبەستی تورك و چینیەکانە) کە هەر لە کۆنەوە بارێکی قورس بوونە لەسەر هەرێمی ئێرانی خاوەن شارستانی". دواتر چەندین کتێب و لێکۆڵینەوەی تر لە ئەوروپا دەرکەوتن، کە جەختیان لەسەر هەمان مەبەست دەکردەوە و لەسەر زمان و مێژوو و ئەدەبی تۆرانی و تورکیان دەنووسی.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بە ڕۆڵی جولەکەی نەمساوی ئەرمینیۆس ڤامبەری بکەین کە مامۆستایەکی زانکۆی بۆدابیست بوو، بەتەواوی نازانرێت -هەروەك هرتزل لە یاداشتنامەکانی دەڵێت- کە ئایا زیاتر تورك بووە یان ئینگلیز. بەزمانی ئەڵمانی چەندین کتێبی داناوە، زۆر بە باشی دوازدە زمانی زانیووە، باوەڕی بە پێنج ئاین هێناوە، کاهین بووە لە دوانیان، پەیوەندی تایبەتی لەگەڵ سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم هەبووە، هەر ئەویش سوڵتانی ڕازیکردووە کە پێویستە چاوی بە هرتزل بکەوێت وەك سەرۆکی جولەکەکان ئەمەش لە ئایاری ١٩٠١ز ئەنجامدرا[١٤].

جا ئەم پیاوە بە جلی دەروێشێکی تورکی هەموو لایەکی ئاسیای ناوەڕاست گەڕا و ئەنجامی گەشتەکەشی کتێبێك بوو بەناوی "گەشتی دەروێشێکی لاو لە ئاسیای ناوەڕاست". کە لە میانەی ئەم کتێبە و دواتریش تیۆرە تایبەتیەکەی خۆی کە داوای پێویستی دروستبوونی یەکێتی نەتەوەیی تورکی دەکرد، وناوی نا (بان تورکیزم) کە هەر لە دەریای ئیجەوە درێژ دەبێتەوە تاوەکو سنووری چین. لە ڕاستیدا ئەم یەکێتیەش گوزارشتی لە بەرژەوەندییە زیندووەکانی بەریتانیا دەکرد، هەر بۆیە زوو پشتگیری لێکرد بەم پێیەی دژ بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و قەڵەمڕەوی ڕوسیا بوو. بەڵام دواتر هەڵوێستی ئینگلتەرا گۆڕانی بەسەردا هات بەهۆی گۆڕانی بەرژەوەندییەکانی.

ڤامبری بەردەوام بوو لە بانگهێشتەکانی وێڕای ئاراستە کردنی چەندین ڕەخنە و توانجی توند بۆ ئیسلام و هەژمارکردنی وەك کۆسپی بنەڕەتی لەپێش دروست بوونی یەکێتی تورکەکان، و دەیگووت ئیسلام پێچەوانەی نیشتمان پەروەرییە و"نیشتمانی نیە بۆیە زەحمەتە نیشتمانەکان بەگوێرەی ئیسلام بنیات بنرێن". لەبەر ئەوە ئامۆژگاری ناسیۆنالیستە تورکەکانی دەکرد کە پێویستە واز لە ئیسلام بهێنن چونکە کەسایەتی نەتەوەییان لێ دادەڕنێت. هەر ئەم بۆچوونەش بوو دواتر لە نێوەندکانی هەڵبژاردەی عەلمانی تورکی دەنگی دایەوە وپشتگیری لێکرا بەتایبەتیش لەلایەن ناودارانی هزری ناسیۆنالیستی تورکی، وەك: ضیاء کوك ئالب و یوسف ئاکشور و ئەحمەد غایف و خالیدە خانم و زۆری تر.

ئەمەش زۆر بەڕوونی لە بۆچوونەکانی ناسیۆنالیستە تورکەکاندا دەرکەوت و لە قۆناغی دواتر لە ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکانیان کە دژ بە دەسەڵات لە دەرەوەی وڵات

دەریان دەکرد، گوزارشتیان لێ کرد، ئەمە پێش سەردەمی مەشروتیەش ساڵی ۱۹۰۸ کە گەیاندنی ساڵانی دواتر بوو بە ئایدیۆلۆژیای فەرمی دەوڵەت، و بوونیادی کۆمەڵایەتی و دامەزراوەیی، دەوڵەتی لاواز کرد و نەتەوەکانی لێکترازاند، تەنانەت دواتر بووە هۆی وێرانی ئیمپراتۆریەت و کۆتاپێهێنانی.

ڕۆژهەڵاتناسی گەورە برنارد لویس دەڵێت: "بەر لە گەیشتنی هزری خۆرئاوایی بۆ ناو دەوڵەتی عوسمانی بیرۆکەی ناسیۆنالیزم هیچ بوونێکی نەبوو، تەنانەت تاوەکو سەرەتای سەدەی بیستەم ، تورکەکان و عەرەبەکان هەستیان بەوە نەکردووە کە بۆ یەکتر نامۆبن، عەرەبەکان ئەوەیان قبوڵ بوو کە بەشێك بن لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەهۆی ئاینی هاوبەش کەچی تورکەکان شانازییان بە عەرەبەکانەوە دەکرد، کلتوور و زمانی عەرەبیان بە یەکێك لە نیشانەکانی پێشکەوتن و گەشەکردن دەزانی".

لەلایەکی تریشەوە بەهۆی نەبوونی جیاوازی نەتەوەیی لەناو دەوڵەتی عوسمانی، سوڵتانە عوسمانیەکان و میللەتانی تری ژێر چەتری دەوڵەتی عوسمانی زۆر بەلایانەوە ئاسایی بوو کە چەندین ماوە و قۆناغی جیاجیای مێژووی کورد ڕابەرایەتی ڕۆحی دەوڵەتی عوسمانیان پێ سپێردرابێت، کە لە پایەی (شێخ سەلام)ی دەست ڕۆیشتوو، بەرجەستە دەبوو، کە لەماوەی پچڕ پچڕدا بەدەست خانەودەی بەدلیسی وئامێدی و حەیدەریەوە بوو، هەورەها ڕابەرایەتی تەریقەتە سۆفیەکان: قادری و نەقسبەندی[١٥].

لە ڕاستیدا بڵاو بوونەوەی هزری ناسیۆنالیستیی تورکی بەخێراییەکی بەرچاو دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێکی ناوخۆیی و دەرەکی لە سەرووی هەموویانەوە ئەو

ڕەگەزناسە خۆرئاواییەکان لە پرۆسەی پەیوەست کردنی هزری ناسیۆنالیستی تورکی هەر لە سەرەتاوە بە قۆناغی پێش ئیسلام، سەرکەوتن، هەر ئەوەش مەبەست بوو تا ڕۆژگاری ئەمڕۆش کاتێك نووسینە ئەوروپیەکان بۆنموونە باس لە پێکهاتەکانی کلتووری تورك بکەن، ئەوا یەکسەربەر لە هەموو شتێك پەنا دەبەنە بەر مێژووی تورك بەر لە ئیسلام، واتە قۆناغی پێش گەیشتنیان بە ئەنادۆڵ.

شایەنی باسە زۆربەی سەرانی هزری تۆرانیزم تورك نەبوون. بۆنموونە ئەحمەد ڕەزای سەرۆکی بزاڤی (ئیتحاد و تەرەقی) نیوەی شەرکەس بوو نیوەکەی تری نەمساوی (مەجەری)، ئەنوەر پاشا کە یەکێك بوو لە دیارترین سەرکردەکانی ئیتیحاد و تەرەقی پیاوێکی پۆڵۆنی بوو، بۆ ماوەیەك ئیسلام بوو بوو دواتر هەڵگەڕایەوە. جوید پاشا و عەمانوێل قەرەسۆ کە دوون لە سەرکردە باڵاکانی ئیتیحاد و تەرەقی بوون و پۆستی گرنگیان پێ سپێردرابوو وەك وەزارەتی دارایی، لە بنەچەدا دەگەڕانەوە سەر جولەکەکانی (ئەدۆنە). تەلعەت پاشا کە وەزیری ناوخۆ و وەزیری جەنگ بوو لە دەوڵەتی عوسمانی و یەکێك بوو لە بناغەکانی سێ کوچکەی ستەم داپلۆسێنی لە دەوڵەتی عوسمانی، بولگارییەکی بە بنەچە قەرەج بوو.

هەروەها ضیاء کوك ئەلب کوردی دیاربەکر بوو، خۆی کردبوو بە تورك و کەوتبووە ژێر کاریگەری هزری سۆسیال دیموکراتی و فەلسەفەی دۆرکهایم، بەرنامە داڕێژی هزری ناسیۆنالیستی نادینی تورکی بوو، و عیسمەت ئەینونوی دەستە ڕاستی مستەفا کەمالی کە پێشەوای بزاڤی ناسیۆنالیستی بوو لای تورکەکان و سەرسەخت ترین دوژمنی ئیسلام بوو، کوردێك بوو خۆی کرد بە تورك.

لەڕاستیدا بە جووڵە خستنی ڕەوتی ناسیۆنالیزم لای تورکەکان ڕق و کینێکی زۆری بەرامبەر بە کورد و عەرەبەکان دروستکرد. سەرەنجام سیاسەتی (پەرت بکە و زاڵ بە) سەریگرت و ئەو ئامانجەیان هاتە دی کە لەناوبردنی خەلافەی عوسمانی ونانەوەی ڕق و کین و و دوژمنایەتی لەنێوان میللەتانی موسوڵمان بوو. بەڵام ئەم قسەیەمان ئەو ناگەیەنێت، کە دەسەڵاتی عوسمانی هەمیشە نوێنەرایەتی ڕاستەقینەی ئایینی ئیسلام و شەریعەتی کردووە و لێی لانەداوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە لادانێکی زۆری پێوە دیار بوو لە ئیسلام و جێبەجێکردنی ڕاوێژ و دادپەروەری و هەروەها هەرسکردنی مافی تاکی موسوڵمان و بە هەدەردانی سەروەت و سامانی (ئوممەت) لەپێناو بەرژەوەندی و تێرکردنی هەوەس وئارەزووەکانی سوڵتانەکان، لە سیفەتە دیارەکانی ئەم دەوڵەتە بوو، بەڵام سەرەڕای هەموو نەخۆشیەکان و خاڵە نێگەتیڤەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەبەرئەوەی نوێنەرایەتی گەلانی موسوڵمانی دەکرد کە خاوەنی هێز و وزەیەکی زۆری لەبن نەهاتوون لە هەموو ڕوویەکەوە، خۆرئاوا سوور بوو لەسەر لەناوبردنی لەڕێگەی ترازاندنی بنەماکانی بوونیەوە، بەچاندنی هزری نادینی و ناسیۆنالیزمی تورکی کە دواتر ئەم تۆوە سەرجەم میللەتانی ناو دەوڵەتی عوسمانی گرتەوە، بەتایبەتیش عەرەب و کورد.

هەروەها مێژوونووسی کورد محەمەد ئەمین زەکی بەگ باسدەکات تاوەکو تورك داوای تورکایەتی نەکرد وعەرەب داوای عەرەبایەتی نەکرد، مەسەلەی نەتەوایەتی لای کورد بوونێکی نەبووە. واتە بوونی کورد لەناو ئەو واقیعەی خەریکە مۆدێلێکی هزری نوێ بەخۆوە دەبینێت، پاڵی بە کوردەکانیشەوە نا کە

لاسایی ئەم مۆدێلە بکەنەوە و بیر لە بنەچە و ڕەگ و ڕیشەی مێژوویی خۆیان بکەنەوە، هەورەها زیندووکردنەوەی کەلتووری کۆنی خۆیان و بوونی قەوارەیەکی نەتەوەیی کە سەرجەم کوردەکان بگرێتە خۆ کە چوارچێوەی جوگرافی مێژوویی هەبێت، بە زەرور بزانن. دیسان لێرەشدا نووسینە خۆرئاواییەکان ڕۆڵی ئەکتیڤی خۆیان بینی لە ڕەواجدان بەم باسە.

کەواتە مەسەلەی ناسیۆنالیزم و کێشەی نەتەوایەتی لە ڕۆژهەڵات لەمێژ نیە سەریهەڵداوە، بەتایبەتی بە نیسبەت کوردەوە تا سەرەتاکانی سەدەی بیستەم نەهاتۆتە کایەوە، سەرهەڵدانیشی هەروەك باسکرا پەیوەستبوو بەو هەلومەرجەی خۆرئاواییەکان لە ڕۆژهەڵات (لە سنووری دەوڵەتی) هێنایە ئاراوە. سەرەتا ئەم هزرە ناسیۆنالیزمە لای تورکەوە دەستی پێکرد و دواتر عەرەبی گرتەوە لەماوەی جەنگی یەکەمی جیهانی و ئینجا کوردەکانیش کاتێك بینیان گەمارۆدراون بە دەروبەرێکی ناسیۆنالیستی و هەر نەتەوەیەك بانگهێشت بۆ خۆی دەکات و داوای سەربەخۆیی دەکات لەناو چوارچێوەیەکی (نەتەوەیی)، کوردیش ناچاربوو هەمان ڕێباز بگرێتە بەر .. و ئیتر کێشەی نەتەوایەتی سەرهەڵبدات، و هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەکی بۆ بدرێت، و چیتر کورد لەلایەن نەتەوەکانی دەوروبەر نەچەوسێنرێتەوە، و مافە بنەڕەتیەکانی وەکو نەتەوەیەکی سەربەخۆ و خاوەن تایبەتمەندی جوگرافی و مێژوویی و کلتووری، ڕێگەی ژیانی خۆی هەڵبژێرێت.

## پەراوێزەکان :

(1) بڕوانە: هوراس دافیز، القومیة نحو نظریة علمیة معاصرة، ترجمة: سمیر کرم، (بیروت: ١٩٨٠)، ص٤٤- ٤٥.

(2) المرجع نفسه، ص ٦٢.

(3) المرجع نفسه، ص٦٢.

(4) کلیرنس برنتون، أفکار و رجال- قصة الفکر الغربي، ترجمة: محمود محمود، (القاهرة: ١٩٦٥، ص٥٢٤.

(5) هوراس دافیز، المرجع السابق، ص٦٢.

(6) بڕوانە: کلیم صدیقي، الحرکة الإسلامیة قضایا وأهداف، ترجمة: ظفر الاسلام خان، (لندن: ١٩٨١)، ص٤٧.

(7) المرجع سابق، ص٦٠.

(8) بڕوانە: قیس جواد العزاوي، الدولة العثمانیة، (بیروت: ٢٠٠٣)، ص١٢٥.

(9) بڕوانە: ستودارد، حاضر العالم الإسلامي، ترجمة: عجج نویهض، (بیروت: ١٩٧٣)، مج٤، ص١١١.

(10) ساطع الحصري، محاضرات في نشوء الفکرة القومیة، (بیروت: ١٩٨٥)، ص٩٢.

(11) المرجع نفسه، ص٩٣.

(12) Encyclopedia of Islam, tom IV, (Paris: ١٩٢٤), p.٩٢٧.

(13) ستودارد، المرجع السابق، ص٧٩.

(14) صبري جرجیس، تأریخ الصهیونیة، (بیروت: ١٩٨١)، ج١، ص١٦٥.

(15) د. عثمان علي، دراسات في الحرکة الکردیة المعاصرة.

# نمایشێکی سەدەی بیستەم

و:لە ئینگلیزییەوە : سردوود قادر

(١-٢)

ساڵی ١٩٠٠، لە کەنارە لماوییە بەرشنەبایەکانی کتی هۆك، کە شارۆچکەیەکی ویلایەتی کارۆلینایە دوو پایسکیلسواری خەڵکی دایتۆنی سەر بە ویلاویەتی ئۆهایۆ یەکەم ئامێری فڕینی خۆیان بەسەر کردەوە کە فڕۆکەیەکی چارۆکەداری کێش پەنجا پاوەند بوو. لە ماوەی چەند ساڵێکی کەمدا ئەم دوو برایە (ئۆرفایل ڕایت و ویلبرت ڕایت)فڕۆکەیەکیان بۆ ماوەی زیاتر لە نیو کاتژمێر زیاتر بە ئاسماندا فڕاند کە بە ووزەی سووتەمەنی کاری دەکرد. پێشەنگ گەلێکی دیکەی بواری فڕناسی هەر زوو دوای ئەمە دەرکەوتن.

فڕۆکەکانی ئەم دووانە هێمای سەرهەڵدانی ئەو تەکنۆلۆژیایەی بووە یەکێك لەو هێزە بنەڕەتیانەی ژیانی سەدەی بیستەمیان ڕەنگرێژ کرد. لە دەیەکانی دواتردا زانایان بەخێرایی تێگەیشتنی خۆیان لە بەرەو خەسڵەتە بنەڕەتیەکانی کیمیا، ژیانناسی وئەندازەی کشتوکاڵی بەرفراوانکرد. ئەنجامدانی کری پزیشکەوانی و ئاوەڕۆ بە شێوەیەکی تەندروست لەسەر نچینەی ئەم تێگەیشتنە کاریگەرییەکی زۆریان هەبوو لەسەر پێشخستنی تەندروستی و تەمەندرێژی. تێزە

نوێیەکان لەبارەی ماتماتیك، فیزیا، گەردوون و کات، وەرچەرخانیان لە باوەڕی خەڵکانێکی زۆر لەبارەی واتای مێژوو سروشتی جیهاندا بەرپاکرد.

ئەم پێشکەوتنە بەرچاوەی زانیارییە زانستیەکان لە سەدەی بیستەمدا، بووە مایەی تەقینەوەیەکی تەکنۆلۆژی نا ئاسایی. ئۆتۆمبێل وفرۆکە وفیلمی سینەمایی وتەلەفزیۆن، ووزەی ئەتۆمی، پلاستیك وکەلوپەلە دەستکردەکان، کوتان وئەنتی بایەتیك، مانگی دەستکرد و موشەك وگەشتی ئاسمانی ولێزەر و کۆمپیوتەر تەنیا چەند نموونەیەکی کەمی لێشاوی تەکنۆلۆژیای دەیەکەکانی دوای هەزار ونۆسەدن.

ئەو گۆڕانانەی زادەی زانست و تەکنۆلۆژیای سەدەی بیستەم بوون زۆر بەخێرایی هاتن وئەوەیان دەستەبەر کرد کە هەر وەچەیەکی نوێ چاو بە ژیان هەڵدێنێ، بەشێوەیەکی بەرچاو لە وەچەکانی پێشتر جیاواز بێت. کەم کەس لەوانەی ساڵی ١٩٠٠ دەژیان ئەندێشەیان بۆ ئەوە دەچوو، بۆ نموونە، لەگەڵ داهاتنی ساڵی ١٩٣٠ دا خەڵکانێکی زۆر ئێواران بەدەم گوێگرتن لەو دەنگانەوە کە لە سەندوقێکەوە دەردەچن، یا خۆ بەدەم سەیرکردنی خەڵکانێکەوە بەسەر ببەن کە لەناو شاشەدا دەجولێن قسە دەکەن. تەنانەت خەڵکانێکی کەمتریش خەونیان بەوەوە دەبینی کە لە ساڵی ١٩٦٩ دا سەدان ملیۆن خەڵك لەماڵی خۆیان دادەنیشن مرۆ دەبینن کە لەسەر مانگ دەڕۆن، یاخۆ لەگەڵ داهاتنی نەوەدەکانەوە لەڕێگەی تەلەفزیۆنەوە پەخشکرانی کارەساتان لە چەند کەناڵێکەوە دەبینن.

بەد بەختییەکەی لەوەدایە کە زۆربەی جار ئەم دەستکەوتە گرنگە زانستی وتەکنۆلۆژیانە وەك چۆن ئەنجامی چاکیان هەبووە ئەنجامی خراپیشیان هەبووە

وتوانای مرۆی ناچار کردووە لەگەلیان بگونجێ. لەگەڵ داهاتنی ١٩٩٧!! تەمەنی ناوەندی بۆ خەڵکانێکی زۆر بوو بە دوو چەندانەی تەمەنی ناوەندی ساڵی ١٩٠٠. هێشتا ئەوەندە چەکە ناوکییە لە ئارادا بوو کە بەس بێت بۆ ئەوەی لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا ژیانی سەرجەم مرۆیەك بکوژێنیتەوە.

هەر ئەو دەمەی ئۆرفایل و یلبەرت بەدوای خەونەکەیاندا دەچوون برسیەتی سەدان هەزار کەسی لە هیندستاندا قەلاچۆ دەکرد ئەوانەی ڕووداوەکەیان دیووە لە نووسینەکانیاندا وەسفی چاوە بەقووڵداچووەکان و سکە بەتاڵەکان و لینگ وباسکە لەڕەکانی ژمارەیەکی زۆری ئەو هیندییانە دەکەن کە پێوەی دەناڵان. لەگەڵ کۆتایی ١٩٠٠ دا زیاتر لە یەك ملیۆن کەس گیانیان لەدەستدا. بەگوێرەی ئامارێك لە ساڵی ١٨٧٥- ١٩٠٠پازدە ملیۆن هیندی بەهۆی گرانیەوە گیانیان لەدەستداوەکە دەکاتە دە ئەوەندەی لە یەکەمین پەنجا ساڵی سەدەی بیستەمدا لە برسان مردوون. حکومەتی بەریتانی بە مەبەستی سوککردنی بارەکە بەشێوەیەکی سەرەکی کارەساتەکەی گەڕاندەوە بۆ تەشەنەکردنی خێرای دانیشتوان کە ووشکە ساڵیش بارەکەی دژوارتر کردووە.

ڕاستیەکەی قات و قڕییەکەی ساڵی (١٨٩٩- ١٩٠٠)ی هیندستان بە زەقی ئەو نەخشەی دەرخست کە هێزێکی دیکە، واتا ئابووری، لە سەدەی بیستەمدا گێڕای. گەرچی برسیەتی لە هیندستان هەر زوو بەدوای ووشکە ساڵیدا هات بەلام هۆیە بنەڕەتی ترەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ژوورەکانی ئەنجومەنی کارگێڕی ئەو کارتێلانەی لە زەمینەی ئابووری جیهاندا بەدووری لە دێیە بەرگەوتووەکان وگەڕەکە هەژارنشینە شارییەکانی هیندستان کاریان دەکرد. وێڕای ئەوەی بەرهەمی خۆراکی

لەئەنجامی چاکسازییە زانستی و تەکنۆلۆژییەکاندا زیادی کرد، ئەو کۆمپانیا یاخود حکومەتانەی دەستیان بەسەر زەخیرەی دانەوێڵە بنەڕەتیەکانی جیهاندا گرتبوو، دابەشکردنێکی نایەکسانی ئەو کەلوپەلە خۆراکیانەیان هێناوەتە کایەوە.

لەم ڕووەوە بەریتانیای مەزن لە ماوەی سەدەی نۆزدەدا زەویدارە گەورەکانی هیندستانی هانداوە بەروبوومی هەناردەنی بۆ بازرگانیی جیهانی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا بەرهەم بێنن. کرانەوەی نۆکەندی سوێس وفراوانبوونی خێرای تۆڕی خەتی شەمەندفەر، بەشێوەیەکی بەرچاو کات وتێچوونی گەیاندنی کەل وپەلی هیندی بۆ بەریتانیای مەزن وپارچەکانی دیکەی ئەم ئیمراتۆریەتە کەمکردەوە. زەویدارەکان دنەدران کە زەوی و زارەکانیان وپاڵەکان بەکاربهێنن بۆ ڕەنێوهێنانی جووت، لۆکە، چاو گەنم بۆ فرۆشتنیان بە دەرەوە نەك بۆ چاندنی بەروبوومی خۆراك بۆ زۆرکردنی دانیشتووان. ساڵی ١٩٠١ ئەو دەمەی هەندێ کەس لە برسا دەمردن زەویدارەکانی هیندستان دوو ئەوەندە ونیوی ساڵی ١٨٥٨ دانەوێڵەی خۆراکیان هەناردە دەرەوە. جگە لەمەش ئەو باجەی بەریتانیا بەسەر زەوی وزاریدا سەپاندبوو لەگەڵ هەندێ سیاسەتی دیکەی کشتوکاڵی، دێنشینەکانیان هەرچی زیاتر بەرەو هەژاری دەبرد.

هەروەك بەهۆی هەلومەرجی هیندستان لە ساڵی ١٩٠٠ دا ڕوونکرایەوە بابەتی سەرەکی ئابووری سەدەی نۆزدەیەم درێژەپێدانی نا هاوتایی نێوان ناوچە هەژار ودەوڵەمەندەکانی جیهان بوو . بەتایبەتی لە ئاسیا۔ ئەفریقا وئەمەریکای لاتینیدا خەڵکە بەد خۆراکەکە هەر بە پابەندی بە سەرچاوە ئابوورییە خۆجێییەکان مانەوە، کەچی هەر لەو کاتەدا ئەو دام ودەستگا پیشەیی بە نێو نەتەوەییە

مەزنانەی دەستیان بەسەر سەرچاوەکانی جیهاندا گرتبوو ڕێگەی فەراهەمبوونی خۆشگوزەرانیان بۆ ژمارەیەکی کەم نەتەوەی پشتیوانی لێکراو خۆشکرد بەتایبەتی لە ئەوروپا وئەمەریکای باکور هەندێ بەشی ئاسیای خۆرهەلات وخۆرهەلاتی ناوەڕاست.

بارودۆخەکانی ئاوو هەوا، زۆری دانیشتوان، ڕکابەرایەتە ڕامیارییەکان، جەنگی ناوخۆ ونەخشە ئابوورییە ناوچەییەکانیش بەشێوەیەکی بەرچاو لە سەرتاسەری سەدەی بیستەمدا بەشدارییان لە چەند بارەکردنەوەی سامناکی برسیەتیدا کرد، کە ئەو کارەساتە بوو دەست وپێی گەلانی لە گۆڕینی سیستەمە ئابوورییەکاندا بەستابوو. بۆ نموونە لە سییەکاندا لە ئۆکرانیای شورەویدا ملیۆنەها کەس لە ئەنجامی سیاسەتەکانی جۆزێف ستالیندا بێ خۆراك کران، لە کاتێکدا کە خەڵکی ئۆکرانیا ئەوەندەیان بەرهەمی خۆراکی ڕەنیو دەهێنا کە لە خۆیان سەرو زیادبوو. لەناو نەتەوە جیاوازەکانی وەك چین ونێجیریا وبەنگلادش و کەمبۆدیا و ئەسیوبیا ومۆزەنبیق وسۆماڵدا لە ئەنجامی سیاسەتە بازرگانی یە حکومی و نێونەتەوەییەکان و کارەساتە سروشتییەکانی دوای (١٩٦٠)ەوە ملیۆنەها کەس لە برسان لەناوچوون ولەلایەکی دیکەشەوە هەر لەو سەروبەندەدا ساخکردنەوەی نێو نەتەوەیی وکەڵەکەی بەرهەمە پیشەسازی وبەکاربەرییەکان، نەك هەر تەنیا بۆ ژمارەیەکی زۆر خەڵکی ولاتە یەکگرتووەکان بەڵکو بۆ ژمارەیەکی زۆر و زەوەندی خەڵکی ژاپۆن، کۆریای باشوور، تایوان، هۆنگ کۆنگ، سنگافور، و دەوڵەتە لە نەوت دەوڵەمەندەکانی خۆرهەلاتی ناوەڕاستیش ئاستێکی گوزەرانی ئاسوودەی هێنایەوە کایەوە.

نایەکسانی ئابووری دیاردەیەکی گرنگی دیکەی لە سەدەی بیستەمدا ووژاند کە کێشمەکێشمی کۆمەڵایەتی و ڕامیارییە. کە هیچ کەسێك لە (ئیما گۆڵدمان) باشتر دەستنیشانی ئەم دیاردەیە ناکات. ناوبراو کە جولەکەیەکی هەڵسوڕاوی ڕووسیایی پەنابەر بوو لە ئەمەریکا کە کەسایەتیەکی سەرەکی بوو لە بەرپابوونی ئانارشیزم. لەبەرئەوەی ئانارشیستەکان باوەڕیان وایە کە دەوڵەمەند هەژار دەچەوسێنێتەوە ودەوڵەتیش تەنیا وتەنیا ئامێری پارێزگاری کردنی بەرژەوەندییەکانی ساماندارانە، پشتیوانی لە لەناوچوونی هەموو جۆرە حکومەتێك دەکەن. لیۆ تۆڵستۆی، نووسەری خانەدانی بەناوبانگی ڕووسی، کە ئەویش ئانارشیست بوو، باوەڕی بە پەنابردنە بەر زەبر وزەنگ نەبوو بۆ بەدەستهێنانی ئەم ئامانجە بەڵام زۆربەی هەرە زۆری ئانارشیستەکان پشتیوانی لە زەبرو زەنگ دەکەن.

ساڵی ١٩٠٠ خاتوو گۆڵدمان یەکێ لە ئەندامەکانی کۆنفرانسی ئانارشیستی پاریس بوو، ڕۆژێك لە قاوەخانەیەك دانیشتبوو، هەواڵی تیرۆرکرانی هەمبێرتی شای ئیتالیای بەدەستی ئانارشیستێك خوێندەوە کە لە وڵاتە یەکگرتووەکانەوە هاتبوو بۆ ئەم کارە. لەبەرامبەر ئەمەدا پێی وابوو کە ئەم جۆرە کارانە تا ئەو دەمەی حکومەتە ناوەندجییەکان لە ئارادا بمێنن شتێکی لەچار نەهاتوون. شا هەمبێرت چوارەمین شا یاخۆ سەرۆکی دەوڵەت بوو کە لەماوەی شەش ساڵدا تیرۆکران. ساڵی ١٩٠١ویلیەم میکینلیی سەرۆکی ئەمەریکا بەدەستی لاوێك کەناوی لیۆن کزولگۆسز بوو بوو بە پێنجەم قوربانی. زووتر لەو ساڵەدا ئەو کابرایە ئامادەی گووتاربێژییەکی خاتوو گۆڵدمان بووە و دەڵێن گوایا پاشتر زۆلگۆسز ووتوویەتی

شـێوازی دەربڕینــە ئاگرینییەکـەی خـاتوو گۆڵـدمان کاریگـەری هــەبووە لەسـەر بڕیاردانی ئەمکارە خوێناوییە ئەنجام بدات.

گۆڵدمان خـۆی بـە ووتەبێـژی نـەك هـەر تـەنیا ئەوانـەی لـە ڕووی ئابوورییـەوە چەوساونەتەوە بەڵکو بەهی سـەرجەم خـەڵکی چەوسـاوە بـە ژنانیـشەوە دەزانـی. گەرچی ڕەخنەی ئەوەی لە ژنە ئەمریکاییـە خوازیبیارەکـانی مـافی دەنگـدانی ژنـان گرت کە بـۆ بەدەسـتهێنانی شـتێك هەوڵـدەدەن کـە لـە ڕوانگـەی ئەمـەوە هێزێکـی دەنگدانی بێواتایە لەبەر پشتگوێخستنی کێشەکانی ژنانی کرێکار، بیروباوەڕەکـانی لـە بـارەی ئـازادی ژنانـەوە لـەماوەی چـەند دەیەیەکـدا دەنگـی دایـەوە. گۆڵـدمان ئـەوەی چەسـپاند کـە ژن (مـافی پـشتیوانی لـەخۆ کـردن، ژیـان لـەپێناو خـۆی، ئەویندارکردن لەگەڵ هەر کەسێك کـە خـۆی حـەزی لێیـەتی، یـاخۆ بـەو ڕادەیـەی حەزی لێیەتی).

ئانارشـێزم ومافـەکانی ژنـان بـوون بـە تـەنیا دوو لـەو هـزر وئایدیۆلۆژیانـەی دوای ١٩٠٠ لـە پـشت جموجوڵـە ڕامیارییەکانـەوە بـوون. مارکـسیزم ولیبراڵیـزم وکۆنپـارێزی وسـەندیکالیزم وپۆپـۆلیزم و پێـشکەوتنخوازی هەنـدێك بـوون لـەو ڕەوتانە. لەماوەی دواتری سەدەکەدا کۆمۆنیزم وفاشیزم ونـازیزم بەشـێوەیەکی تایبەت بوون بەو نموونە بەهێزانەی ژنان وپیاوان بۆ ڕێگە چـارەی ڕامیارییانـەی گرفتە جۆراوجۆرەکانیان پەنایان دەبردنە بـەر. لـە ئـەنجامی ناکۆکیـەکانی ئـەم ئایدۆلۆژیا و ئەو ژن وپیاوانەی داکۆکیان لێیـا دەکـرد خـوێنێکی زۆر لەبەشـێکی زۆری جیهاندا ڕژا.

ڕاپەڕینی بۆکسەر یەکێك بوو لە کاریگەرترین کارەساتەکانی ساڵی ١٩٠٠. کۆمەڵێکی دژ بە بیانی بەناوی (بۆکسەران) (کۆمەڵگای مشتە هاوئاهەنگی) ئەو دەوروبەرەیان گەمارۆدا کە ئەنجومەنی دیبلۆماسی تیادا بوو لە پەکیندا. دوژمنایەت هەمیشەیی چەپاوڵی دەرەکیەکان لەلایەن چینییەکانەوە وکۆمەکی ماڵی لەلایەن بێوەژنە ئیمپراتۆرێکی ناوچەکەوە لە کۆتایی پشێوییەکەی (دەست لەناودەست لەگەڵ وشکەساڵی وهەندێکی کارەساتی دیکە لە سنووری باکوری چین و) بۆکسەردا ڕوویاندا. نزیکەی دوو مانگ دوای باڵیۆزخانەی بیانیان هێزێکی هەشت نەتەوەیی ئەوانەیان ڕزگار کرد کە مابوونەوە. قەیسەری بۆمباستی، ویلیەمی دووەم، بەرلەوەی لەم کردەوە سەربازییەدا سەربازەکانی لە ئەڵمانیاوە بەرێبکەون هانیدان کە وەك بەربەرییە شوێنکەوتووەکانی ئاتیللای تەتار بێ بەزەیی بن. لەدوای داگیرکردنی پەکیندا ژمارەیەکی زۆر لە سەربازی سەر بە سووپا داگیرکەرەکان درێغیان نەکرد لە ڕەفتارکردن بەپێی ڕێنوێنییە جەنگیەکانی قەیسەر.

ڕاپەڕینەکەی بۆکسەر وسەرکوتکرانە خێرایەکەی هێزێکی هەڵسوڕاوی دیکەی سەدەی بیستەمی دەرخست. پشێوی پەیوەندی نێو نەتەوەیی. بۆ ماوەی چەندان دەیە پێش ڕاپەڕینەکەی بۆکسەر هێزە بیانیەکان ئەو سیاسەتە ئیمپریالیە دواترە سوپاییەیان بەکاردەهێنا کە ڕەنگ بوو ڕەفتارێکی نادادپەروەرانە بەسەر چینییەکاندا بسەپێنێ وچی لەت لەت بکات بۆ ناوچەکانی دەسەڵات. تەنانەت سیاسەتی "دەرگای ئاوالا"ی وولاتە یەکگرتووکانیش کەمێك لە پلانەکەی وولاتە یەکگرتووەکان بۆ بەدەستهێنانی پشك لە سامانی چینی بێچارە زیاتربوو. کە

سەدەی بیستەم چووە پێش دیمەنی نێو نەتەوەیی درێژەی کێشا کە مەیدانی سەرەکی گوزارشت کردن بێت لە ناسیۆنالیزم، ئیمپریالیزم و میلیتاریزم.

زۆر لە زلهێزەکان ئیمپریالیزمیان پیشاندا بەوەی کە دەولەتە بەهێزترەکان حوکمی خۆیان بەسەر نەتەوە بێ هێزەککاندا سەپاند وهێشتەوە، بۆ نموونە لە بەرابیەکانی سەدەکەدا فەرەنسا مەراکیشی ناچارکرد کە (چاودێری کردن)ی ئەو قبولبکات. وولاتە یەککگرتووکان بەشێوەی نارەسی ژمارەیەك لە نەتەوە کاریبیەکانی خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، ژاپۆنیش کۆریای خستە سەر قەڵەمڕەوەکەی خۆی. دوای یەکەمین جەنگی جیهانی بەریتانیای مەزن و فەرەنسا دەستیان بەسەر بەشی خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا گرت. لە سیەکان وچلەکاندا میلیتاریستە ژاپۆنیەکان هەولیاندا بۆ سەپاندنی خواستی خۆیان بەسەر چیندا. هیتلەر وایدەبینی کە ئەمە مافی ئەڵمانیایە کە نەتەوە ئەورووپیەکان داگیربکات وبەسەریاندا زاڵ بێت، و ستالین کۆمارەکانی بالتیکی بە قەڵەمڕەوی خۆیەوە لکاند. لەدوای دووەمین جەنگی جیهاندا یەکێتی شورەوی دەسەلاتی خۆی بەسەر وولاتانی ئەورووپای خۆرهەلاتدا سەپاند.

وەك سەرپێ کەوتنەوەی سەدەی بیستەمی چین لە شکستی بۆکسەر سالی ۱۹۰۰ دەریخست ئەو هێزە لەلایەن نەتەوە بەهێزەکانەوە بەکارهێنران بۆ سەپاندنی ویستەکانیان بەسەر وولاتانی بێ هێزتر سەرکەوتوو نەبوون لە دامرکاندنەوەی خولیای نەتەوە پەروەری گەلانی داگیرکراو بۆ ئازادبوون لەژێر چەپۆکی دەرەکیەوە. بەم جۆرە فەرەنسا لە (هەڵ لوشینی) مەراکیشیەکاندا سەرنەکەوت، خەلکانی ئەمەریکای لاتین بەرهەلستی ئیمپریالیزمی ئەمریکاییان

کرد. سیاسەتی کۆلۆنی سەختی ژاپۆنی لەوەوە سەرنەکەوت کە کۆرییەکان بکات بە ژێر فەرمانێکی ڕام وشورەویش نەیتوانی گەلانی بالتیك بکات بەهاولاتی گەلێکی شادومانی شورەوی یاخود هەنگارییەکان بکات بە هاوپەیمانی ئارەزوومەندانە.

دوای دووەم جەنگی جیهانی ئیمپراتۆرە کۆلۆنیاییەکان یەك لەدوای یەك هەرەسیان هێنا، هەزاران ملیۆن کەس لە خەڵکانی ئاسیا وئەفەریقا بوون بە هاوولاتیانی نەتەوە نوێیە سەربەخۆکان لەماوەی نێوان ١٩٨٩و ١٩٩١دا ئیمپراتۆرییەتی شورەویش هەرەسی هێنا ودەوڵەتە دەست بەسەرداگیراوەکانی ئەورووپای خۆرهەلاتیش سەربەخۆیی خۆیان بەدەستهێنایەوە.

ساڵی ١٩٠٠ فردریك نیچەی فەیلەسوف لە تەمەنی پەنجاوپێنج ساڵیدا لەشاری ویمەر لە ئەڵمانیا مرد. بۆچوونەکانی ناوبراو ڕووبەڕووبوونەوەی سەرەکی بەسەر باوەڕە ئاینییە نەریتییەکانی خۆرئاواو ئاکارەکانی ڕۆژگاری خۆیدا سەپاند. ئەو دەمەی ئیمپریالیستیە خۆرئاواییەکان وا خۆیان دەدا (لە ووشەکانی هەڵبەستەکەی ڕودیار کیپلینگ- دوە) ئەمە ئەرکی سەرشانی سپی پێستە کە شارستانیەتیەکەیان بۆ گەلە (لەپاشتر)ەکانی ئاسیا وئەفریقا ببەن، نووسینەکانی نیچە متمانە کردن بە شارستانیەتی ڕۆژئاوا خۆشی داڕووخاند. نیچە کورە وەزیرێکی لۆتەری گووتاری ئەوەیدا کە (خودا مردووە) و فەلەیی -(یەك نەمرینە گەورەکە)- ستراتیژێکی کەسی لاواز بوو ویستی کە هێز بە کۆیلە بکات. ئەو ئەتاکانەی ئامۆژگاریکرد کە دەوێرن بۆ (ئەودیوی چاکە وخراپە) بڕۆن بۆ ئەوەی ببنە (مرۆڤی بالا)ی نوێ. سوکایەتی بە گیانی فەلەیی وزۆر لە کلتوورە خۆرئاواییانە کرد کە لەسەر دارو پەردوودی فەلەییەوە هەڵچنرابوون. نیچە ڕقی لە

دیموکراسی وئایدیای یەکسانییش دەبۆوە. ناوبراو پێشبینی داهاتوو بە نا ، شۆڕش وجەنگ وپاشاگەردانی دەکات.

تەنانەت دوای مردنی نیچەش، بیروباوەڕەکانی بە زیندوویی مانەوە، کە دەسەلمێنێ بایەخی فەرهەنگ –واتا دیدگا فەلسەفی وبەها فەرهەنگییەکان– یەکێکی دیکەیە لەو هێزانەی سەروسیمایان بەخشی بە سەدەی بیستەم. ژمارەیەکی زۆر لە هۆزان وان وهونەرمەند وشانۆنووس ونووسەری ئەوروپایی کەوتنەژێر کاریگەری دیدگایەکانی نیچەوە. لەماوەی سەدەی بیستەمدا جیهان بە سیستەمێکی هەرچی کاریگەرتری پەیوەندیکردنەوە تێهەڵکێش بوو کە کۆمەڵێك دیدگا وبەهای بەزۆری دژبەیەکی بێ وێنەی پێشکەش بە تاکەکان کرد. دیدگای نوێ کە زادەی بیرمەندانی ئەو نەتەوانەن کە لەڕووی تەکنۆلۆژییەوە پێشکەوتوون ودیدگا کۆنەکان زادەی فەرهەنگە نەریتیەکانن، لە جیهاندا بڵاوکرانەوە. وێڕای ئەوەی دیدگاکانی نیچە لە ڕوانگەی خەڵکانێکی زۆرەوە نوێنەرایەتی مەیدانخوازێکی زۆر بەهێزی دژ بە بەها نەریتیە خۆرئاواییەکانی دەکرد، تەنانەت لەوەش زیاتر خەڵکی جیهان لە سەدەی بیستەمدا هەستیان بە ئازادبوون –یاخود هەڕەشەلێکران– کرد، بەهۆی تیۆرییەکانی چارلز داروین، کارل مارکس و سیگمۆند فرۆیدەوە. هەندێ چاودێران ئەوانەیان ڕەتکردەوە کە بە تێکچوونی شێرازەی فەرهەنگی وئاینی سەردەمی هاوچەرخیان دادەنان. هەندێکی تر بە شکۆوە سەیری ڕێگەکانی فرە فەرهەنگی وئاینییان کرد.

ئەو قایلنەبوونە بە بەها خۆرئاواییەکان کە نیچە ووروژاندی بوو بە هۆی ئەوەی هەندێك کەس بەدوای ڕۆشنکردنندا بگەڕێن لە فەرهەنگەکانی دیکەوە. پاول

گـاوگوین—ی وێنەکێـشی فەرەنـسی خۆشـباوەڕی بـە مـەتریالیزمی خۆرئـاوایی ڕەواندەوە و بەدوای ئەوەدا گەڕا کە بە هەبوونێکی شکۆدارتری دادەنا لـە تـاهیتی لـە کاتێکدا پـاول دیـوزین—ی هـاوڕێی نیـچە بـوو بـە کارناسـێکی پێـشڕەو لەسـەر فەلسەفە ئاینییـەکانی هینـدی دێـرین. پاشـان هەنـدێك کـەس لـە ئـەوروپا وووڵاتـە یەکگرتووەکاندا بوون بە بوودی یاخۆ وەك محەمەد عەلی پاڵەوانی یـاری کۆڵەمـشت بوو بە موسوڵمان.

بۆ کۆتایی هێنان ئەم پێنج ڕوونکردنەوە کورتـە: ئۆرفایـل ودیلبـەرت رایـت لـە کتـی هـۆك،گرانی لـە هیندسـتان، چـالاکیەکانی ئیمـا گۆڵـدمان لـە پـاریس، یاخیبوونی بۆکسەر ومردنـی نیـچە— نمایـشیئەو سـاڵانە دەکـەن کـە دێنـە پـێش. ئەمانە پێنج لەو هۆکارە سەرەکیانە پێشاندەدەن کە ئـەم دەقـە لـە تـاوتوێکردنی مێژووی سـەدەی بیستەمدا جـەختیان لەسـەر دەکـات: داهێنـانی خێـرای زانـستی وتـەکنۆلۆژی، ئابوورییـەکی جیهـانی تاڕادەیـەکی زۆر ناسـراو بـە ناهاوتاییـەکی ئابووری جێ پێ قایم، ناکۆکیـەکی کۆمەڵایـەتی وڕامیـاری بـەردەوام، دەسـتدرێژی کاردانـەوە لەبەرامبەریـدا لـە پەیوەندییـە نێـو نەتەوەییەکانـدا و بڵاوبوونـەوەی بەرفراوانی دیدگا فەلسەفی وبەها کەلتوورییە دژ بەیەکەکان. ئەم هێزانە بەشێوەی تاك دەستانە کاریان نەدەکرد، بەڵکو بەشێوەی یەکتا تێهەڵکێش دەکران بۆئەوەی ئەنجامگـەلێکی گرنگیـان هـەبێت لـەماوەی سـەدەی بیـستەمدا. نموونەیـەکی تێکهەڵچنراوی ئەم هۆکارانـە ئـەم نامیلکەیـەی بۆکسەرە کـە ئامـاژەیـە بـە گـۆڕانی تـەکنۆلۆژی وپێکـدادانی بـەها فەرهەنگییـەکان، هـەردووکیان دەکـات لەمیانـەی دوژمنایـەتی کرانـی بیانییـان لەلایـەن بۆکـسەرەکانەوە: گەیـشتنی نـسکۆ لەبـەر

ئەهریمەنــــە بیانییەکانەوەیـــە. ئەمانـــە هاتوونەتـــە چـــین بـــۆ بڵاوکردنـــەوەی باوەڕەکانیان، بۆ بوونیاتنانی خەتـەکانی تەلـەگراف، بـۆ دانـانی ڕێگـە ئاسـنەکان. باوەڕییان بە گیانە پیرۆزەکان نیە و سوکایەتی بە خواوەندەکان دەکەن. ئەمە ئارەزووی خواوەندەکانە کە هێڵـەکانی تەلـەگراف ونجـر ونجـڕ وڕێگـە ئاسـنینەکان لەت وپەرت بکرێن وسەری ئەهریمەنە بیانیەکان پەل بدرێن.

ئەو پەرتوکەی بەردەست ئەوە پیشان دەدا کە چۆن ئـەو هێزانـەی ئـەم پێـنج ڕووداوەیان لە هەناوی خۆدا حەشارداوە، بەڕێگەی جۆراو جـۆر خراونەتـە سـەریەك بۆقاڵبڕێژکردنی سەدەی بیستەم.

١- سەردەمی ئیمپریالیزم.

٢- ڕەوتە گشتیەکان پێش یەکەم جەنگی جیهانی.

جیهـان لـەژێر ڕکێفـی خۆرئـاوادا پێـی نایـە سـەدەی بیـستەمەوە. نەتـەوە سەرەکیەکانی ئەورووپا و وڵاتە یەکگرتووەکان و لە ڕوماڵکردنە زانستی و ئەفراندنـە تەکنۆلۆژییەکاندا رابەرایەتی گێتیان دەکرد وبەهۆی ئابوورییەکی سەرێژ و هێزێکـی سوپایی زەبەلاحەوە دەستیان بەسەر بەشی هەرە زۆری گۆی زەویدا گـرت. لـەنێو نەتـەوە نـا خۆرئاواییەکانـدا تـەنیا ژاپـۆنی بـە نیمـچە خۆرئـاوایی بـوو هاتـە ڕیـزی جیهانی خۆرئاوا سالارییەوە.

خۆرئاواییـەکان باوەڕیـان وابـوو کـە ئـەو پلـەو پایـە بـەرزەی هەیانـە زادەی فەرهەنگە باڵاکەیانە. لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا زۆربـەی گـەلانی خۆرائـاوا لـە ئاستێکی گوزەرانی بێوێنە بەهرەمەند بوون، هەروەك چۆن لە دەرفەتێکی باشـتری پـەروەردە وفێربـوون، چـاودێری تەندروسـتی و خزمـەتگوزاری کۆمەڵایـەتی-یـش

بەهرەمەنـد بـوون. داهـاتوو چـارەڕوانی پێـشکەوتن ودەسـەڵاتێکی بـەردەوامی خۆرئاواییەکانی لێدەکرا.

کە پەردە لەڕووی ڕاستیەوە لاچوو، هێزی خۆرئاوا هێزی خۆرئـاوا بـەو ڕادەیـە زەبەلاح نـەبوو کـە وا دەهاتـە بەرچـاو. کێشمەکێشمی نـەژادی وئـایینی تـەنگی بـە ژمارەیەکی زۆری نەتەوە خۆرئاواییەکان هەڵچنیبوو، هـەروەك چـۆن دووبەرەکییـە ڕامیارییەکانی نێوان هێزە لیبراڵ وپارێزگار وسۆسیالیستەکانیش بەرۆکی گرتبوون. ئەمە جگە لەوەی زۆربەی نەتەوە خۆرئاواییـەکان هەسـتی دوژمنایـەتیان بەرامبـەر دراوسـێکانیان پـەروەردە دەکـرد. ئـەم گرژیانـە تـا ئەندازەیـەك زادەی مێـژووە دورودرێـژەکانی ڕکابەرایەتیـە نەتەوەییـەکان لـە ئـەورووپا وکێبـەرکێ کـردن بـۆ دەسـتگرتن بەسـەر ناوچـەکانی جیهـان بـوون. ئـەو دەمـەی نەتـەوە ئەورووپیـەکان لەپێناو دەستەبەرکردنی زێدە بەرامبـەر خەنیمـەکانیان دەسـتیان بـۆ بـەهێزکردنی سوپا وبەدەستهێنانی هاوپەیمانان برد، ئـەم سیاسـەتانە گوشـای سـەردەمەکەیان سەخت تر کرد وسەرەنجام بووە مایەی جەنگێکی گشتی: یەکـەم جـەنگی جیهـانی کە بووە هۆی لاوازبوونی هێزی ئەورووپا لە جیهان.

– زانست و تەکنۆلۆژیا :

خـەڵکی ئـەورووپا و وولاتـە یـەکگرتووەکان شـانازییەکی زۆریـان بـە شـەپۆلی ڕێدۆزییـە زانـستی وپەرەپێدانـە تەکنۆلۆژییـەکانی سـەدەی نۆزدەهـەم وسـەرەتای سـەدەی بیـستەم دەکـرد. بەرهەمـەکانی چـارلز داروپـن لـەبارەی: (ڕەچـەڵەکی جۆرەکان بەهۆیەکانی هەڵبژاردنی سروشتیەوە ١٨٥٩) و (کەوتنەوەی مرۆ ١٨٧١). لەبواری بایلۆژیدا گۆڕانکارییەکی ڕیشەییان لە تێگەیشتن لـەبارەی مێـژووی مـرۆوە

بەرپا کرد. داروین ئەو تیۆرەی دانا کە جۆرە جیاوازەکانی گیانداران بە مرۆڤیشەوە لە ڕەوەندی هەڵبژاردنی سروشتیەوە سەریانهەڵداوە کە بەهۆی ئەمەوە گونجاوترینیەکانیان ماونەتەوە و پەرەیان سەندووە. ئم بۆچوونەی داروین بەشێوەیەکی بەرفراوان قبوڵکرا، بەڵام خەڵکێکی زۆر نەیانتوانی لەگەڵ ئەو ووتانەدا بیانگونجێنن کە کتێبە ئاسمانیەکان سەبارەت بە ئافراندنەوە دەیانڵێن. هزرەگانی داروین شانبەشانی پێشکەوتنەکان لەبواری توێژینەوەی زەویناسی وبەبەردبووناسی بوونە هۆی ڕوماڵگەلێکی پتر کە تێگەیشتنێکی زۆرتریان سەبارەت بە مرۆی بەرایی وکۆمەڵگاکانیانەوە بەدەستەوەدا.

دەروونناسان زەمینەیەکی نوێی هەڵسەنگاندنیان هێنایە کایەوە، کە فەرمانە ئاوەزییەکانی مرۆی کرد بە بابەتی توێژینەوە ولێکدانەوە. لە دەستپێکی سەدەی بیستەمدا سیگمۆند فرۆید لە ڕیزی پێشەوەی پزیشکە دەروونناسیەکاندا بوو، تیۆرەکانی بەدەوری ئەو باوەڕەیدا دەخولانەوە کە هێزە نائاگاییەکانی بەدوای چێژدا گەڕاوی وەك ئارەزووی زایەندی بزوێنەری مرۆن. ناتەباییی ئەم ئارەزووە نائاگایانە لەگەڵ ئەو هێزە دەروونییانەی لەگەڵ (ڕاستی)یە کۆمەڵایەتیەکاندا سازگارترن، بەزۆری دەبنە مایەی ناکۆکی نێو دەروونی.فرۆید بۆ لێکۆڵینەوەی کێشە گرنگەکان پەرەی بە دەروونشیکاری دا. واتە ڕەوشی شیکردنەوەی هۆشی نائاگایی کە زۆرجار لەڕێگەی شیکردنەوەی خەونەکانەوە ئەنجام دەدرێ. ئەم تیۆری و ڕەوشانەی فرۆید لەلایەن شارەزایانی دواتری ئەم بوارەوە پشتیوانیان لێکرا ورەخنەشیان لێگیرا.

ساڵی ١٨٩٥ ولیهێلم روبنتجن ئەم شێوە تیشکەی ڕومالکرد کە دەتوانێ بەناو مادە ناڕۆشنەکاندا گوزەربکات. ئەم تیشکە ئێسکانە هەروەك خۆی بەم چەشنە ناوی بردوون پەیتا پەیتا لەزۆر بواری فیزیا وپزیشکەوانی دا بەکارهێنران. لەکاتێکدا ئەنتۆین بیکۆریل تیشکاوەری یۆرانیۆمی ڕومالکرد،بەدەستپێکردن بەم ڕووماڵکردنە (ماری) و (بێری کوری) هەندێ توخمی تێشکاوێژی دیکەیان تاوتوێکرد، کە لە ساڵی ١٨٩٨دا ڕادیۆم وپۆلۆنیۆمیان ڕومالکرد. کارەکیانیان ڕێگەیان بۆ دانانی بەردی بناغەی ئەو توێژینەوانە خۆشکرد کە سەدەی بیستەم لەبارەی توێژینەوە ئەتۆمیەکانەوە ئەنجامدران.

هەروەك چۆن داروین گۆڕانکاری لەباوەڕ بەرامبەر بە سروشتی مرۆدا بەرپاکرد، ئەلبەر ئەنیشتاینیش گۆڕانکری لەباوەڕ بەرامبەر سروشتی مرۆدا بەرپاکرد. ناوبراو دەریخست کە ووزە یەکسانە بە بارست جاران دووجای خێرایی تیشك (و= ب خت٢). شانبەشانی ئەنجامگیرییەکەی ئێرنست راسەر فۆرد وکەسانی دیکە دەربارەی ئەوەی کە ئەتۆم کەڵەکەی ئەو ووردکانەیە کە زۆر بەخێرایی دەجوڵێن، بیردۆزەکەی ئەنیشتاین ئەوە دەخاتە ڕوو کە ئەگەر بتوانرێ ناوکی ئەتۆمەکان بگۆڕدرێن ئەوا ووزەی گەرمی (بەکارهاتوو: بەسوود) بەرەڵلا دەبێت.

ئەنیشتاین وێڕای توێژینەوەکانی لەبارەی ئەتۆمەوە، تیۆرە پەیوەندارەکەی (ڕێژەییەکەی) ناوبراو وڕوماڵکارییەکانی دیکەی گۆڕانکارییان لە تێگەیشتنی مرۆدا بەرپاکرد لەبارەی ئەو هێزانەی گێتی پێکدێنن. لەماوەی دوو سەدەی پێش ١٩٠٠، زانایان باوەڕیان وابوو کە گەردوون ڕیزبەندییەکی تایبەت بە شوێنی سێ ڕەهەندییە و دەشێ لە پنتێکی پەتی لە سەرچاوەکەوە وتایبەتەکانی پێوانە

بکرێن. ئەنیشتاین ئەوەی خستە ڕوو کە کات (چوارەمین ڕەهەندە) کە پەیوەندی هاوبەشی لەگەڵ سێیەکەی دیکەدا هەیە. بەبۆچوونی ناوبراو چی تەماشاکەر لە جوڵەدابێ یان نا، خێرایی تیشك هەر هەمان شتە وبەم جۆرەش پنتی پەتی سەرچاوە لە ئارادا نیە. پێوانەکردن بەم واتایە (پەیوەندداره).

خۆرئاواییەکان شانازییەکی تایبەتیان بە پێشکەوتنەکانی بواری تەندروستی وتەمەندرێژی دەکرد. سەدەی نۆزدە کارەکەی جۆزێف لیستەر لە نەخۆشخانەکاندا هەل ومەرجە تەندروستییەکانی بەرەو ئاستێکی باشتر برد. زەیستانە تا (تای سەرچلە)، کە هۆی سەرەکی بەمندالچوونی ژنان بوو ریشەکێشکرا. ناسینی هونەری سڕکردن (بێهۆشکردن) توانای ئەوەی بە پزیشکان بەخشی نەشتەرگەری ئالۆزتر ئەنجامبدەن کە بووە هۆی پاراستنی ژیانی خەڵکانێکی لە ژمارە نەهاتوو. لویس پاستۆر ورۆبەرت کوژ سەلماندیان کە بەکتریا هۆی ژمارەیەکی زۆری دەردە جاران بێ دەرمانەکانن ودەکرێ لەرێگەی کوتنەکان و داودەرکان پێدانەکان وپشتگیرییە تەندروستیەکانەوە دەستیان بەسەردا بگیرێت. لەئەنجامدا لارەشە وهاری، کە ژمارەیەکی زۆر ئاژەڵی لە جیهاندا قەلاچۆ کردبوو، دەستیان بەسەردا گیرا وچوار هۆ سەرەکیەکەی مەرگ لای منداڵان: ئاولە، وەناق (دیفینیریا)، لەرزوتا (تیفۆ) و سورەتا واپێچوون لە سەروبەندی بنەبڕکردندابن لە جیهانی خۆرئاوادا. هەرزوو لە دوای ۱۹۰۰دا کیمیاناسەکان ڤیتامینەکنیان ڕومالکرد و پەرەیان دا بە داودەرمانە سولفاییەکان، کە لە قەلاچۆکۆدنی بەکتریا دەردزاکاندا یارمەتی مرۆیاندا.

ئەم پێشکەوتنانە لە بواری چاودێری تەندروستی بەرزەفتکردنی پەتاکانەوە بەدەستهاتن، بەشدارییان کرد لە زۆرکردنێکی بەرچاوی دانیشتوان لە درەنگانی سەدەی نۆزدەیەمدا، ئەمەش هەر تەنیا ئەوروپا و وڵاتە یەکگرتووەکانی نەگرتەوە، بەڵکو بەشی زۆری جیهانی گرتەوە. زیاتر لە دوو چەندانە بوونی ژمارەی دانیشتوانی ئەوروپا لەماوەی نێوان ساڵانی ١٨٠٠- ١٩٠٠دا، بەپلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ نزمبوونەوەی ڕێژەی مەرگ. لەلایەکی دیکەشەوە زۆربوونەکانی دانیشتوان بەزۆر دەبووە هۆی پەیدابونی لەئەندازەبەدەر ئاپۆرە لە ژمارەیەك لە شارە خۆرئاواییەکاندا. کە چاودێرییەکی باشتری تەندروستی لە بەشەکانی دیکەی جیهاندا بەرەو ناوچەکانی وەك هیندستان وچین بڵاوبووەوە، ئەمەش بەشداریکرد لە زۆرکردنە دانیشتوانیەکان کە زۆرجاران لە ئاستی ئەو کەل وپەلە خۆراکیەی دەست دەکەوت، دەردەچوو.

بینینە زانستیەکان گەرایی فرەیی لە ئەندازە بەدەری تەکنۆلۆژیان دانا. ئەو ئەندازیارانەی پەرەیان بە تۆڕبین و دینەمۆدا بەشێوەیەکی زۆر کاریگەرانە بەرهەمهێنانی هێزی کارەبایان خێرا کرد. تەکنیکە نوێیەکانی پاڵاوتنی نەوت سووتەمەنی گازۆلین ودیزلییان بەرهەم هێنا بۆ ئەوەی وەك ووزە لەو مەکینە نوێیانەی لە ناوەوە ڕا وزە سوتێنن. ئەو کیمیازان وکارناسە تەکنیکیانەی ئاوریشم دەستکرد وڕەنگە دەستکردەکانیان لە ئەزموونگەدا ڕەنێوهێنا سەردەمێکە نوێی کەل وپەلی دەستکردیانهێنایە ئاراوە، لەکاتێکدا کە داڕشتە نوێیە کانزانییەکانیان ڕوماڵکرد، ئەمە موژدەی جۆراوجۆرییەکی فراوانتر بوو لە بەرهەمە کارخانەییەکان. داهێنەرەکانی پیشەسازی، پارچەی یارای گۆڕینیان بەکارهێنا وسیستەمی

تێکبەستنیان هێنایە ئارا بۆئەوەی بەرهەمی کارخانەیی بەهێزبکەن وبەجۆرە کەلوپەلە کارخانەییەکان هەرزانتر بکەن. پەرەپێدانی شیشی بیناسازی وکۆنکرێتی بەشیش وبالآبەری (ئاسانسۆری) کارەبایی ڕێیان لەبەردەم گەورەبوونی شارەکان بەهەردوو ئاراستەی ئاسۆیی وشاوولی خۆش کرد.

ئەو فیزیاناسانەی توێژینەوەیان لەسەر کارەبا وپەیوەندی کارەبا بە شەپۆلە موگناتیسیەکانەوە کردبوو، لەگەڵ داهاتنی سالی ١٩٠٠دا وەرچەرخانیان لە تێگەکانی پەیوەندیگرتن بەرپا کردبوو. تەلوگراف لە سەدەی نۆزدەدا بەچاکی چەسپابوو، تەلە ژێر دەریاییەکانیش کیشوەرەکانیان پێك لکاندبوو. تەلەفۆنیش لەسەرەتای سەدەی بیست کاریگەری خۆی خستەسەر ناوەندە شارستانیەکان ڕەنگە ئەوەی لە هەموو پێشکەوتنەکانی دیکە لە بواری پەیوەندیگرتنەوە دڵخۆشکەر بوبێ ئەوەبێ کە لە سالی ١٨٩٧ هاتە کایەوە، کاتێ کە گیو گایلمۆ مارکۆنی لە ئاسمانەوە بەهۆی دەنگ ڕاگوێزێکە بێ تەل پەیامگەلێکی ڕەوانە کرد. ئەمە هەر زوو سەردەمی ڕادیۆی بەدوادا هات. پێشکەوتنەکانی فۆتۆگراف شتێکی سەرسوڕمێنی داهێنا کە فیلمی سینەما بوو.

ڕەنگە لە دیدی ئەوانەی لە سالانی زووی سەدەی بیستەمدا ژیاون هیچ کامێ لە داهێنانەکان بە بارتەقای چرای کارەبایی مۆری خۆی لە تەوێڵی دەرچوون بەرەو ڕۆژگارێکی نوێ نەدابێ. تۆماس ئەدیسۆن پاشەکشێی بە تاریکی کرد وکە موژدەی بەرپاکردنی شۆڕشێك بوو لە ئەلگۆی ژیانی ڕۆژانەی خەڵکدا. ئەمە بۆ خەڵکانێکی زۆر لە ڕۆژئاوادا، بەتایبەتی، بۆ ڕووناککردنەوەی ناوماڵ شتێکی بێ مەترسی تر و

خاوێن تر وکاریگەرتر بوو. ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە بتوانرێ هەموو جۆرە چالاکیەك بەدرێژایی شەو وڕۆژ ئەنجام بدرێت.

لەبواری گواستنەوە وگەیاندندا، پەیدابوونی شەمەندەفەری هەڵمی و کەشتی هەڵمی لە سەدەی نۆزدەیەم تاڕادەیەکی زۆر بووە هۆی خێرابوونی گەشتکردن بەسەر ووشکانی وبەناو ئاودا. دوای ١٩٠٣ بەهۆی تەقەلاکانی ئۆرفاییلو ویلبێرت ڕایت و ژمارەیەکی زۆر کەسی دیکەشەوە خەونی دێرینی گەشتکردن بەڕێگەی ئاسمانەوە بەدیهات. ئەم دەستکەوتە لە فڕۆکەوانیدا هەرزوو واتای ئەوەی گەیاند کە خەڵك دەتوانن لەباتی ئەوەی بە مانگ وهەفتە، بەماوەی کاتژمێر وڕۆژ گەشت بە جیهاندا بکەن.

ئەوەی بۆ خۆرئاواییە ئاساییەکان گرنگتر بوو پێشکەوتنی مەکینە لە ناوخۆ سوتێنەکان بوو کە بوونە هۆی دروست کردنی ئۆتۆمبێل ئەو دەمەی ساڵی ١٩٢٠ کە هێشتا تازە ئۆتۆمبێل پەیدابوو بوو مزگێنی گۆڕینی ئەلگۆکان و کاتی دەستەبەتاڵی بەسەر تاسەری خۆرئاوادا وبە کردەوەش بە زۆربەی جیهاندا.

هەر هەمان ئەو پێشکەوتنە زانستی وتەکنۆلۆژییەی ئاستی ژیانی مرۆیی بەرزکردەوە،چالاکانەش هۆیە نوێیەکانی داڕووخاندنیشیان دادەهێنا. زانا و میتاڵناسە ماددەکانی وەك باروت تی ئێن تی ونایتۆگلسرین ٣(on٣) c٣h٥ یان داهێنا کە وێرای تەقینەوە و دەرفرتاندنن. ئەو پێشخستنانە لە بواری هونەرەکانی گولە هاوێژی و دارشتنی میتاڵ، جۆرێکی نوێ لە تۆپ هاوێژ وخومپارە هاوێژ و چەکی دەریایی– و چەکی نوێ یاخۆ پارچەی پەرەپێدراویان هێنایە ئارا. وەکو ساچمەپژێن، مینی دژە مرۆ و نارنجۆکی دەستی. ئێستا بەهۆی سیسەمی نوێی

ئاراستەکردنەوە ئەم چەکانە دەتوانن زۆربە ووردی نیشان بپێکن. بەم جۆرە زۆربوونی ژمارەی تەنگاوتەکان بەرێژەی گولله هاوێژراوەکانە.

ئەو کارمەندە تەکنیکیانەی لە بواری سووتەمەنی نوێ و تەکنۆلۆژیای هایدرۆ لیکی کاریان دەکرد کەشتی ژێر دەریاییان بەرهەمهێنا کە هێزی پاڵنەری سەربار وتەکنۆلۆژیای ئاراستەکردن کەشتی ژێر دەریا ڕۆیان بە مووشەکی ژێر دەریایی متمانە پێکراو چەکدارکرد.

دام ودەستگا سوپاییەکان بەشێك لەو تەکنیکانەی لەگەڵ مەبەستەکانی خۆیاندا گونجاند کە لە بنجدا بۆ بەکارهێنانی سڤیلی دروستکرابوون. کەڵەکەبوونی بەروبوومی کوتاڵ وپۆشاك، لەگەڵ داهێنانی خستنە قووتوو بە بەستووکردن، ئەوەی گەیاند کە گەلان ئەوەیان لەباردایە ژمارەیەکی زۆر سەرباز وهێزە دەرياییەکان کۆکەنەوە وتەیاریان کەن وخۆراکیان پێبدەن. بە کەڵکوەرگرتن لە ڕێو ڕەوشە نوێیەکانی هاتوچۆ وپەیوەندی کردنەوە، سەرلەشکرەکان تونیان لەسەر ڕووبەرێکی بەرفراواندا ئێرە وئەوێ بەهێزیان بکەن، توێشوویان بۆ فەراهەم کەن وئارایشتیان بدەن.

چاك یان خراپ لەم هەوارەدا تەقینەوەیەك لە پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆژیدا هەبوو. کە لە ڕاستیدا ئەمە بۆ ژمارەیکی زۆری خەڵك دژوار بوو کە ببینێ چۆن بەرگری ئەم خێراییە دەگیرێت. ساڵی ١٩٩٩ سەرۆکی چەسپاندنی داهێنان داوای لە ویلیەم ملگنلی سەرۆك کۆمارکرد کە ئەم نووسینگەیە هەڵوەشێنێتەوە لەبەرئەوەی وەکو دەڵێ هەموو ئەو شتانەی ڕێیتێدەچێ دابهێنرێن داهێنران.

- ڕەوتە ئابورییەکان :

لە بەرەبەیانی سەدەی بیستەمدا دەسەڵات ئابووری جیهان لەژێر دەسەڵاتی خۆرئاوادابوو. پێش سەدەی هەژدەیەم سیستەمە ئابورییەکان بەشێوەیەکی سەرەکی خۆجێی و ناوچەیی بوون بەلام لەگەڵ دەرکەوتنی ساڵی ١٩٠٠ تەشەنەکردنی خێرای شۆڕشی پیشەساوی پێ بەپێ لەگەڵ پەرەسەندنەکانی بواری هاتوچۆکردن پەیوەندی بەستندا ئابوورییەکی جیهانیان هێنایە ئاراوە، کە دڵی ئەم ئابوورییە جیهانییە کە ووتبووە ئەوروپای خۆرئاوا، بەتایبەتیش بەریتانیای مەزن وئەڵمانیا و وولاتە یەکگرتووەکان. ئەم گەلانە ئاوێتەی پیشەسازی قورسیان هێنایە کایەوە کە بەردی کانزایی وپەترۆڵ و کارەبا تیایدا ووزەیان دەبەخشیبۆ بەرهەمهێنانی ئاسن وستیل،مەکینە وکەل وپەلی دەستکرد وکوتاڵ. بەریتانیای مەزن لە سەرەتای سەدەی نوزدەیەمدا گەورەترین گەلی پیشەسازی جیهان بوو بەڵام لەگەڵ دەرکەوتنی ساڵی ١٩٠٠ دا ئەم پێشڕەوایەتیەی لەبەرامبەر ئەڵمانیا و وڵاتە یەکگرتووەکان لەدەستچوو.

پەرەسەندنی پیشەسازی لەناو گەلانی خۆرئاوادا کاریگەرییەکی قوولی لەسەر ناوچەکانی دیکەی جیهاندا هەبوو. کاتێ پیشەسازییەکانیان لە ئەندازە سەرچاوە وبازاڕە خۆجێیەکان تێی پەڕاند. گەلە بەپیشەسازیبووە خۆرئاواییەکان کەوتنە گرتنەبەری سیاسەتی ئیمپریالیزم. (بڕوانە خوارەوە)، دەستیان بەسەر دەسەڵاتی ئابووری کەرتەکانی ئەمەریکای لاتین، ئەفەریقا وئاسیادا گرت، بۆ دەستەبەرکردنی کەرەستەی خاو ئامادە بۆ کارگەکانیان و پەیداکردنی بازاڕی مسۆگەر بۆ ساغکردنەوەی زێدە بەرهەمەکانیان.

ئەو هێزە خەملیو وئەو زەبرەی هێزە پیشەسازییە چەسپاوەکان هەبیانبوو هانی هەندێك لە گەلە کەمتر پێشکەوتووەکانی وەك ڕووسیا وژاپۆنی دا کە

لەڕێگەی دەستکردن بە بەرنامە چڕەکانی بەپیشەسازیکردنی خۆیان پارێزگاری لە خۆیان بکەن.

گەرچی سەرمایەگوزارە ئەوروپییەکان ژمارەیەکی کەم کارگەی ڕستن وچنینیان لەملا ولای جیهاندا دامەزراندبوو، بەگشتی ژمارەیکی کەم پیشەسازی قورس لەدەرەوەی ئەوروپا، ولاَت یەکگرتووەکن وژاپۆن هەبوو. لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاَتی بەریتانیا لە کەنەدا، نیوزلەندا، ئوسترالیا و ئەفەریقا باشوور ولەناوگەلانی ئەمەریکای لاتین لە مەکسیك وبەرازیل و ئەرجەنتین وئۆرۆگوای وچیلیدا ئامادەکردنی کانزا و فایبەر وپێست باوترین شێوازی بەرهەمهێنانی کارخانەیی بوون. ئەم گەلانە لە کەلوپەلە کارخانەییە سەرەکیەکاندا پشتیان بە ئەوروپای خۆرئاوا و ولاَتە یەکگرتووەکان بەستبوو. خۆرئاواییەکان لەتەك پەرەسەندنە پیشەسازییەکانیاندا، لەماوەی ئەم سەدانەدا، پەرەیان بە تۆڕە جیهانیەکاندا بۆ بەرهەمهێنان و دابەشکردنی بەروبوومی کشتوکاڵی. لەگەڵ داهاتنی ساڵی ١٩٠٠ گەلێك ناوچەی جیهانیان کرد بە مەزرای پان وپۆڕ، واتە مەڵبەندەکانی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی کە بڕێکی زۆر وزەوەند کەل وپەلی خۆراکیان بەدەستەوەدا. لە ئەنجامی ئەمەدا هاوولاَتیانی ئەوروپای خۆرئاوا و ولاَتە یەکگرتووەکان وایانلێهات بتوانن لەسەر مێزی خۆراکی خۆیان دانیشن وچێژ لە مۆزی هوندوری و قاوەی بەرازیلی وبەهاراتی خۆرئاوای هیندستان وشەکری کوبا وئەناناسی هاوایی و چای سیلان وگەلێ بەروبوومی دیکەی شوێنە جیاجیاکانی جیهان وەربگرن.

کە سیستەمی کارخانەی پیشەسازی و بەروبوومی کشتوکاڵی بەدەوری جیهاند بلاَوبۆوە خەڵك لە کیشوەرێکەوە بەرەو کیشوەرێکی دیکە جوولاَن، یاخود ناچارکران کە بجوڵێن لەپێناو فەراهەمکردنی کاری پێویست بۆ پێشکەوتنی

ئابووری. بۆماوەی چەند سەدەیەك خۆرئاواییەكان ڕەشپێستە ئەفریقاییەكانیان ڕاگواستە نیوەگۆی خۆرئاوایی بۆ ئەوەی وەكو كۆیلە لە مەزراكاندا كاربكەن. لەگەڵ داهاتنی ١٩٠٠ دا بازرگانی كۆیلە كۆتایی هات، بەڵام ڕەوكرنێكی مرۆیی نوێ دەستی پێكردبوو. ملیۆنەها كەسی ئەوروپایی دنەدرابوون لە ئەمەریكای باكور وباشوور وئوستورالیا ونیوزلەندا نیشتەجێ ببن. چینی وژاپۆنیەكان -كە ژمارەیەكی زۆریان كرێكاری بەڵێندەرایەتی بوون- بۆ كاركردن لە مەزراكانی هاوابی وڕێگە ئاسنینەكانی ئەمەریكای باكور چوون. هیندییەكان لە كانەكانی خۆرهەڵات، باشووری ئەفریقا ومەزراكانی كاریبیادا كاریان دەكرد.

ئابوورییەكی جیهانیی كاریگەر بەبێ شۆڕشێكی هاوكات لە تەكنۆلۆژیای باروگواستنەوەی بازرگانیدا ئەستەم بوو. كەشتی هەرچی بەتواناتر وخێراتر لەگەڵ كەشتی ژێر دەریا ڕۆی بازرگانی بەریتانی بەڕێخران كە كەرەستەی خاو وبەروبوومی تەواوكراویان باركردبوو بۆ هەمووگۆشە وكەنارێكیجیهان. ئەندازیاران نۆكەندی سوێس وپەنەمایان هەڵكەند لەو شوێنانەی كە پێكهاتەی ووشكانی بەربەست بوون لە بەردەم هاتوچۆی ئاویدا، لە ئەوروپای خۆرئاوا و وڵاتە یەككرتووەكاندا تۆڕە نۆكەندەكانیان دروستكرد و یاخود بەندەرەكانیان فراوانكرد.

شەمەندەفەری بارهەڵگری بەهێزی هەڵم لەسەر هێڵی ئاسن لەسەر ووشكانیكاردەكات كۆمەكێكی گەورەی بە پەرەسەندنی ئابووری كرد، لە دەستپێكی سەدەی بیستەمدا. خەتەكانی شەمەندەفەر ئەوروپای باكوری خۆرئاو ژاپۆن، بەشێكی زۆر لە باكوری ئەمەریكای بەیەكەوە گرێدا. هەرچەندە لە شوێنەكانی دیكەی جیهاندا كە ڕێگای ئاسن كەمتر بوون توانی تێچوونی ئەو مەكینە بارهەڵگرەی كە بەهۆی لە ناوەخۆ سووتاندنی سووتەمەنی كاردەكات كە

بۆ ئۆتۆمبێل بەکاردەهات هەر بە نەناسراوی مایەوە چونکە هیچ ڕێگایەکی هەمیشەیی هەرزان ساز نەکرا.

ئەو پەرەسەندنە ئابوورییە گەورەی لە دەوری جیهاندا دەستی پێکردبوو، بە سەرمایەگوزاریکردنی پارەوە بەهێزترکرا وبەریتانیای مەزن لەگەڵ سووڕانەوەی سەدەدا لەم بوارەدا زۆر باڵا دەست بوو. لەندەن چەقی دارایی، دانانی پێوەرەکان لە بواری سەرمایە گوزاری، بانکدەری و بیمەکردن و. (بیمەکراو لەلایەن ویدو ئۆف لەندەن) دوای مسۆگەری پارێزراوی وسەلامەتی بوو.

– ڕەوتە کۆمەڵایەتیەکان :

وەرچەرخانی خێرای ئابووری جیهان لەگەڵداهاتنی دەیەکانی سەرەتای سەدەی بیستەمدا ژمارەیەکی زۆر گۆڕانی کۆمەڵایەتیان هێنایە کایەوە، بەتایبەتیش لەناو گەلانی ئەوروپای خۆرئاوادا. هەروەها ئەم گۆڕانانە لە وڵاتە یەکگرتووەکان وبە ئەندزەیەکی کەمتریش لە ئەمریکای لاتین وژاپۆنیشدا دەرکەوتن. سەدەکە زیاتر بەرەوپێش چوو هەندێك لەم گۆڕانە کۆمەڵایەتیانە لە پارچەکانی دیکەی جیهاندا بڵاوبوونەوە.

بەسانایی جێگۆڕکێی دانیشتووان وچینە کۆمەڵایەتیەکان یەکێ لە ئەنجامە کۆمەڵایەتیەکانی ڕەوەندی بەپیشەسازیبوون ئەوەبوو کە خەڵك دێیان بەجێهێشت بۆئەوەی لەو شوێنانەدا کاربکەن کە کارگەیان لێبوو. شارە کۆنەکان بەخێرایی گەورەبوون وەی نوێش سەریان هەڵدا. دانیشتوانی ناوچە شارییە نوێیەکان ئەوەندە بەخێرایی گەشەیانکرد کە کاربەدەستان لەڕووی تەکنۆلۆژی ودەروونیەوە ئامادەنەبوون هەڵسوکەوت لەگەڵ گۆڕانەکاندا بکەن. گەلانی بەپیشەسازبوو هەر زوو لە مەڵبەندە شارییەکاندا لووتیان بەژمارەیکی زۆر چورتمەوە تەقی.، ئەو چورتمانەی کە خۆیان لە هەبوونی کەموکوڕی لە سیستەمی ئاوەڕۆ، خانە ولانە،

تاوان، کەمی فێرگە و نەخۆشخانەی گەڵ شتی دیکەدا دەنواند. کاریگەری بە پیشەسازیبوون و چالاکی بازرگانی جیهانی گۆڕانی لە ناو چینە کۆمەڵایەتیەکاندا بەرپاکرد. چینی باڵا ئاوێتەبوونێکی لەقولۆقی خانەدنە کۆنە خاوەن نزناو وزەوی وزارەکان (جگە لە وڵاتە یەکگرتووەکان) و دەستەیەکی نویَ لە کارمەندانی پیشەسازی وبازرگانی دەوڵەمەندی دەگرتە خۆی. ئەندامەکانی چینی باڵا چا پێشینەکەیان هەرچییەك بوبێت، بەسەر نەتەوەکانی خۆیاندا زاڵ بوون. لە بەریتانیای مەزندا لە سەدا پێنجی دانیشتوان دەستیان بەسەر لەسەد حەفتا وپێنجی داهاتەکانی خاوەندییەتی تایبەتیدا گرت. ئەو ئەوروپیانەی پشتاو پشت خانەدان بوون هێشتا لەناو حکومەتەکانی خۆیاندا زۆربەی پۆستە بەرزە سڤیلی وسوپاییەکانیان هەبوو. بەڵام ڕێژەیەکی زۆری پۆستە گرنگەکان بە کەسانێکی ئاسایی پڕکرانەوە کە ئەگەرچی ئەمانەش دەوڵەمەند بوون. لەگەڵ ئەوەش کە بە زۆری دەوڵەمەندە نوێیەکان دەراوێشتەی (کاری ئاکاری) بوون، لەشێوازی ژیانی (فرە خەرجی)دا ڕکابەرایەتیان لەگەڵ خانەدانە کۆنەکاندا دەکرد. خانوبەرەی پڕ لە کەل وپەلیان بونیات نا، بڕێکی زۆرو زەوەند خۆراك وپۆشاکی گرانبەهایان کاربرد، کەلوپەلە تەکنۆلۆژییە سەیر وسەمەرەکانی وەك ئۆتۆمبێل وتەوان (فوتۆگراف) و تەلەفۆن و ڕادیۆیان کڕی. پشتگیریی هونەریان کردو خوویان دایە گەشتوگوزار و کات بەسەربردنی گرانبەها.

چینی ناوەندی (بۆرژوازی) لەکاتێکدا بە توندییەوە لەلایەنی داهات وپایەدا لە چینی سەردەستە جیابووەوە. لەڕووی قەبارە وخۆشگوزەرانی وئاڵۆزی پێکهاتەکەیەوە نەشونومای دەکرد. بەگوێرەی پێوەری کۆن چینی ناوەنجی لە دوکانداران، پیشەگەرە شارەزایەکان وفەرمانبەرە پیشەییەکانی وەك سکولار وپزیشك وزانایانی ئایینی پێکهاتبوو. لەگەڵ هاتنی سەدەی بیستەمدا هەندێك

پیشەی دیکە وەك ئەندازیاران ، بەڕێوەبەرانی دەستگا بازرگانیەکان و ئەندازە تەلارسازەکانی کرتە خۆی. ژمارەیەکی زۆر خاوەن پیشەی کەمتر دەوڵەمەندی وەك مامۆستایان، فەرمانبەرانی دەستگاکان وکارمەندە دەوڵەتیەکان هاتنە ریزی ئەم تازە هاتووانەوە. لەبەر ئەوەی ئەم گروپانە لە خۆشگوزەرانییەکی مام ناوەندیدا دەژیان، بۆ ئەوەی خانوویەکی باشتر بەدەست بهێنن و خەرجی خستنە بەر خویَ،دنی منداڵەکانیان فەراهەم بکەن و هەروەك لەترسی ئەوەش کە نەبادا یەکێ لە دەستگا نوێیەکان یاخود پلانی خانەنشینی حکومەت بۆ خانەنشینی نەیانپارێزێت پارەیان کۆدەکردەوە.

لەوانەیە چاکتربوونی هەل ومەرجی چینی کرێکاری شاری، مەزنترین ئەو گۆڕانە کۆمەڵایەتیانە بێت کە زادەی گۆڕأنی ئابووری بوون. هەر ئەو دەمەی کە بەرزبوونەوەکانی مز هەڵاوسانی لە ئەندازە بەدەر بوون، زۆری ڕەنێوهێنان و تەکنیکە چێترکراوە کشتوکاڵیەکان پۆشاك، پێڵاو، خۆراکێکی هەرزانتریان بەردەست دەخست. هەر لە پێش یەکەم جەنگی جیهانیدا دوو لەسێی هێزی کاری شاری، کە ئەوسا بەخێرایی لە هێزی کاری دێ زیاتر دەبوو، مزێکیان وەردەگرت کە لە سەرووی ئاستی مەمرە ومەژیدا بوو. کەمینیەیەکی کەم لە کرێکارانی شارەزا وسەرکاران دەرامەتێکی زیاتریان هەبوو لە هی هەندێك لە بۆرژوایە نزمەکان. ژماریەکی زۆر لە کرێکاران توانیان گۆشت، بەروبوومی سپیایی وسەوزەوات لەناو سیستەمی خۆراکیاندا زیاد بکەن کە پێشتر نزیکەی بەتەواوی لە نان وکۆتۆپ (پەتاتە) پێکهاتبوو. خۆراکی باشتر و چاودێری تەندروستی پێشکەوتوو بوونە هۆی ئەوەی کە تێکرای ناوەندی تەمەن لە ئەورووپای خۆرئاوا لەپێش یەکەم جەنگی جیهان بەرەو نزیکەی پێنج ساڵ بەرزبکاتەوە، لەکاتێکدا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم نزیکەی چل ساڵ بوو. بەرزی فر وئەو یاسا نوێیەی ڕێگەی

بەکاری منداڵ نەدەدا (هەرچەندەئەمە لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا نەبوو) دەرفەتیان بۆ چوونە بەرخوێندنی منداڵان ڕەخساند.

وێڕای ئەو چێتر بوونانەی لە هەلومەرجی ئەندامە پلە باڵاترەکانی چینی کرێکاردا بەدیهاتن، هێشتا هەندێ چورتم بە چارەنەکراوی مانەوە: خانە ونەکانیان تەسك وتریسك ودڵگوش بوون، شوێنەکانی کارکردن بەزۆری هەروەك جاران پڕ لە ژاوەژاو، ناتەندروست ومەترسیدار مابوونەوە. یەك لە سێی کریکارانی شار، بەتایبەتی ئەوانەی لە چنین، دەرهێنانی کانزا، بارکێش وهەندێکی دیکە لەو کارانەی تا ڕادەیەك پسپۆڕییان گەرەك نیە هێشتا تەنیا ژیانێکی لە ئاستی مەمرە ومەژیان دەقەتاند. ساڵی ۱۹۰۰ لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا تێکڕای کاری هەفتە پەنجا ونۆ کاتژمێر کار بەرامبەر سێزدە دۆلار بوو. هەندێکیان لەو جووتیار یاخود دێهاتیانەی لە زەوی کشتوکاڵیدا کاریان دەکرد باشتر نەبوون، هەندێکیش لەمانە خراپتر بوون. و خەملێنراوە کە ساڵی ۱۹۰۰ سێ یەکی دانیشوانی نیویۆرك ولەندەن بە هەژاری ژیاون.

هەندێك گۆڕانی بێ بایەخ لە پێگەی ژناندا ڕوویاندا. پەیدابوونی ئامێری چاپ ئامێری دیکەی فەرمانگە دەرفەتێکی نوێیان بۆ ژنانی (ئابڕوومەند) بەتایبەتی ژنە بێ مێردەکان ڕەخساند کە لە باتی مانەوە لەماڵ لە فەرمانگەکاندا کاربکەن. هەندێکی دیکە بوون بە مامۆستا یاخود پەرستار. لەلایەکی دیکەشەوە بەرزبوونەوەی داهاتی ژمارەیەکی زۆر لە چینی کرێکار ڕێگەی بە هەندێك ژن دا کە دەست لە کری کارگە هەڵگرن وبۆ چاودێریکردنی کاروباری منداڵەکانیان وکاروباری ناوماڵ لە ماڵدا بمێننەوە. ژمارەیەکی زۆر لە مێردەکانی سەر چینی کرێکار وەکو هێمای دەوڵەمەندی ئەم ووتەیەیان دەگووتەوە کە دەڵێ: "پێویست نیە کە ژنی من کاربات". هەندێك لە ژنانی سەر بەچینی باڵاو ناوەنجی، لە ووڵاتە

یەکگرتووەکاندا خوێندنی زانکۆیان بەدەستهێنا وچوونە ناو کاری پیشەییەوە. ژمارەیەکی زۆر لە ژنان خوازیاری دەسەڵاتی ڕامیاری بوون، بەجۆرێك کە لەگەڵ جێگە وڕێگە ئابووری وکۆمەڵایەتیەکەیاندا بگونجێ، و ژمارەیەکی زۆریشیان لەپێناو مافی دەنگداندا جموجوڵیان کرد.

لە ئەورووپای خۆرئاوا و ناوەڕاستدا دوو ڕەوت لە دێهاتەکاند سەریان هەڵدا. یەکەمیان ئەو جوتیارانەی پارچە زەوییەکی فراوانیان هەبوو پەرەیان بە داراییەکەی خۆیان دا و ئامێرییان ل کارەکانی خۆیاندا بەکارهێنا. شانبەشانی خانەدانە خاوەن زەوی وزارە مەزنەکان، ژمارەیەکی زۆریان ڕوویان لە بەرهەمهێنانی دانەوێڵە وەرگێڕا بۆ بەرهەمهێنانی گۆشت گا وڕانی بەروبوومی سپیایی وسەوزەوات بۆ ئەوەی گۆڕانی شێوازەکانی بەکاربران لەلایەن شارنشینانەوە ڕێك بێنەوە. ئەم دێهاتیانە توانیان گوزەرانێکی ئاسوودە بەدەست بهێنن بەڵام بەزۆری داهاتەکانیان بەهۆی هەڵاوسانەوە دەگۆڕا.

هەر لەو دەمەشدا بوو کە جووتیارە بچووکەکان زەوییەکانیان لەدەستدا و چوونە ڕیزی جەماوەری ئەو کرێکارە کشتوکاڵییانەی لەپێناوی بردنە سەری ژیانێکیمەمرە ومەژی لە دێیەکاندا ڕەنجیان دەدا. ملیۆنەها کەس چوون لە کارگەکاندا کاربکەن، لەو شوێنەی کە دەبووایە ئەو وەرچەرخانە دژوارە قبوڵبەکەن کە خۆی لە دەستبەردار بوونی نەریتەکانی کاری خۆیان وملدان بۆ ئەو دیسپلینە یەك بینییە دەنوێنێ کە ڕۆتینی کاری کارگە گەرەکیەتی. ملیۆنەها کەسی دیکە بەرەو نیوەگۆی خۆرئاوایی ڕەویان کرد کە هەندێکیان مەزرایان بۆ خۆیان دابین کرد یاخود وەك کرێکاری کێڵگە کاریان کرد، گەرچی بەشی زۆری کۆچەرەکان لە شاراندا سەقامگیربوون و لە کارگەکاندا کاریان کرد. لەگەڵ سووڕانەوەی سەدەدا، بەتایبەتی لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا لێشاوی کۆچبەران

ئەندازەی پەرەسەندنی پیشەسازی بەزاند و کرێکاران ڕووبەڕووی مزی نزم وهەلو مەرجە ناهەموورەکانی کار بوونەوە.

لە دەورەی خۆرئاوای پیشەسازیدا، گۆڕانە کۆمەڵایەتیەکان بەشێوەیەکی زۆر شێنەتر هاتنە کایەوە. لە ژاپۆن وتا ڕادەیەکی زۆر کەمتر لە چین وهیندستان. نیمچە بە پیشەسازیبوون چینی بۆرژوازی سوننەتی بەرفراوانکرد وچینێکی کرێکاری کارخانەیی بچووکی دروست کرد. ئەگەرچی زۆربەی خەڵکانی ئاسیـ وئەفریقا وئەمەریکای لاتین وئەورووپای خۆرهەڵات خۆرئاوا وباشووری وولاتە یەکگرتووەکان هەر بە کرێکاری مانەوە، یاخود لەسەر پارچە زەوییەکی کرێی یەکێك لە زەویدارە دەوڵەمەندە کمەکان کاریان دەکرد. لە هەندێك لە کەرتەکانی ئەفەریقا وئاسیادا زەویدارە خۆجێیەکان لە ئەنجامی زاڵبوونی ئیمپریالیزمەوەبەو ئەورووپیانەی لەوێ دایانکوتابوو جێیان گیرایەوە.

جەماوەری دێنشین، بە هەموو بارێك، چی لەژێر ڕکێفی دەستەبژێرە خۆجێیەکان وچی لەژێر ڕکێفی خۆرئاواییەکاندا، هەر لە ئاستێکی نزیك بە مەمرە ومەژی یاخود نزمتریشدا دەژیان.

# مێژوو .. زانستی هەبوونی مرۆڤ
# هەوڵێك بۆ پەڕینەوە لە مێژوونووسییەوە بۆ مێژووناسی

ن : عەلی شەریعەتی
و. لە عەرەبییەوە: هاوار محەمەد

(٣ - ٣)

**سوری قابیلی:**

لە سووری قابیلیدا ئەو خەسڵەتانە (مەبەست لە خەسڵەتەکانی سوری هابیلییە) دەگۆڕێن و تایبەتمەندگەلێکی نوێ سەرهەڵدەدەن، ئەو گۆڕانکارییانە بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت:

١- ڕەنێوهێنان و بەرهەمهێنان لە دۆخە سروشتیەکەیەوە دەردەچێت بۆ دۆخی پیشەیی، بەو واتای کە لە شێوەی فراوانیی سروشتیەوە دەردەچێت بۆ سنووردارێتی پیسەسازی و دروست کردن، مەبەستیش لە پیشەیی لێرەدا ئەو کارە کشتوکاڵیە پەرەسەندووەیە کە چاوگەکانی سامانی ئابووری دیاریکراوی تێدا دەبێت.

٢- هەرچی ئامرازەکانی کارە ئەوا ئاڵۆز دەبن و بەرەنجامی ئەم ئاڵۆزبوونەش سیستەمی کۆمەڵایەتی بۆ بوون دەردەکەوێت. بەواتای ئەوەی کە پەیوەستی تاکەکان لە کۆمەڵگەدا دەبێتە پەیوەستیگەلێکی پەلهاویشتووانە. هەورەها ئامرازەکانی ڕەنێوهێنان و کار و سەرچاوە ئابوورییەکانیش دەبنە بابەتگەلێکی دیاریکراو، کاتێك لەم

دۆخەدا کۆمەڵگەش دابەشدەبێت بۆ چینەکان دام و دەزگاگەلی نوێ دروست دەکات ولەسەرووشیەوە لەگەڵ بوونی ئەم دام و دەزگایانە و پەلهاویشتنیان ئەوا پەیوەستیە مرۆییەکانیش دەگۆڕێن و لە بەرەنجامی گۆڕانکاری بەدەستهاتوودا لە پەیوەستیە کۆمەڵایەتی و مرۆیی وئابوورییەکاندا ئەوا ئاکاریش گۆڕانی بەسەردا دێت و لەبەرەنجامی ئەمەشەوە ئاکار تووشی گەندەڵ بوون و داڕزان دەبێت و ئەمەش واتە گەندەڵبوونی خۆڕسکی بەشەری و مرۆیی. هەرچی زانستی ئاکار و یاسای ئاکارە ئەوا ئەو دووانە دەگەنە کامڵبوونیان بەهەمان ئەو پلەی کە تێیدا پرسە ئاکارییەکان دەخرێنەڕوو، زانستی ئاکار دەگاتە ڕووبەرێکی زۆر کاتێك دەبێتە زانستێکی گەورە لەپاڵ زانستە مرۆییەکان و دەروونیەکاندا.

کۆمەڵگە ژێرخان بۆ ڕەنێوهێنان و ئابووری وهەروەها بۆ بونیادی کۆمەڵایەتی کە دەبێە بنچینەی سەرەکی کۆمەڵگە، دروست دەکات، لێرەشدا پەیوەستیە دووانەکیەکان ڕوودەدەن،کاتێك ئەم پەیوەستیانە لەسەر بنەمای یەکگیری بەرایی ڕەنگدەدەنەوە. و دوو خوداوەند لە بووندا دەردەکەون و ئەم دەرکەوتنەش کاردەکاتە سەر ئاکاری مرۆیی، ئینجا چاکە و خراپە دەردەکەون کە دەرکەوتنەکەی کاردەکاتە سەر ناکۆکی بنەچەکان، ئینجا بنەچەکی باش و بنەچەی پیس دەردەکەون. تێبینی ئەوە دەکرێت کە بنەمای دووانەکی لە کۆی ڕەهەندەکانی ژیانی مرۆڤدا ڕەنگدەداتەوە و دەردەکەوێت و ئەو کەسەی یەك تێڕوانینی لەلا هەبوو ئێستا بۆتە ئەوەی دوو تێڕوانینی لەلا هەبێت و وایلێهاتووە بۆ هەر شتێك لای ئەو دوو بوار هەبێت، ئەمەشە کە لە ئاینی مانۆ (مانەوی) دا تێبینی دەکەین کە شتەکان لە جیهاندا دابەش دەکات بۆ دوو بەش ئەوانیش چاکە و خراپە، ساز و ناساز، هەروەها لە ئاینی زەردەشتییشدا کاتێك لای ئەو هەموو تەنەکان لە گێتیدا و لەنێویشیاندا تەنە ئاسمانیەکان دابەشکراون بۆ دوو بەش ئەوانیش خودی

باش و خودی خراپ، تەنانەت ئەوان ووشەکانیش دابەشدەکەن بۆ ووشەکانی ئاهورامزدا و ووشەکانی ئەهریمەن (واتە خودای چاکە و خودای خراپە). ئەم دووانەکیە رەنگدانەوەی دەبێ لە دام و دەزگا کۆمەڵایەتیەکان و لە دەروونیشدا. رەنگدانەوەی دووانەکی لە دەرووندا دەبێتە کارتێکەر لە هەموو شتێکدا لە ژیاندا، ئەم رەنگدانەوەیەش دووبارە ئاوەژوو دەبێتەوە خودای تاك و میتافیزیك، بابەتەکە دەبێتە بابەتێکی پیرۆز و ئینجا وادەبینن کە دووانەکی هۆکاری ئەبەدی و لۆژیکی و خوداییە.

بۆ یەکەمجار دوای سووڕی هابیلی دوو جەمسەر دەرکەوتن، یەکێکیان جەمسەری خۆشگوزەرانی و ئەوی دیکە جەمسەری بێ بەشکراو، ئەوەندە بەس بوو کە ستەم هەبێت بۆ هاتنەئارای ئەم دوو جەمسەرە وئەم دوو چینە و هەر ئەویش هۆکاری بوو، و لەپێناو پاراستنی شوێنە شیاوەکانیشیاندا ئەوا دۆخەکە هەولێکی زۆر دەخوازێ تا جەمسەری موڵکدار بگاتە کامڵبوونی خۆی و جەمسەری بێ بەشکراویش بگاتە میانەی رەوڕەوەکەی.

جەمسەری موڵکدار، لەڕووی ئابوورییەوە خۆشگوزەران و دەوڵەمەند بوو و لە چینەکەی تر باشتر بوو، لەپێناو پاراستنی شوێنگەکەشیدا لە سەرەتادا پێویستی بە شتێکی تر نەبوو، چونکە کۆمەڵگە لەو کاتەدا کۆمەڵگایەکی ئاڵۆز نەبوو، بەڵام لە دواتردا کاتێك کۆمەڵگا گەیشتە کامڵبوونی و کاتێك کار پەلیهاویشت و پێکداچوو، ئەم پەلهاویشتن و ئاڵۆزبوونە جۆرێك لە ئاڵۆزی لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکاندا هێنایە ئاراوە، لەبەرئەوە جەمسەری موڵکدار ناچاربوو بۆ دۆزینەوەی ئەو یاسایانەی کە ماف و جیاوکیەکانی دەپارێزێت بەدوای ئاراستەکەرێکدا بگەرێت کە بۆی بگەڕێتەوە بۆ ئاراستەکردنی ئەو رەوشە دژیەکیەی کە بەسەر کۆمەڵگەدا هاتووە تا بیگەڕێنێتەوە بۆ

ڕەشــەکەی یەکــەمجاری. لــە ئایــدیا و بیروبــاوەڕی خــودایی دەســتی دەگاتــە ئــەو ئاراستەکەرە و وەك قەڵغانێك بەکاریدێنێ بۆ پاساودانی کاری خۆی.

ژیانی ئابووری هەمیشە لەگەڵ فراوانبوونی کۆمەڵگەی بەشــەریدا فـراوان بـوو، دام و دەزگاکــان بــۆ یەکــەمجار لــە ســێ ڕەهەنــددا دەرکــەوتن، ئــەم دام و دەزگایانــەش لــە کۆمەڵگەی هابیلیدا لەشێوەی کار و وەزیفە تاکەکەسیەکاندا بوو، کاتێك کــە هــەر تاکێــ سەرکردە و فەرماندار و خاوەنی خۆی بوو، هەروەها کارە ئاینی و بڕواییەکانیشی بەجێ دەهێنا.

بەڵام گرنگترین بنچینە کۆمەڵایەتیە دیاریکراوەکان لە سوڕی سەرەتایی تــەواوکاریی کۆمەڵگەدا، کە گەیشتە دەست نیشانکردنی بەرچاو، ئەم سێ شێوە یـان ســێ ڕەهەندە یان سێ دام و دەزگایەی خوارەوەیە:

– چینی فەرمانڕەوا :

خەڵکی خۆشگوزەران، پیاوانی ئاینی.

ئەو بۆشاییەی کە بە کــارکردە لێــك نزیککــەرەوەکان پڕدەکرێتــەوە و بــوونی هەیــە هەر ئەوەیە کە چینی بێ بەشکراو و چینەکانی تر جیادەکاتەوە. واتە چینی فــەرمانڕەو لە چینی بێ بەشکراو. ئەم چینە خاوەنی توانا ئابووری و مادییەکانە.

– چینی بێ بەشکراو:

ئەم چینە هەڵقوڵاوی چینی یەکەمە و بەرەنجامێکە لەوەوە.

– حکومەت:

لەم چینانەوە حکومەت دروست دەبێت، پەیوەستیە مافخوازییەکان ڕوون و ئاشــکـ و جیاکار دەبن، و ڕۆڵێکی گرنگیان لەم سوڕەدا هەیە، هەروەها پــەیوەستیە کۆمەڵایەتـ نوێیــەکانیش بەشــێوەیەکی ئــاڵۆز دەردەکــەون، و هــەر لــەم سوڕەشــدا کۆمەڵــە و چــ

کۆمەڵایەتیەکان سەر دەردێنن. هەرچی پەیوەستیە دەرەکیەکانە لەم سورەدا لە بەرامبەر کۆمەڵگاکانی تردا فراواندەبن وکاتێکیش پەیوەندییە دەرەکیەکان فراواندەبن ئەوا کۆمەڵگا پێویستی بە بەرگری و ڕێکخستنی کاروبارەکان و هەڵسوڕاندن و بەڕێوەبردنی ناوەکی و بەرگری دەرەکی هەیە، لە دەرەنجامی ئەم فراوانبوونەشەوە حکومەت دەبێتە ئەوپەڕی پێویستی و پێداویستیەکی ناچارەکی، پێکهێنانی حکومەتیش توانای دەوێت. کەواتە حکومەت لە ڕەهەندی یەکەم یان چینی یەکەمی خاوەن تواناکان و دەستڕۆیشتووە ئابوورییەکانەوە پێکدێت، بەڵام ناتەبا نابێت لەگەڵ چینەکەیدا کە لێی بۆتەوە.

٣- هەرچی مرۆڤە ئەوا لە کۆمەڵگای نوێدا دەگاتە کامڵبوون و فراوانیی، بەهەمان ئەو ئەندازەی فراوانبوونە کامڵبوونە ئەوا ڕەهەندێکی دیکە هەیە کە لەپاڵیدا دەردەکەوێت، ئەم ڕەهەندەش ڕەهەندی مرۆییە و ئەوەش گوزارشتە لە هەستکردن و تێڕامانی عیرفانی، ئەم هەستکردنەش هەر لە پێشترەوە بوونی هەبووە، بەڵام لەم سوڕەدا بە وێنەیەکی ڕوونتر و بازنەیەکی فراوانتر لە پێشوو دەردەکەوێت، بەجۆرێك کە لەگەڵ کامڵبوونی کۆمەڵگەدا ئەویش کامڵ دەبێت وئەم هەستکردنە مرۆییەش لە تێڕامانی فەلسەفی و عەقڵانی و زانست و لێکۆڵینەوەی زانستی و پشکنینی خودیی مرۆیی وبیرکردنەوەی جۆری (التفكير النوعى) لە دەروونی مرۆڤ و لە جیهان وگەڕان بەدوای حەقیقەتی گێتیدا، خۆی دەنوێنێت. ئەم بابەت و هزرانەش لای مرۆڤ بەجۆرێك لە جۆرەکان هەر بوونی هەبووە بەڵام نادیار و پەنهان بووە و بەو شێوە و دۆخەی ئەم سوڕە نوێیە دەرکەوتوو نەبووە، کاتێك ئەم هەستکردنە عیرفانیە لە سوڕی هابیلیدا بەشێك بووە لە ئاین و هەر هەمووشی بەیەك هەستکردن دەرکەوتووە ئەویش ئاینزایە، بەڵام لە سووڕی نوێدا (مەبەست لە سوڕی قابیلییە) پەلدەهاوێ و دەستنیشانکراو دەبێت.

لـەم سـوڕەدا كۆمـەڵێك كـاركردی بەرچـاو و بەرهەسـت لـەنێوان هـەردوو جەمـسەری دژبەیەكی فەرمانڕەوا و بەرفەرماندا دەردەكەون، ناو لەم كاركردانەش دەنـێین كـاركردە دوورخەرەوەكان یان دووبەرەكێنەكان، هەروەها كاركردگەلێكی ئاینزایی بینراویش هەیە كە دیسان بە كاركردە دووبەرەكێنەكان ناویان دەبەین. مادام چینی فەرمانـدار هەمیشە تەقەلا دەدات بۆ جێگیركردنی ڕەوشەكانی و كاردەكات لەسەر مانەوە لە دەسەڵاتدا ئەو هەوڵدەدات بۆ پڕكردنەوەی ئەو بۆشاییەی كە كەوتۆتە نێوان حكومەت و گەلەوە.

ئـەم دوو چـینە یەكـەمجار لـەڕووی بەرچـاوییە لێكجیـان كاتێـك یـەكێكیان چـینی بەرهەمهێنـەرە و ئـەوی دیكـەیان بەرهەمـدەرە و هـەردوو چـینەكەش هەوڵـدەدەن بـۆ هەڵگرتنی ئەو بەربەستە و ئەو جیاوازییەی نێوانیان و نزیككردنەوەی ئەو مەودایـەی كـە لەنێوانیاندایە و ئەو مەدایەش تەنیا بریتی یە لە مەودای بەرهەمهێنان.

هەرچی ئاین و ڕێبـازی ئـاینی و نەتەوەخوازییـە، ئـەوا دوو كـاركردن كـە بەدرێـژایی مێـژوو بوونیـان هـەبووە و ئـەم دوو كـاركردەش هەوڵیانـداوە كـە بـەرگێكی سـاختە و درۆزنانە بكەن بە بەر ئەو دژیـەكی و ناكۆكیـە واقیعیانـەی كـە لـە كۆمەڵگـەدا هـەبوون. لەبەر ئەوە پرسی عیرفانیەت و ئاكـارەكی و هونـەر و ئـەدەب و زانـست و تـەكنۆلۆژیا و پیشەسازی هەموو ئەم بوار و بابەتانە بە كاركردە نزیكخەرەوەكان دادەنـرێن و پێـشیـ دەڵێن ئاینزا یان ناوی نەتەوەخوازیان بەسەردا دەبرێت.

ئـاین و نەتـەوەخوازی وەك هۆكارگـەلی نزیكخـەرەوە لـەنێوان حكومـەت و گەلـ بەكارهێنراوە بۆ پڕكردنەوەی ئەو بۆشاییەی لێكی جیاكردوونەتەوە و ئـەو كەنـدەی كـە كەوتۆتە نێوانیانەوە، تەنانەت سەمایش لـەم سوڕەدا پەسـنێكی نەتـەوەیی یـان ئـاینی دەدرێـتێ بـۆ سـوود لێـوەرگرتنی وەك كـاركردێكی تەباكـەر، بـەو پێیـەی كـاركردی نزیكخەرەوە لەو سوڕەدا ڕۆڵێكی گرنگی هەیە جا ئـیتر ئەگـەر بیروبـاوەڕی ئـاینی بێـت

یان نەتەوەخوازی. ئەو بابەت و بوارانەش کە باسکران، جا ئیتر گوزارشت لە بیروباوەڕی ئاینی بکەن یان نەتەوەخوازی، ئەوا کارکردی نزیکخەرەوەن، کە دەقۆزرێنەوە بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی دروستبوو لەنێوان حکومەت و چینی گەل یان نێوان بەرهەمهێنەر و بەرهەمدەر.

خۆ ئەگەر کارکردگەلێکی نزیکخەرەوە لە ئارادابن، کە حکومەت و گەلەکە هەوڵدەدەن بۆ کەڵك لێوەرگرتنیان بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی دروستبووی نێوان هەردوو چینەکە، ئەوا لەبەرامبەریشدا کارکردگەلێکی تریش لە ئارادایە، ئەم کارکردانەش وەك ووتمان ناوی دەنێین کارکردگەلی دووبەرەکێن کە بریتی یە لە کارکردی بەرهەمهێنانی چینانە، و ئەمەش کارکردێکی مرۆیی نیە بەڵکو گشتی یە، و بەهەمان شێوە کارکردی مەزهەبیش نیە، کاتێك کە ئێمە هەستی مەزهەبی یان هەستی نەتەوەییمان وادانا کە هەستێکی زەینیانە یان بیرکردنەوەی فەلسەفیانە و عەقڵیانە و عیشقیکە، بەجۆرێك کەمرۆڤ لەمیانەیەوە بەشێوەیەکی گەشبینانە دەڕوانێتە داهاتووی.

ئەم هەستە مەزهەبیە دەرکەوتەی هەمەجۆر و ڕەهەندی جیاوازی بۆ دروست دەبێت، ئەوکاتەی کە مەزهەب لە نەتەوە جیادەبێتەوە و نەتەوەخوازی دەبێتە بابەتێك و مەزهەبیش دەبێتە بابەتێکی دی، لەو چرکە ساتەدا کە ئەم جیابوونەوەیەی تێدا ڕوودەدات ئەوا نەتەوەیەك یان کۆمەڵگەیەك بڕوا دێنێ یان باوەڕدێنێ بە ئاینی نەتەوەیەك یان نەتەوەکانی تر، لە بەرەنجامی ئەوەشدا لێرەدا دوو بابەت لەم کارکردە نزیکخەرەوانە هەیە کە لەگەڵ یەکتر کۆدەبنەوە ئەوانیش پێویستی و ڕاکێشانی فەلسەفی و عیرفانی + ئەو مرۆڤە مرۆییەی کە لە هەموو قۆناغێك و لە هەموو کاتێکدا، بوونی هەیە. ئەمەش بە بابەتی یەکەم دادەنرێت. هەرچی بابەتی دووەمە ئەوا لە دامانی چینە کۆمەڵایەتیەکان بۆ دۆزینەوەی کارکردێکی نزیکخەردا خۆی دەنوێنێت، و ئەمەش

بریتی یە لە (یاسا ماف دابینکەر و سزادەرەکان) و فەلسەفە و ئاکار و ڕێبازی ئاینی، ئەم بابەت و بوارانەش چینی جیابۆوە هێناونیە کایەوە، و بە کارکردگەلی نزیکخەری درۆزنانە دادەنرێن کە چینی فەرمانڕەوا دەیقۆزێتەوە بۆئەوەی بیکاتە کارکردگەلی تەباکەری نێوان هەردوو چینە دژ بە یەکەکە، و ئەمەش ناو دەنێین (مەزهەب)، هەر بۆیە لێرەدا (مەزهەب) واتای ئەو مەزهەبە ئاینییانە نیە کە هەیە، بەڵکو مەزهەب لێرەدا، واتە هەستکردنی مەزهەبی و پەیوەستی لای مرۆڤ، نەك واتای ئەو مەزهەبانەی کە بە درێژایی مێژوو فەرمانڕەوا و باڵادەست بوون، وفەرمانڕەواکانیش سوودیان لە دەستەمۆکردنیان وەرگرتووە بۆخزمەتکردنی خۆیان بەو پێیەی کارکردی نزیکخەرەوە بووە.

هەستی مەزهەبی، کە ووتمان مەزهەبی ئاینی نیە، ئەوەیە کە لە خودی مرۆڤدا بوونی هەیە، بەجۆرێك کە ڕۆح و زەینی مرۆڤ بەڵگەن لەسەر بوونە ئەم هەستە، و هەر خودی مەزهەبەکەش بەڵگەیە لەسەر ئەم پرسە و بەدرێژایی مێژووش جەختی لەسەر کراوەتەوە لەمیانەی قۆستنەوەیەوە وەك کارکردی چەواشەکەر و سڕکەر لەلایەن فەرمانڕەواکانەوە، کاتێك کە خەڵکی لە ئەنجامی ئەم هەستە مەزهەبیەیاندا بەدوای مەزهەبەکەیاندا کێش دەبن، ئەگەر چی ئەو مەزهەبە لەلایەن ئەوانی ترەوە بۆ کارڕایی کردن و ئامانج و پیلانە نەگبەتی هێنەرەکانیش بەکاربهێنریت. مەزهەب دەریخست کە پەیوەستیەکی هەستەکی و هەستەوەری هەیە کە تاکەکان لە بەرامبەریدا هەستی پێدەکەن.

خەسڵەتەکانی جەمسەری فەرمانڕەوا لە سەردەمی قابیلی :

١- خاوەندارێتی ئابووری.

٢- حکومەت.

٣- ڕێبازی ئاینی یان ئاین.

ئەمەش واتا ئەم سوورە بەسێ ڕەهەند جیادەبێتەوە، ئەوانیش:

١) خاوەندارێتی. ٢) پاشایەتی. ٣) گشتیبوون.

خاوەندارێتی بریتی یە لە خاوەندارێتی ئابووری بۆ چینی دەوڵەمەند وخاوەن پارەو پول و سامان، و پاشایەتیش لە حکومەتدا خۆی دەنوێنێ، هەرچی ڕێبازی ئاینییە گشتیبوون لە ئاینزا یان ئایندا خۆی دەنوێنێت.

**فرە خودایی :**

پرسیاری خراوە ڕووش ئەوەیە: چی تێڕوانین یان بیروباوەڕی فرەخودایی و هاوبەشێنی (شرك) لە سیستەمی کۆمەڵایەتیدا هێنایە ئاراوە؟! یان چی وەرچەرخانی لە کۆمەڵگادا هێنایە کایەوە بەجۆرێك کە پرسی تێڕوانینی گەردوونی یان ئاین بوو بە تێڕوانینێکی هاوبەشێنەریی؟

بیروباوەڕی یەکتایی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی یەکسانی مرۆڤایەتی یان سەردەمی هاوبەشیە بەراییەکان، کاتێك یەك چەمك لە کۆمەڵگەدا بوونی هەبوو، ئەویش چەمکی گشتی (ئێمە) بوو، ئەم چەمکە ڕەنگدانەوەیەکی ئاسمانیشی هەبوو، تەنیا لەبوونی یەك خوداوەنددا خۆی دەنواند کە ئەویش یان لەسەر شێوەی تەوتەم دەبوو یان خودا (الله) یان شێوەی تر. خۆ ئەگەر خودا (الله)ی ئافرێنەری تاك و تەنیا بووایە، یان (تەوتەم) یان بتی هۆز خودا بووایە، ئەوا ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ جۆری بیرکردنەوەی مرۆیی کە لەو کاتەدا بوونی هەبووە. و بەو ئەندازەیەشی ئەوەمان بینیەوە کە خودا یەکە و گەورەیە و باڵایە ئەوا ئێمە یەکەیەکی یەکگرتوومان دۆزییەوە و ناومان نا یەکەی پەرستراو لەگەڵ یەکتاپەرستن، پەرستراو یەکێکە و پەرستنیش گوزارشتێکە بوونی هەبووە و ئاراستەکراوە بۆ یەك ئافرێنەر ئەویش خودایە.

ڕۆحی باڵادەست لە کۆمەڵگەدا ڕۆحی یەکگیری بوو، جا ئیتر لە پەرستنی ئافرێنەردا بووایە یان پەرستنی بت، و لەو سەردەمەدا ڕۆح واتای (ئێمە)ی ئەدا بە دەستەوە، واتە یەکەی خواپەرست.

دوای ئەوە ژێرخانی کۆمەڵایەتی بۆ دوو بواری دژ بەیەك دابەش بوو، ئەوانیش (ئێمە)ی خاوەندارێتی و (ئێمە)ی جووتیاری لە کۆمەڵگەدا، لەبەرەنجامی ئەم گۆڕانە دروستبووەشدا ژێرخانی کۆمەڵایەتی گۆڕا بۆ ژێرخانی دووانەکی (بگەڕێوە سەر بابەتی دووانەکی)، بەجۆرێك کە ئەم ئاڵوگۆڕبوون و گۆڕانە ڕەنگدانەوەی هەبوو لە تێڕوانینی گەردوونیدا[1] و لەکاریگەری ئەم ڕەنگدانەوەیەشەوە پەرستنی دووانەکی دەردەکەوێت و دوای ئەمەش چینی فەرمانڕەوا سێ ڕەهەندی دەرکەوتووی ئەبێت، ئەوانیش ئاینزا و سیاسەت و ئابووری.

بە واتایەکی ووردتر، کۆمەڵگە، کە یەك چین و یەك هێز حوکمی دەکرد، ئێستا لە سێ ڕەهەنددا ڕوون بووەوە و دەرکەوت، ئەوەش سیانەکییە کە لە تێڕوانینی گەردوونیدا لەجیهاندا، ڕوویدا (بەتکای گەڕانەوە بۆ بابەتی سیانەکی). بەڵام ئەوەی کە دەبێت تێبینی بکرێت ئەوەیە کە فرە خودایی و تێڕوانینی گەردوونی جۆرێکن لە جۆرەکانی تێڕوانینی کۆمەڵایەتی (فرە خودایی یان یەك خودا یان دوو خودا واتە دووانەکی یان سێ خودا واتە سیانەکی).

کاتێك سیستەم دەبێە سیستەمێکی یەك خودایی یان دوو خودایی یان سیانی، ئەوا لە ژێرخانی کۆمەڵایەتیدا ڕوون دەبێتەوە کە یان دەبێتە یەك خودایی یان دووانی یان سێ خودایی، ئەمەش ڕەنگدەداتەوە لەسەر تێڕوانینی گەردوونی بۆ جیهان، چونکە بۆ نموونە لەڕووی جۆرییەتیەوە دوو چینی لێك جیاواز بوونی هەیە لەو ڕووەوە کە ئەو دووانە دوو خودان لە زەینیەتدا، و ئەم دوو خودایەش ئەوانەن کە چینەکان دێننە ئاراوە

و ئاراستەیان دەکەن، بەمانایەکی تر لەوێدا یەك پەیوەندی دیالەکتیکی لەنێوان ئەو دوو چینەدا هەیە (پەیوەندی دیالەکتیکی لەنێوان هەردوو بابەتەکەدا پەیوەندییەکی دژ یەکانەیە، و بەم واتایەش، لەهەمان کاتدا بەهۆی ئەو دیالەکتیکەوە ئەو پەیوەستی و پەیوەنییە دژ یەکانەیە بۆنموونە لەنێوان A و B دا دەرەوێنینەوە)، و هەروەها ژێرخانی کۆمەڵایەتی وسەرخانی نا کۆمەڵایەتی پەیوەندی نێوانیان پەیوەندییەکی دیالەکتیکیانەیە.

ئایا ئەکرێت پەیوەندییەك هەبێت لە یەك کاتدا هەم پەیوەندییەکی ئەرێنی و هەم پەیوەندییەکی نەرێنی بێت؟ بەڵێ، لە ڕووی جۆرێتییەوە دەکرێت کە ئەم ڕەوشە لە ئارادا بێت ئەوکاتەی کە کۆمەڵگە دەبێتە مایەی هێنانە کایەی تێڕوانینێکی گەردوونی، بەڵام لە بیروباوەڕی کەسەکاندا دۆخەکە دۆخەکە بەو شێوەیە دەردەکەوێت کە تێڕوانینی گەردوونی کۆمەڵگای هێناوەتە ئاراوە. لە حاڵەتی یەکەمدا ئەوە ژێرخانی کۆمەڵایەتی بوو دووانەکی هێنایە ئارا، بەڵام لە زەیندا بارەکە بە پێچەوانەوەیە، خودا ئەوەیە کە کۆمەڵگەی دووانەکی هێنایە کایەوە، بارەکەش بەم واتایە یان بەم وێنەیە پەیوەندی نێوان کۆمەڵگە و تێڕوانینی گەردوونی، و پەیوەندی نێوان خودا و کۆمەڵگە پەیوەندییەکی دیالەکتیکیە.

"ئەو شتانە چین کە سیستەمی فرە خودایی ئاراستەیان دەکات و دەبێت بە ناونیشانی ژێرخان؟"

لە سوری مێژوویی هۆزدا بۆ هەر هۆزێك یەك خودا هەبوو ئەویش گوزارشتی لە (ئێمەی هۆز) دەکرد، یان ڕەنگە دوو خودا هەبووبن، کاتێك لە میانەی ململانێی هۆزایەتیەوە، هۆزی سەرکەوتوو زاڵ خوداکەی دەبێتە خودای باڵا دەست، و خودای هۆزە ژێرکەوتوو تێکشاوەکەی تریش، لای ئەوان، دەبێتە خودایەکی لاوەکی، بەم

پلەبەندییەش لە ئەنجامی ئەم شەڕ و شۆڕانەدا ئەوا کۆمەڵگە چەندین خودای بۆ سەرهەڵدەدات.

لە کاتێکدا لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لە کۆمەڵگە دەکەین بەوێنەی یەک بابەتی داماڵراو، ئەوا لە حقیقەتدا کۆمەڵگە بەم جۆرە نەبووە. واتە یەکێکی داماڵراو نەبووە لەبەرئەوە پێویستە کە لە جوڵەی کۆمەڵگە لەمێژوودا بکۆڵینەوە، هەرچی توێژینەوەی ڕەوش و گۆڕانکارییەکانی یەک هۆزە کە ڕوویانداوە، ئەوا ئەو توێژینەوەیە بە تەنیا بەس نیە و تێروتەسەل نیە، بۆ نموونە لە کاتی توێژینەی هۆزی (A) لەهۆزەکان لە کاتێکد کە لە سەرەتاوە یەکتایی بووە و پاشان بۆتە دووانەکی باوەڕ، پاشان دەستی کردۆتە بڕواهێنان بە سیانەکی، ئەم هۆزە ناکرێت کە داماڵراو و دابڕاو بێت لە دەوروبەر و دوای ئەوەش بەجۆرێك بجووڵێ کە ببێتە کۆمەڵگەیەکی گەورە و بگاتە شارستانیەتیەکی مەزن بەبێ ئەوەی کە لەگەڵ هۆزەکانی تردا پێکدا بدات. لەئەنجامی ئەم پێکدادانەد تێکەڵبوونی هۆزایەتی ڕوودەدات، لەبەرئەوە ئەم فرە خوداییە پێویستە لەڕووی جووڵەی پەیوەندی ئەم هۆزە لەگەڵ هۆزەکانی تر لە مێژوودا، لێی بکۆڵرێتەوە. بۆ نموونە ئەگەر وامان دانا کە کۆمەڵێك هۆز ئەوانیش A– B– C– D بوونیان هەیە، وئێمەش هەڵساین بە لێکۆڵینەوەی ڕەوشی ناوەکی بۆ هەر هۆزێك لەم هۆزانە (لە ئەفسانەکان و ئاینزاکان و بابەتەکانی تر)، و بەگرنگی و بایەخیشەوە پەیوەندییە دەرەکیەکانی نێوان ئەم هۆزانە سەیر نەکەین، و ئەگەر هەر یەکێك لەم هۆزانەمان وەك یەکەیەکی داماڵراو لەوانی تر لەدڵی بیابان، یان بەجیا، وەرگرت، بەجۆرێك کە بۆ هەر هۆزێك چینی فەرمانڕەوا وچینی بەرفەمان کە ملکەچی دەستڕۆیشتووی چینی بالا دەست دەبێت وەرگرت، ئەوا سەرکەوتوو نابین، گەر لە واقیعی ناوەکی و دەرەکی ئەمانەمان کۆڵیەوە دەبینین کە ئاینزایی و نەتەوەخوازی ئەم خزمەتە پێشکەش بە چینی بالادەست ئەکەن

خەڵکی پاڵ پێوە دەنێن بۆ باوەڕبوون بەوەی کە چینایەتی و بوونی چینایەتی خواستی خودایە (ئەمە لە لایەنی بیروباوەڕ یان ئاینزاییەوە)، نەتەوەخوازیش دەڵێ چینی بەرفەرمان و فەرمانڕەوا لە یەك نەژاد و ڕەگەزەوەن و هەردووکیشیان پێویستیان بە پاراستن لە مەترسی واقیعی دەرەکی هەیە، (کاتێك سەردەستە و ژێر دەستە دەکەونە بەردەم مەترسی) ئالێرەدایە کە هاوبەشیخوازی دێتە ئاراوە ودەردەکەوێت، بەجۆرێك کە کۆمەڵگا وەك یەك چین دەردەکەوێ و ناکۆکی و جیاوازییە چینایەتیەکان لە بوون– لە-مەترسیدا، نامێنن. کەواتە هاوبەشیخوازی بریتی یە لە بەرەنجامی یەك هەستکردن و بوونیادی دیالەکتیکی بەجۆرێك بۆنموونە هۆزی (A) هێرش دەباتە سەر هۆزی (B) ئەوا (ئێمە) لە هۆزی (B) دا دەتوێتەوە و کۆتایی پێ دێت، لەبەرئەوە بەپێچەوانەی کاری کۆتاییهاتنی ئەم (ئێمە) یە (ئێمە)یەکی تر لە دایك دەبێت، بەم ڕیزبەندییەش پەیوەندی هۆزایەتی دووانەکی لەبەرامبەر ئەو هەڵمەتە دەرەکیەدا دەردەکەوێت. لەماوەی پێش سەردەمی فیۆدالیدا چینی فەرمانڕەوا لەپێناو پاراستنی ئەو ڕەوشە ناوەکیەی کە هەیەتی پەنای دەبردە بەر بیروباوەڕی ئاینی یان ئاین، بەڵام لەپێناو بەرگری لەبەرامبەر هێرشی دەرەکیدا پەنا دەباتە بەر نەتەوەخوازی، و هۆز لەپێناو ئەوەی شوێنەگەی بەهێزبێت لەبەرامبەر هێرشی دەرەکیدا هەڵسا بە بەستنی پەیمانگەلێك لەگەڵ هۆزەکانی تردا، و ئەم پەیمانانەش پەیماننامەکانی بەرگری هاوبەش ناودەبرێن، و لەبەرەنجامی ئەم پەیماننامانە و بەڵێننامانەدا دۆخێك لە تێگەیشن و یەکتر کێشکردن لەنێوان هۆزەکاندا دێتە ئاراوە. دەبینین ئەم پەیماننامانە زۆر دەبەسترێن لەنێوان هۆزێك و هۆزێکی تردا، و هەر لەم ماوەیەدا دوو دۆخ لە ململانێی دیالەکتیکی دەردەکەون، یەکێکیان پەیوەستی هەڵاتن لە ناوەندگەرێتی و ئەوی تریان کێشکردن بۆ ناوەندگەرێتی، و لەم جۆرە ململانێیەدا پەیوەستی نێوان کۆمەڵگاکان هەر بۆخۆی

تینووی ناوەندگەرێتی دەبێت و ئەم ناوەندەش ناوەندێکی بەهێز دەبێت، بەم واتایەش بەهێزترینیان دەبێتە ناوەند و تەوەر و ئەوانی تر پاڵ پێوە دەنێت، بەجۆرێك بەگشتی و لە بەرەنجامی ئەم کارەدا سوڕی فیۆدالی لەدایك دەبێت. بە فراوانبوون و زۆربوونی ئەم جۆرە پەیوەستیانە و هاوپەیمانێتیانە ئیمپراتۆریەت دروست دەبێت، بە واتای ئەوەی کە یەك کۆمەڵگە دەگۆڕێت بۆ یەك ناوەند کە ئیدی هۆز شوێنێکی تێیدا نیە، بەڵکو بارەکە دەگۆڕێت بۆ حکومەتێکی بەهێز (قورەیش هۆزێك بوون پاشان گۆڕا بۆ بە ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی وحکومەتێکی بەهێز کە حوکمی هەموو هۆزەکانی دەکرد). کەواتە ئیمپراتۆریەت گوزارشتە لە چەتر و خێوەتێکی گەورە کە لە سێبەرەکەیدا هۆزە جیاجیاکان دەژین بەڵام هۆزاگەریانە ناژین، و ئەو سیستەمەی لەم ئیمپراتۆریەتەد حوکمدەکات ئیدی سیستەمێکی هۆزایەتی نیە. ئەو ئاینزا جیاوازانەی کە لە سیستەمی هۆزایەتیدا هەبوون لەم سیستەمە نوێیەدا هەموویان پێکەوە دەبنە سیستەمێکی کۆمەڵایەتی هاوبەشی بونیادەکانی کۆمەڵگە، واتە تێڕوانینی گەردوونی لایان دەبێتە یەك تێڕوانینی هاوبەش کە تێیدا یەك بیروباوەڕ و یەك ژیان کۆیاندەکاتەوە.

لەم ماوەیەدا ژمارەیەك خوداوەند دەردەکەون، بەڵام لێرەدا خوداوەند لەسایەی ئیمپراتۆریەتی نوێدا جیاواز دەبێت لە خوداوەندی سەردەمی یان ماوەی پێشوو. لەماوەی پێشوودا خوداوەندەکان باپیرەی فەرمانداری هۆزیان دەنواند، لای ئەوان ئافرێنەر یان خودای تاك بوونی نەبوو، بەڵام لە سەردەمی نوێدا ئەوا تاکە خودایەکی گەورە و فەرماندار هەیە و ئینجا لەدوای ئەویشە خوداوەندە بچووکە زۆرەکانی تر دێن کە ملکەچی باڵادەستی خوداوەندە گەورەکەن، ئەم ڕیزبەندی و پلەبەندییەش لە ئاست و مەرتەبەکان دەچێ لە جیهانی خوداوەندەکاندا. (ئەم ڕەوشە و ئەم ڕیزبەندییەش لە هەموو بیروباوەڕە ئاینیە کۆنەکاندا بوونی هەبووە، بەجۆرێك کە خودایەکی گەورە هەیە

ولەدوایشیەوە ژمارەیەك خوداوەندی بچووك، و لە ڕێبازە ئاینیە شارستانیەكاندا ئەو خوداوەندە بچووكانە بە ناونیشانی فریشتەكان دێن).

كەواتە بەڵێننامە و پەیوەستی گوزارشتن لە دەركەوتنی زەینی و بیروباوەڕی فەلسەفی بۆ ژمارەیەك هۆز كاتێك لە یەك ئیمپراۆریەتدا یەك دەگرن و كۆدەبنەوە. لەم جۆرە كۆمەڵگایانەدا دەكرێت دوو دۆخی دژ بەیەك بەدی بكەین، ئەویش ئەوانەن كە: هەر كۆمەڵگەیەكی بچووك (هۆزەكان) هەوڵدەدات بۆ مانەوەی خۆی و سەربەخۆیی خۆی، هەرچی كۆمەڵگەی گەورەیە تەقەلا دەدات بۆ هێنانە ئارای یەكرِیزی، بەجۆرێك ئەم یەكرِیزییە هۆز لە گۆشەگیرییەكەی و بیروباوەڕە خودییەكەی دەرباز دەكات و سەربەخۆیی سیاسی و سەربازی و ئابووری (سەربەخۆیی ئاینی یان مەزهەبی) بە هۆزەكە دەبەخشێ، تا بتوانێ سیستەمە ئیمپراتۆرییەتیە نوێیەكەی ئاراستە بكات. ولەبەرئەوەی ئیمپراتۆریەتی سیستەمێكە لە قوڵایی سیستەمی فرەخوداكاندا (خوداكانی هۆز یان گەلانی جیاواز) بوونی هەیە، لەبەرئەوە ڕۆحی ئیمپراتۆریەتی دەكۆشێ بۆ یەكخستن و ململانێ كردن لەگەڵ فرە خوداییدا و هێنانە ئارای یەك سیستەمی یەكپارچە. ئیمپراتۆریای ڕۆمانی جێنشین و جێگرەوەی یۆنان و شارستانیەتی یۆنانی بوو، یۆنان لە ژمارەیەك دوورگە پێكهاتبوو ئەوانش: (ئەسینا، ئیسپارتە[٢]، وەسیبە و دوورگەی تر)، و هەریەكێك لەم دوورگانەش كۆمەڵگەیەكی سەربەخۆ بوون، بۆیە سیستەمی یۆنانی سیستەمی كۆمەڵگا هۆزایەتیە سەربەخۆكان بوو، و ئاین و خوداكان و ئەفسانە یۆنانیەكانیش ئەوانە بوون كە سیستەمی خێڵەكیانەیان ئاراستە دەكردن. خوداكان فرە بوون بەجۆرێك كە بۆ هەر دوورگەیەك خودایەك هەبوو، و تەنیا لەمیانەی جەنگ و پەلامار دژی ئیمپراتۆریەتیەكە دەبوون بە یەكدەنگ، و هەر كۆمەڵگایەكیش هەولیدەدا كە لە كۆمەڵگایەكی تر، لە هەموو كارو بارەكانی ژیانیدا، سەربەخۆ بێت.

دواتـر ئـەم شارسـتانیەتیە گەورەیـە (فەلـسەفە، هونـەر، سیـستەمی کۆمەڵایـەتی دیموکراسی و ماف ... ئەوانی تر) چووە ناو سیستەمێکی نوێـوە ئـەویش ئیمپراتۆریـەی ڕۆمانی بوو، بەجۆرێك کە ئەم سیستەمە نوێیە ڕەوتی شارستانیەتی یۆنانی تـەواو کـرد بۆیە بیروباوەڕی یۆنانیش ڕەوتی خۆی لەمیانەی سەردەمی ڕۆمانیـدا تـەواو کـرد. بـەڵام دەرکـەوتنی دیاردەیـەکی نـوێی دژیـەك دەبیـنین ئـەویش کۆکنـەبوونی سیـستەمی کۆمەڵایـەتی یۆنـانی لەگـەڵ سیـستەمی کۆمەڵایـەتی ڕۆمـانی. سیـستەمی کۆمەڵایـەتی ڕۆمـانی کۆشـا لـەپێناو یـەکریزی و یـەکانگیری هـۆز و خێڵـەکان، هەرچـی یۆنانیـەکان بەپێـچەوانەی ئـەم بارودۆخـەوە بـەجۆرێك بیریـان دەکـردەوە کـە هـەر کۆمەڵگەیـەك هەوڵبدات لەوەکەی تر سەربەخۆ بێت. لەبەرئەوە ناکرێـت بیروبـاوەڕی یۆنـانی دامـەزرێ لەسەر بنچینەی خێڵایەتی (فرەخودایی) لـە ڕۆمـادا، کـە سیـستەمی ئیمپراتـۆری حوکم دەکات و باوەڕی بە پێچەوانەی ئەو دۆخە هەیە، بوونی هەبێت. ئیمپراتۆریای ڕۆمانی کە لە نەژاد و میللەتە جیاوازەکان پێکهاتبوو تەقەلای دا بۆ هێنانە ئارای یـەك ڕۆحیـەت کە بتوانێ جێی ئەو سیستەمە سیاسیانەی بەسـەر هـەموو نـەژاد و میللەتـە جیاوازەکان هەبوون، بگرێتەوە، بە جۆرێك کە ئەم ڕۆحە هاوبەشە لە کۆمەڵگادا جێی خۆی بگرێت و هەستکردن و باوەڕی یەکێتی و برایەتی ببەخـشێتە کۆمـەڵگا بـەجۆرێك کـە هـەموو نـەژاد و ڕێباز و نەژادانە لەگەڵ یەکتریدا هاوتا و یەکسان بن لەو کۆمەڵگایەدا.

ئیمپراتۆریای ڕۆمانی لەکاتی بەرزترین و زۆرترین هێز و توانایـدا پێویـستی بـە ئـایین یان ئاینزایەکی یەکانگیربوو کە یەکخستن دروست بکات و ئەم ئاینـەش ئـاینی مەسیحی بوو کە لە ڕۆژهەڵاتەوە و لـە وڵاتـی فەلەسـتینەوە دەرکـەوتووە، بـەجۆرێك (یۆنانیـەکان وایان دەبینی کە ئەم ئاینە لەنێو چینە هەژارەکانی کۆمەڵگەوە سەریهەڵداوە).

ئەگەر چی خوداوەندەکان لە ڕۆمادا بوونیان هەبوو، وەکو (زیۆس) کە گۆڕا بۆ (جوبیتێر)، یان ڕۆمانی جێی یەهودیەتی گرتەوە، بەڵام دەبینین مەسیحیەت بە نیسبەت ڕۆمانیەکانەوە ڕێبازی یەکتایی دەنوێنێ و مەسیحیش نوماینەدەی یەك باوك دەکات بۆ هەموو مرۆڤ لەسەر ڕووی زەمین، لەبەرئەوە ئەو دەتوانێ کە هەموو نەژادەکان لەژێر ئاڵای ئەم باوکەدا کۆبکاتەوە، ئەگەرچی کاروبارەکە پێویست بە هێز و ناچارکردنیش بکات. لەبەرەنجامدا ئەم کۆمەڵبوون و یەکخستنە لەژێر ئاڵای ئیمپراتۆر یان ئیمپراتۆرییەتدا سەریگرت و هاونیشتمانیانیش هەر هەموویان بوونە یەك خێزان لەبەرئەوەی سەرۆکی گەورە و باوکی ئەم ئیمپراتۆریەتە گەورەی مەسیحە. بەم یەکڕیزییە و بەم یەکێتیە ئیمپراتۆر هەموو نەژادەکانی لەڕێگەی یەك کارکردەوە یەکخست ئەویش ئاینی مەسیحیە، لەبەرئەوە قبوڵکردنی ئاینی مەسیحی لەلایەن ئیمپراتۆرەوە لەیەکەم ئامانجیدا ئەو ئامانجە خوازراوە بوو کە ئیمپراتۆر تەقەلای دەدا بۆ بەدەستهێنانی، ئەویش یەکڕیزی هۆزەکان بوو بۆ دەستگرتن بەسەریاندا. خۆ ئەگەر ویستمان لەم پرسە بڕوانین لە ڕوانگەیەکی جیاواز لەم ڕوانگەی سەرەوە، ئەوا پرسەکە نابێتە پرسێکی مادی، کاتێك دەبینین بیروباوەڕی ئاینێکی ڕۆژهەڵاتی، کە بە ڕێبازێك یان ئاینێکی ڕووکەش دانراوە، چۆن توانی ئیمپراتۆریەتی گەورەی ڕۆما داگیر بکات و دەست بگرێت بەسەریدا و هەموو خواوەندەکانی یۆنانی، کە بووبوونە خودای ڕۆمانی، و هەروەها ئەو ئاگرە پیرۆزەی لە ڕۆمادا هەبوو و هەموو ئەو خواوەندانەی کە شکۆ ومەزنییان هەبوو، لابەرێت و چۆن ئەم ئاینە توانی هەموو ئەو پەرستگا ئاینیانەی هەبوون بسڕێتەوە و ئەو کۆمەڵگەیە یەك بخات بۆ پەرستشی تەنها یەك خودا ئاراستەیان بکات، کە جێی ئەو هەموو خواوەندە یۆنانی و ڕۆمانیانەی گرتەوە. پاشان پرسیارێکی تر خۆی قووت دەکاتەوە ئەویش ئەوەیە بۆچی ئەم یەکانەیی و یەکتایی و تاکایەتی یە بووە سیانەکی[٣]؟

بەدڵنیایەوە وەڵامەکە ئەوەیە کە ئیمپراتۆری ڕۆم دامابوو بۆ ئەو یەکڕیزییەی کە خزمەتی دەسترۆیشتوویی و باڵادەستی و دەسەڵاتی ئەوی دەکرد، ودوای ئەوەی ئەم ئامانجەی لە میانەی ئاینی نوێوە ساغ کردەوە و هێنایەدی ئەوا بیری کردەوە لە دۆزینەوەی کارکردێکی دیکە لەپێناو مانەوە و بەردەوامیەتی ئەو یەکڕیزییە و لەپێناو مانەوەی هێزی ناوەندیدا بۆی، لەبەرئەوە ئیمپراتۆر ئەوەی بەدوایدا وێڵ بوو و ئامانجەکەی لە بیروباوەڕی سیانەکیدا بینییەوە کە کلیلێك بوو بۆ کردنەوەی ئەو نهێنییە و ئەو پرسە. لەبەرئەوە دوای بیروباوەڕی یەکتایی و یەك خودایی مەسیح گۆڕا بۆ سێ بنەڕەت بەجۆرێك کە خودی مەسیح یەکێك لەو بنەڕەتانەی پێکهێنا، و یەکتایی مەسیح واتە هەموو نەژاد و ڕەگەزەکان هەرچەندە جیاوازبن ئەوا خاوەنی یەك خودان چونکە گەلێکن بۆ یەك باوك ئەویش گەورەی مەسیحە، بەڵام کاتێك مەسیح بەسێ دەرکەوتەوە دەردەکەوێت ئەوا ئەمەش واتە کە کۆمەڵگای ڕۆمی و چینی فەرمانڕەوا سێ ڕەهەندی دەبێت، بەواتای ئەوەی کە سیانەکی ئاینی یان ئاینزایی ڕەنگدانەوەی دەبێت لەسەر کۆمەڵگا و بەمەش ئاینزا و ئاین بۆ ئەم ڕێبازە نوێیە کە ڕەنگدانەوەی لەسەر کۆمەڵگەدەبێت (ڕەنگدانەوە لە جیاوازییە کۆمەڵایەتیەکاندا)، ئاراستە دەبێت. (واتە یەکتایی ئاراستەی سیانەکی دەبێت کە سەرهەڵداوە).

## مرۆڤ،

### فەلسەفەی ئافراندنی مرۆڤ :

لەچیرۆکە ئیسلامیەکاندا، ئادەم لە بەهەشت دەژیا و بەهۆی خواردنی درەختێکەوە لەبەهەشتەوە بۆ سەر زەمین دەرکرا. لە چیرۆکی ئادەمدا نە کۆمەڵگە و نەمێژوو بوونیان نیە، بەڵام مرۆڤ بوونی هەیە، بەواتای بنچینەییبوونی تاك، و ئەم بنچینەییبوونی تاکەش پێویستە بەدوایدا بگەڕێن لە فەلسەفەی ئافراندندا وەك لە ئەفسانەکاندا هاتووە.

١- لە چیرۆك و ئەفسانە ئیسلامیەکاندا واهاتووە کە ئادەم جێنشینی خودایە لە سەر زەمین.

٢- سەرنج و ڕەخنەی فریشتەکان لە قەومانی کوشتن و خوێن ڕێژی لە ئەنجامی جێنشینی و مرۆڤ و بوونی، لەسەر زەوی.

٣- خوداوەندی بالاّ بەوێنەیەکی تاقی کردنەوەیی و ئەزموونی باشتر بوونی ئادەمی لە هەموو فریشتەکان بۆ فریشتەکان سەلماند، کاتێك خودا پرسیاری دەربارەی ناوەکان لێ کردن نەیانتوانی وەڵامی پرسیارەکە بدەنەوە، پاشان ئادەم ئەو کەسە بوو کە ناوەکانی زانی.

٤- لەبەرەنجامی ئەوەدا فریشتەکان کڕنووشیان بۆ ئادەم برد.

٥- خوداوەند بەم ئافرێنراوە نوێیەیدا هەڵدا و ووتی (خودا باشترینی ئافرێنراوەکان پیرۆز دەکات). ئەمەش واتە خودا ئادەمی لەسەر باشترین شێوە ئافراند و ئەو باشترین و چاکترینی هەبوونەکانە.

٦- پاشان خودای بالاّ ڕاسپاردە (الأمانة) کەی خۆی بۆ ئاسمانەکان و زەمین و چیاکان خستە ڕوو، هەر هەموویان خۆیانیان لێ لادا و وەریان نەگرت، پاشان ئادەم شانی دایە بەر.

٧- بەپێچەوانەی کرداری خودایی لە هەمبەر وەرگرتنی ڕاسپاردەکە لەلایەن ئادەمەوە، ئەوە ئاراستەکردنی ڕەخنەی توندە بۆ سەری کاتێك دەڵێت مرۆڤ چووە ژێرباری ئەو ئەمانەتە و ستەمی لێکرا.

٨- فێرکردنی پەیامی پێغەمبەرایەتی بۆ ئادەم.

٩- ئادەم دروست کراوێك لە قوڕێ بۆگەن وچینی خڵتەی بەستوو وەکو قوڕی هەڵهاتووی ڕەق، هەرچی فریشتەکانن لە ڕووناکی، واتە ئاگرێك کە دووکەڵی نیە،

دروست کراون، ئەوان ڕواڵەتن بۆ ڕووناکیەکی باڵا، پاشان خودا لە ڕۆحی خۆی فووی کرد بە ئادەمدا.

١٠- پاشان ئادەم لە بەهەشتدا ئازاد بوو، بەهەشتیش ئەو شوێنەیە کە خاکەکەی لەبەر چڕوپڕی سەوزایی و درەختەکانی ناتوانرێت ببینرێت، لە تەوراتدا هاتووە کە بەهەشت دەکەوێتە شوێنێکەوە نزیکی ئەردەن و ناوی (بەهەشتی عەدەن)ـە.

١١- ئادەم بە گریانی گوزارشتی لە تەنیایی خۆی کرد، پرسی تەنیایی ئادەمیش لە هەموو فەلسەفەکانی ئافراندندا هاتووە، لەوانەش فەلسەفەی چین و یابان و هیند، کاتێ ئەم فەلسەفانە وا بۆیان وێناکردووین، ئادەم لەسەرەتای دروست بوونیدا لە لوتکەی ئاسوودەییدا بوو پاشان وایلێهات هەستی بە ئازاری تەنیایی و ترس کرد.

١٢- پاشان خودا لە پەراسووی چەپی ئادەمەوە حەوای ئافراند، لە قورئان و تەوراتیشدا هۆکاری ئافراندنی حەوا هاتووە، بۆ ئەوەی ئادەم دڵنیا و ئاسوودە بێت وحەوا ببێتە هاوڕاز و هاودەمی. دڵنیاییش دژی پەشێوی و بێتاقەتیە، ئادەم گینگڵی دەخوارد بەهۆی تەنیایەوە، خوداش حەوای بۆ دروست کرد تا تێیدا هاودەمی و دڵنیایی زیندوو بکاتەوە.

١٣- ئادەم و حەوا لە هەموو ناز و نیعمەتەکانی بەهەشت کەڵکیان وەردەگرت بێ هەوڵدان و ماندووبوون، تەنیا بە نیازکردنێك دەستیان دەگەیشت بە هەر شتێك کە بیانویستایە بەوەش پێداویستیەکانیان تێر دەکرد. خوای گەورە فەرمانی پێکردن کە بۆیان هەیە لە هەر شتێ کە لەبەهەشتدایە بخۆن، تەنیا یەك درەخت نەبێ کە بۆیان نیە لێی نزیك ببنەوە (ولا تقربوا هذه الشجرة) و لە تەوراتیشدا هاتووە کە ئەو درەختە درەختی گەنم بووە زیاتر لەوەی درەختی ترێ بووبێ. و ئەکرێت درەختەکە پەیوەست بووبێ بە پێ خستنە ناو قۆناغی کشتوکاڵیەوە لەلایەن مرۆڤەوە.

١٤- شەیتان تاکە ئافرێندراوێکە کە کڕنووشی بۆ ئادەم نەبرد، و لێرەدا لە خودای بالادەست یاخی بوو، پاشان پەیمانێکی دا بە خودای گەورە کە تۆڵەی خۆی لە ئادام و نەوەکانی دەکاتەوە، خوداش بواری ئەو کارەی پێدا.

١٥- بەڵگەی شەیتان بۆ کڕنووش نەبردنی بۆ ئادەم و گوێڕایەڵی نەکردنی فەرمانی خودای بالا ئەوەبوو کە ئەو لە ئادەم باشترە (چونکە لە توخمی فریشتەکانە) و لە دەستەی فریشتە نزیکەکانە لە خوداوەند (هەموو فریشتە نزیکەکان و نا نزیکەکان تەنانەت جوبرائیل و میکائیلیش کڕنوشیان برد)، بەڵام ئیبلیس بە باشتربوونی ڕەگەز وپلەو پایەوە خۆی هەڵدەکێشا و بەخۆیدا دەنازی.

١٦- شەیتان تەقەلای خۆیدا بۆ فریوودانی ئادەم و ڕاکێشانی بۆ سەرپێچی خودای ئافرێنەر، لەپێناو ئەمەشدا فێڵ و فڕ و تەڵەکەبازی هەمەجۆری گرتە بەر، تا ئەوەی کە لە شێوەی مارێکداخۆی نیشاندا و لە ڕێگەی (حەوا)وە هات بۆ لای ئادەم و تا لەڕێی فەرمانی خودا لایبدا، بە خواردنی ئەو میوەیە کە هۆکاری دەرکردنی بوو لە بەهەشت، فریووی بدات.

١٧- ئادەم و حەوا هەموو ڕۆژێك بانگی خودایان دەبیست و وەڵامی ئەو بانگەیان دەدایەوە، بەڵام لەو ڕۆژەدا وەڵامی ئەو بانگە خوداییەیان نەدایەوە، و خۆیان لە خوداوەند شاردەوە چونکە بێ جل و بەرگ بوون. پاشان بانگە خوداییەکە دێتە گوێ کە بۆچی لەو درەختەتان خوارد. پاشان خودا فەرمانیان پێ دەدات بە دابەزاندن لە بەهەشتەوە بۆ سەر زەمین، بەجۆرێك کە خۆیان دەبێ خواردنی خۆیان بەدەست بهێنن وسزاو مەینەتی لەسەر زەمین بچێژن.

ئەوەتا ئادەم و حەوا دابەزێنراونەتە سەر زەمین کاتێك کە نە کۆمەڵگە بوونی هەیە و نەمێژوو، بەڵکو ئەوەی هەیە تەنیا مرۆڤە، ئەم مرۆڤە مرۆڤی ڕەهایە، لێرەدا دەکرێت

بووترێت ئەم ئەم چیرۆکە بۆ یەك بەیەکمان ڕاستە، ئەوەش ڕێگەی بونیادنانی دانە بەدانەی مرۆڤە، ئەم چیرۆکە ڕێگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ بنیاتنانی مرۆڤ.

ئەم چیرۆکە لە کتێبە ئاسمانیەکاندا باسی هاتووە، کەچی چیرۆك و ئەفسانەگەلی یۆنانی هاوشێوەی لەم بارەیەوە هەیە. لە ئەفسانە یۆنانیەکاندا هاتووە کە خود (برۆمتە) ئەو خودایەیە کە مرۆڤی دروست کردووە، کاتێك کە ژمارەیەك خوداوەند هەبوون، و هەر خودایەکیش تایبەتمەند بوو بە دروستکردنی شتێك لە شتەکان، مرۆڤ ئافرێندراوی خودا برۆمتە بوو.

بنچینەی ووشەی (برۆمتە) لە دوو ڕەگ و ڕیشەوە وەرگیراوە ئەوانیش (برۆ) بەواتای پێشتر (پێشوەختە) و (متە) بەواتای زانیاری، کەواتە ووشەی برۆمتە واتە زانیاری پێشوەختە، مرۆڤی دروست کراویش یان ئادەم واتای ئەوکەسەیە کە داهاتوو دەبینێ و نەخشەی بۆ ئەکێشێ. مرۆڤێك کە خوداوەند ئافراندوویەتی ئەو مرۆڤەیە داهاتووی خۆشدەوێ و داهاتوو دەبینێ، واتای ئەم گووتەیەش ئەوەیە کە مرۆڤ هەمیشە بیردەکاتەوە ونەخشە بۆ داهاتوو دەکێشێ، لەمەشدا بە پێچەوانەی بوونەوەرەکانی ترەوەیە لەکاتێکدا کە ئەوان بیرناکەنەوە و نەخشەشیان بۆ داهاتوو نیە، ئەو مرۆڤەی کە داهاتووی لایە ئەوا ئەمڕۆی جیاواز دەبێت لەدوێنێ و سبەینێشی جیاواز دەبیت لە ئەمڕۆی.

برۆمتە مرۆڤی ئافراند و بە ئازادی لەم سەر زەمینە لێی گەڕا، هەرچی (زیۆس)ی خودایە ئەوا ئەو خودای جیهانە و برۆمتە یەکێکە لەو خودایانەی کە لە دەورویەریدا هەن.

لەسەرەتادا ئاگر لەسەر زەمین نەبوو، برۆمتەش بەهۆی خۆشەویستی مرۆڤ و پەیوەندییەکەی بە مرۆڤەوە، ئەوا لەو شەوەدا کە هەموو خوداکان نووستبوون، ئەو ئاگر دەدزێت و دەیخاتە ناو شمشاڵەکەیەوە و دەیهێنێت بۆ سەر زەمین، مرۆڤیش ئاگر لەو

شمشاڵەوە وەردەگرێت. لەڕۆژی دواتردا زیۆسی خواوەند و هەموو خواوەندەکانی تر دەبینن کە زەوی بەهۆی ئاگرەوە ڕوناك بۆتەوە، یەکسەر دەزانن برۆمتە بەم کارە هەڵساوە، بۆیە دەیبەن فرێی دەدەنە خوارەوە بۆ سەر چیای قەفقاز، پاشانیش بە زنجیر و کۆتەکان بەندی دەکەن. زیۆس دووان لە بەرفەرمانەکانی خۆی بۆ هەڵسان بەم کارە دەنێرێت، ئەوانیش (کاروما) و ئەویتریشیان (هەفایستۆس)ن. کاروما بەرپرسی ئەنجامدان و جێ بەجێ کردنی کارەکە بوو، و ئەو بەخشراوە لە کارەکەی چونکە بەرفەرمانێکە لە بەردەستی زیۆسدا و هیچی تر، هەرچی (هەفایستۆس)ـە ئەوا ئەمیان لۆژیك دەنوێنێ، بەواتای ئەوەی کەسێکە عەقڵ و بیری ڕووناکە و لۆژیکیانەیە، بۆیە دەزانێت کە ئەم ئەرکەی ئەوی بۆ نێردراوە ئەرکێکی ستەمگەرانەیە، بەڵام لە ڕاستیدا یەکەم زنجیر کە دەکرێتە پێی برۆمتە هەفایستۆس دەیکاتە پێی نەك بەرپرسی ئەنجامدانی کارەکە (کاروما) (ئەمەش لەگەڵ چیرۆکی ڕووداوی کەربەلادا وێك دێتەوە کە عومەری کوڕی سەعد بەتەواوی هەفایستۆسە، کاتێك کە ئەو سەری لە کاروبارەکە دەردەکرد، و باوەڕی بە ئیمام حوسێن (سەلامی خوای لەسەر بێت) هەبوو، بەڵام ئەو یەکەم کەس بوو کە سەربازەگەی ئیمام حوسەینی دایە بەر تیر و پاشان ئیدی جەنگ دەستی پێکرد).

برۆمتە لەنێوان بیابانەکان و چیای قەفقازدا (دوورترین پنت لە یۆنانەوە) بوو، زیۆس بڕیاری پچڕاندنی هەموو پەیوەندییەك لەگەڵیدا و سەردان نەکردنی لەلایەن خواکانەوە، دەرکرد، بەڵام کچانی ڕووبار دەڕۆن بۆ سەردان کردنی و لەگەڵیدا دەدوێن و بەشداری و هاوبەشی مرۆڤی لەم نەگبەتی و دەردەسەری و ئازارەی پێ ڕادەگەیەنن. هەرچی باوکی ئەم کچانەیە گینگڵ بەم سەردانانەوە دەخوات، بۆیە سەرزەنشتی کچەکانی دەکات لەسەر ئەم کردارانەیان و ڕەفتارکردنیان دژی فەرمانەکانی زیۆس،

باوکی ئەم کچانەش (ئەکئانۆس)ی خواوەندی دەریاوانیە. کچێکی تریش هەیە کە ئەویش هەر لە لایەن زیۆسی خواوەندەوە دەرکراوە (وپێموایە کە ئەویش هەر یەکێك بوو لە خواوەندەکانی میللەتانی یۆنان)، ئەم کچە لەلایەن زیۆسەوە ناچار کراوە کە لە پشتی زەمینەوە لەگەڵ چارەنووسیدا بۆ نووسراویدا، کە ئەویش تەنیایی و دەربەدەرییە، بژی. هەر ئەمیشە کە دەبێتە هاودەمی برۆمتەی خواوەند.

هەموو ئەم چیرۆکانەی کە گێڕامانەوە لە دەوری فەلسەفەی ئافراندنی ئادەم دەسوڕێنەوە، گوزارشتن لە کۆمەڵێك زانینی مرۆڤ کە لەم قوتابخانە هزرییەی ناوی قوتابخانەی زانینی مرۆییە، بوونیان هەیە. بە گوێرەی ئەم سەرگوزشتە و چیرۆکانە دەتوانین مرۆڤ بەو شێوەیە بناسین کە گوزارشتە لە بوونەوەرێك، داهێنراوێك کە لە کۆکردنەوەی دوو دژەوە دروست کراوە، ئەم بوونەوەرەش هەر وەك ویستی خودایی لە جیهاندا، ویست (إرادە)ی هەیە (بە ئەندازەی ئەو نا، بەڵکو وەکو ئەو)، هەروەها خاوەنی ڕاسپاردەیەکە کە لە ئافرێنەری باڵای وەرگرتووە و ئەم ڕاسپاردەیەش هەر لە مرۆڤ خۆیدا کورت کراوەتەوە. لەم ئەرکەشەوە کە بە مرۆڤ بەخشراوە دەتوانین بەرپرسیارێتی پەیماندانی مرۆیی هەڵێنجێنین.

لێرەدا دەتوانین بڵێین کە مرۆڤ بەرپرسە لە بونیادنانی داهاتووی خۆی و چارەنووسی خۆی، داهاتوو چارەنووسی چینەکەی و کۆمەڵگەکەی و مێژووەکەی. هەروەها داهاتوو چارەنووسی سروشت (بەو واتایەی کە خوداوەند چارەنووسی مرۆڤی دیارنەکردووە بەڵکو ئەوە مرۆڤە کە چارەنووسی خۆی دیاریدەکات) ئەمەش ئەو ڕاسپاردەیەیە کە بەڵێنی لەسەر داوە. کەواتە ڕاسپێردراو واتە ئەو مرۆڤەی کە خاوەنی ئامانج و هەڵبژاردن و توانا و بەڕێوەبردن و زانین و داهێنان (هونەر لە داهێنانەکانیەتی)ـە، ئەمەش واتە خاوەنبوونی کۆمەڵێك توانای نا کۆتا.

(سروشتی مرۆڤ بوونەوەرێکی بچووکە بەڵام مرۆڤ خۆی نا سنووردارە، ئەو لەڕووی بەکردار (بالفعل)ەوە بچووکە، بەڵام لەڕووی بەهێز (بالقوە)ەوە ناکۆتایە یان نا سنووردارە، ئەمەش بە پێچەوانەی دیاردە سروشتیەکانی ترەوەیە. مرۆڤ خاوەنی توانای وەرگرتنی بەهای ئاکارەکیە خودابیە تایبەتەکان و گۆڕانکاری و هەڵبژاردنەکان وداهێنانەکان و بوونیادنانی کەسایەتی و جێ هێشتن و تێپەڕاندنە (تجاوز) (مرۆڤ بوونەوەرێکی تێپەڕێنەرە).

لە کۆتاییدا دەتونین بڵێین مرۆڤ بوونەوەرێکی دژە، لە دۆخی خۆگۆڕکێ و دروست بووندایە، لەلایەکەوە ئەو لە خراپترین مادەوە کە لە سروشتدا هەبێت (کە ئەویش مادەی بۆگەن و خڵتەیە) دروستکراوە، و لەلایەکی تریشەوە ئەوباشترین بوونەوەرە لە سروشتدا چونکە هەوڵدەدات بۆ کامڵبوون و ڕۆیشتن بەرەو خودا و خاوەنی عەقڵی خودییشە. ئەو بەرپرسیارێتی خودایی و ڕاسپاردەی ڕەبانی هەڵگرت و بووە خاوەنی ئافراندن و داهێنان لەسەر ئەم سروشتە.

**فەلسەفەی مێژوو :**

لەتێڕوانینی مندا فەلسەفەی مێژوو لە چیرۆکی هابیل و قابیلەوە دەست پێدەکات، واتە لەو وێنەیەوە کە مرۆڤ تێیدا دەستی کردە ململانێ و دژایەتیەکی دیالەکتیکی. لە فەلسەفەشدا مێژووی مرۆڤ لە دژیەکیەکەوە دەگاتە ململانێیەکی دیالەکتیکی، دەست پێدەکات. ئەم ململانێ دیالەکتیکیەش بریتی یە لە شتێکی دژ بەیەك لەنێوان جۆری مرۆڤ خۆیدا و لەنێوان خودا و مرۆڤیشدا. لەمێژووشدا ئەوکاتەیە کە ململانێ لەنێوان مرۆڤ و مرۆڤدا سەرهەڵدەدات، بەواتای ئەوەی کە دژیەکی مێژووی لەگەڵ کێشمەکێشی مرۆڤ و مرۆڤدا دەست پێدەکات و هەردوو لایەنە دژ بە یەکەکەش هەر مرۆڤن. لێرەدا دژ بەیەکی ناکرێت لەجۆردا بێت، بەڵکو ئەو دژیەکیە بریتی یە لە دژیەکیەکی چینایەتی لەنێوان مرۆڤ و براکەیدا.

دوو جۆر دژیەکی هەیە، دژیەکیەکی خۆرسك و دژیەکیەکی مێژوویی، خۆرسك لە ناخی مرۆڤ خۆیدایە، هەرچی مێژووییە ئەوا ئەو دژەیەکیەی لە ئارادایە بریتی یە لە دژایەتیەکی چینایەتی. هەروەك ووتیشمان مێژوو لە ململانێ چینایەتیەکان وجەنگە مێژووییەکانەوە دەست پێدەکات کە لەسەر بنچینەی بۆماوەیی مێژووییەوە بنیادنراوە. ئەمەش لە سەرەتای مێژووەوە دەستی پێکردووە و هەر بەردەوامیشە، و ئەم جەنگەش شێوەی جۆراو جۆر و جیاوازی بەدرێژایی مێژوو بەخۆوە گرتووە، تەنانەت کۆتاییەکەشی کۆتاییەکی ناچارەکی و یاساکەشی یاسایەکی زۆرە ملێیانە دەبێت کە کاروبارەکە هاتنە ئارای کۆمەڵگەیەکی دامەزراو لەسەر هێز و عەدالەت و دامەزراندنی بەڕێوەبردنی خودایی و بەجێهێنانی بەڵێنەکەی کە بە چینی داماو و دەستکورتی داوە و لەلایەن ئەوانی ترەوە دەست بەسەر کراوە و لە بەرهەمهێناندا بەکارهێنراوە، دەگاتە کۆتایی.

ئەم چینە لاوازە چینی بێ بەش و فەرمان بەسەرداکراو بووە بە درێژایی مێژوو. و ملکەچی سیستەمێکی ناچارەکیانەی قاروونئاسا بووە، بەڵام لە شۆڕشی ناچارەکید (الثورة الجبرية) ئەو چینە زۆردارە بە کۆتا دێت و میراتی زەمینیش بەدەست ڕابەرێکی چاکەکارەو دەبێت. (ونريد أن نمن على الذين استضعفوا في الأض ونجعلهم أئمة ونجعلهم الوارثين).

ئەمەش ئازادبوونی لاوازەکان وچینی بێ بەشە، هەروەکو مارکس لە بارەیەوە ووتوویەتی کە ژێرخانی کۆمەڵگا وهەروەها ناوەکانیشی لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر دەگۆڕێت. بەڵام من پێم وایە کە ناوەکان (ناوە فەرمانڕەواکان) دەگۆڕێن، بەڵام ژێرخانی کۆمەڵگە بە جێگیری دەمێنێتەوە، چونکە ژێرخان تەنیا یەکجار دەگۆڕێت ئەوەش لە کۆتایی مێژوودایە (کۆتایی مێژوو چ کاتێکە، ئەمەیان پەیوەستە بە ویستی

مرۆڤەوە)، گۆڕانکاری ئەو کاتە ڕوودەدات کە ژینی بێ بەش کراو ئازادی و سەربەخۆیی خۆی بەدەست دێنێ ولە ژینی فەرمانڕەوا دەربازی دەبێ و ئەو دەبێتە خاوەنی فەرمان و ڕەتکردنەوە، و کاتێ: کە ئەو دەبێتە سەرکردە و ئاراستەکەری کۆمەڵگە، هەر ئەویشە میراتگری ڕاستەقینەی ئەم زەمینە.

بەم جۆرە فەلسەفەی مێژوو دروستبوو، کە لە سەرەتاوە دژیەکی و ململانێی چینایەتی و لادانی ئاکاری و مەزهەبی بەخۆیەوە دەبینێ، و ئەم گەندەڵیە ئاکارییەش هۆکارەکەی چینی فەرمانڕەوایە، پاشان جەنگە بەردەوام یەك لەدوای یەکەکان، پاشان قۆناغی چاوەڕوانی و بەدویشیدا شۆڕشێکی ناچارەکی و داواکردن بۆ عەدالەت دێتە پێشەوە ولەپاشان کۆمەڵگایەکی خاڵی لە چینەکان و چینایەتی بەدی دێت، کاتێك کە حوکم و بەڕێوەبردن دەکەوێتە دەستی چینی بەرفەرمانەوە کە حوکمی مرۆڤ و جیهان دەکات و لێرەشدا بونیادنانی کۆمەڵگای خوازراو دەست پێدەکات.

لە سیستەمی قابیلیدا هەل و دەرفەتێك بۆ بونیادنانی کۆمەڵگای خوازراو لە ئارادا نیە، کەچی هەر مرۆڤە لەم سوڕەدا شارستانیەت بونیاد دەنێت و ئەوە خاوەنی زانست و ڕۆشنبیرییە، بەڵام هەموو کاروبارانە لە خزمەتی چینی فەرمانڕەوادا دەبن، تەنانەت ئاینیش خزمەت بە بێ بەشکراوەکان ناکات.

کۆمەڵناسیش باوەڕی ئەم ململانێ و دژیەکیە هەیە، لە فەلسەفەی مێژوودا کۆمەڵگا لە دۆخی بزاوت وجووڵەدا دەبێت کاتێك کە دوو چینی دژ بەیەك هەن، ئەوانیش:

١- چینی خەڵکی ڕەشۆکی.

٢- چینی ستەمگەر یان چینی مەزهەبی بە گوزارشتی قورئان چینی تایبەت و خۆشگوزەران. مەرتەبەی چینی بێ بەشکراو لە ئاستی مەرتەبەی خوادایە، واتە چەمکی خودا هاوتای چەمکی خەڵکیە، ئەمەش واتای ئەوە نادات لەڕووی فەلسەفی و زانستیەوە

چینی خەڵکی لەگەڵ خوادا تەماهی بکەن، بەڵکو واتە ئەوەی کە خودا لەگەڵ خەڵکدا و هاوشانی خەڵکی لە ڕووبەڕووبوونەوەی چینەکەی تردایە. چینی خەڵکی ئاینیان یەکتاییە، هەرچی ئەو چینەکەی ترە بیروباوەڕیان هاوبەشێنەیی یە. لێرەدا هەر یەکە لەم دوو چینە چینی خەڵکی و گشتی و چینەکەی تر هەر یەکەیان مەزهەبێك و ئاینێکیان هەیە، لێرەشەوە جەنگە یەکتاییەکان، کە لە درێژایی مێژوودا بوونیان هەبووە، جەنگی خەڵکی بووە لەپێناو یەکخستنی چینەکان و هێنانە ئارای یەکڕیزی لەنێوان ڕەگەزەکاندا، هەرچی جەنگە هاوبەشێنەییەکانە ئەوا جەنگی چینی فەرمانڕەو بووە دژی چینی بەرفەرمان لەپێناو جێگیرکردنی دەسەلاتی خۆی وهێنانەکایەی پەرتەوازەیی و ڕەگەزپەرستی، ئەم جۆرە جەنگەش هەمیشە بوونی هەبووە، هەرچی جەنگە مەزهەبیەکان یان ئاینییەکان ئەوا بریتین لە جەنگی مەزهەب لەگەڵ مەزهەبدا، یان ئاین لەگەڵ ئایندا، و ئەم جەنگەش بە هەمیشەیی لەنێوان هاوبەشێنەیی و ئاینە بەرپا نەبووە، بەڵکو هەندێ کات هەردوو دژەکە لە یەك ئاین بوون جا ئیتر موسوڵمان بووبن یان مەسیحی یان هەر ئاینێکی دیکە، واتە جەنگ لەنێوان ئیسلامی فەرمانڕەوا و ئیسلامی بەرفەرمانداا، کاتێك مرۆڤی بەرفەرمان بەکرداری یەکتاخوازە، کە لەلایەن خەڵکانی موسوڵمان ویەکتاخوازەوە حوکمکراوە. ئەوانە جەنگیان لەگەڵ ئەوانەدا کرد کە جەنگیان لەگەڵ هاوبەشێنەرەکاندا کرد و مزگەوتەکانیان بونیادنا و نادییەکانی مەیخواردنەوە وخراپەکارییان وێران کرد.

دۆکترین (العقیدە) :

گوزارشتە لە زانینێکی بیروباوەڕی، و بریتی یە لە جۆرێك لە مەعریفەی تایبەتی و ئەم مەعریفەیەش لەسەر شێوەی ئەم بەشانەیە:

زانینی فەلسەفی، زانینی هونەری یان ئیستاتیکی[٤] یان زانینی ئەدەبی – هونەری، زانینی عیرفانی، زانینی کۆمەڵایەتی، زانینی سیاسی، زانینی زانستی، و زانینی بیروباوەڕی یان هزری.

ئەو جەنگەی ئێستا ئەگوزەرێت یان بەرپایە لەنێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادایە، ڕۆژئاوا هەر شەش زانینەکەی لەبەر دەستدایە و لەباشترین حاڵەتدا خاوەنیانە بەڵام لە زانینە بڕواییەکاندا کلۆڵە، بەو واتای کە ڕۆژئاواکاتێك دەجەنگێت ئەوا کۆی ئامرازەکانی لە بەردەستدایە بەڵام نازانێت بۆچی و لەپێناوی چیدا دەجەنگێت چونکە لەڕووی بڕواوە هەژار. هەرچی ڕۆژهەڵاتە ئەوا ئەم زانینانەی لە بەردەستدانیە بەڵام خاوەنی مەعریفەی باوەڕی و بڕوای ئاینییە، کاتێکیش دەجەنگێت هیچ شتێکی نیە بەڵام ئەزانێت بۆ دەجەنگێت، و دەچێتە ململانێیەکی هزرییەوە لەگەڵ هەموو مەزهەبە جیاوازەکانی تردا، وەکو ڕوونیشە سەرکەوتن هەمیشە بۆ ئەوانەیە کە بڕوایان هەیە و داکۆکی لێدەکەن چونکە باوەڕ هەمیشە لەژێر فشار و لێداندا گەشە دەکات، بیروباوەڕ تووشی تاقی کردنەوە دەبێت لەناو ئەو جەنگانەدا، بەڵام بەردەوام دەستی دەگاتە هێز و بەرزبوونەوەی زیاتر. شەش زانینەکە تووشی لاوازی دەبێت لە سەردەمی داهێزراندا، هەرچی باوەڕە یان مەعریفەی بڕواییە ئەوا لە سەردەم و ماوەی داهێزانەکەدا هێز بەدەست دێنێ. لەبەر ئەوە دەبینین کە ڕاپەڕینە باوەڕییەکان هەمیشە لە کۆمەڵگا داهێزراو و وێرانەکانەوە هەڵقوڵاوە نەك لە کۆمەڵگا شارستانیەکانەوە، وەکو ڕاپەڕینی ئیبراهیم، بودا، مەسیح، یەحیا، محەمەد (د. خ) هەموو ئەم ڕاپەڕینانە لە کۆمەڵگا و هۆزە داتەپیوەکاندا بوون، کاتێك ئەم کۆمەڵگایانە هیچ جۆرە زانینێکیان لەو جۆرە زانینانەی پێشوو نەبووە، بەڵام هەمیشە سەرکەوتن یاوەریان بووە، پاشان دەستیان گرتووە بەسەر ئەو شوێن و ناوچانەدا کە لە ژێر سایەی شەش زانینەکەدا ژیاون کاتێك

کە لە لوتکەی پێشکەوتنیاندا بوون، ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینانە لەو ناوچانەدا دامەزراون کە ئەو شەش زانینەیان لە دەست داوە. دەبینین گەورەترین ئەو ئیمپراتۆرییەتانەیان کۆنترۆڵکردووە و بەڕێوەیان بردوون کە هەبوون، کۆمەڵگاکانیان چێژیان پێوە بینیوون و بە بوونی ئەو زانیاریانە جیامەند بوون(٥).

مەعریفەی بڕوایی وا لە مرۆڤ دەکات مرۆڤێکی گەورە بێت، هەرچی زانینەکانی ترە وا لە شارستانیەت دەکەن شارستانیەتێکی گەورە بێت.

لە مێژووی ئیسلامدا مەدینەی مونەوەرە هەبوو، بەتایبەت لە سەردەمی پێغەمبەر و ئیمام عەلی و ئەبو بەکر وعومەر و ئەبی زەڕ و ئەوانی تردا، هەروەها شارەکانی تر هەبوون وەکو مەدائن و تیسفۆن و ڕۆما و ئەسکەندەرییە، کە لەو کاتەدا چەقی شارستانیەت بوون، بەڵام جیاوازی لەنێوان مەدینەی پێغەمبەر وشارەکانی تردا بریتی بوو لە بیروباوەڕ کە بەرامبەر زانینەکانی تر هەبوو لەو شارانەی کە باسکران، بەڵام ئەنجامی ئەو ململانێی و کۆتایی ئەو جەنگانە بەدەستی خاوەن بڕوا و باوەڕدارەکانەوە بوو.

بڕوا جۆرێکە لە زانینی تایبەتی و پەیوەستیەکیشی بە بەدەستهێنان یان سەلماندن و بابەتەکانی ترەوە نیە، بەو واتایەی مەرج نیە چینی خوێندەواری خاوەن زانیاری و زانست ببنە خاوەن باوەڕ.

هەندێ کات نەتەوەیەکی خاوەن پەیامێکی نەتەوەخوازی هەیە، پاشان دەبێتە خاوەن بڕوایەکی باوەڕی و هەندێ کاتیش پاڵپشتکەری نەتەوەخوازی و چینایەتی هەیە کە پاڵپشتی لە باوەڕی مرۆڤ دەکەن. هەرچی مەزهەبە هەمیشە کێشکراوێکە بۆ باوەڕی مرۆیی، هەرچی قوتابخانەی هزریشە هەمیشە ئاراستەکەی بۆ باوەڕی نەتەوەخوازی وچینایەتی یە، و هەندێ کاتیش هەردووکیان لەئارادادەبن بەو واتای ئەوەی کە قوتابخانەی هزری خاوەن بڕوایەکی جیهانییە، یان مەزهەب خاوەن بڕوایەکی چینایەتیە(٦).

کەواتە بیروباوەڕ بریتی یە لە مەعریفەیەکی تایبەتی لای مرۆڤ ، ڕەنگە مرۆڤێک هەلگری بێت کە دەستی نەگەشتبێتە خوێندن و زانست و مرۆڤی خوێندەوار و خاوەن زانستیش لە دەستی بدات. زنمینی بڕوایی جۆرێکە لە زانینی کۆمەلایەتی، مێژوویی و مرۆیی و جۆرێکە لە دانایی یان ئەوەی پێی دەڵێن جۆرێك لە (سۆفیا)ی یۆنان. ووشەی دانایی (حیکمەت) لە قورئانیشدا هاتووە (ویعلمهم الكتابة و الحكمة) ئەو پێغەمبەرانەش کە خەلکیان فێری نووسین و حیکمەت کرد زانای فیزیا یان کیمیا یان ئەدەبیات و زانستی تر نەبوون، بەڵکو هاتوون بۆ فێرکردنی خەلکی و پێدانی ڕێنمایی بڕوایی بە خەلکی.

بڕوا کەدەبێتە بەرەنجامی هزری باوەڕی و بیروباوەڕی، ئەوا باوەڕێکە کە بەهاو بایەخێکی هەیە و ئەمەش پێچەوانەی بڕوای بۆماوە یان بڕوای تەقلیدییە کەچینی بێ بەشکراو لە بڕوای تەقلیدیدا دەگاتە سەر حوکم و فەرمانڕەوایی و کاروبارەکان وەردەگرێت ئەوا دەبێتە لاوازی و گەندەڵی بیروباوەڕ و بەلاڕێدا بردنی، چونکە لەپێناو مانەوە لە هێزدا ئەوان شوێنێ ئەم شێوازانە دەکەون بۆ ساهتەکردنی بیروباوەڕ وگەندەلکردنی و ڕاکێشانی خەلکی و بێ هۆشکردنیان بەبێ کارپێکردنی چەك و هێز بەلام بیروباوەڕ گوزارشتە لە بڕوایەك کە دەکرێت دەستنیشان بکرێت و ڕاڤە بکرێت لەسەر بنچینەی مەعریفەی گەردوونی و مەعریفەی مرۆیی یان مێژوویی یان کۆمەلگا ئەوەش بەرپرسیارێتی کۆمەلایەتی تاك یان چین یان نەتەوەیەکی دیاریکراوە، یان بەرپرسیارێتی کۆمەلایەتی مرۆیی دیاریکراوە بەرامبەر پرسە پەیوەستەکان بە ئان و ساتی ئەو کۆمەلەیەوە و ڕەوشی ئەو کۆمەڵە لەو کاتەدا و لەبەرامبەر ڕەوشی چینایەتی و نەتەوەیی ئەو کۆمەلەدا. یان بریتی یە لە بەرپرسیارێتی مرۆڤ و کۆمەلەکەی و پەیوەستیان لەبەرامبەر کۆمەلەکانی تر وچینەکانی تردا، و پەیوەستیان لەگەڵ ڕژێمە

جیاوازەکاندا کە پەیوەندییان پێیانەوە هەیە، لەوانەش بەرپرسیارێتی مرۆڤ لە هەمبەر قەوماو و ڕووداوەکانی جیهاندا. بەشێوەیەکی گشتی عەقیدە بریتی یە لە دیاریکردنی چارەنووسی مرۆڤ و قەدەری مرۆڤ.

بەڵام پرسێکی تر هەیە ئەویش ئەوەیە کە ئەو عەقیدە (بیروباوەڕ) ڕژێم یان ڕەوشی خوازراو لەبواری مرۆیی و کۆمەڵایەتی و هزری و مادیدا لەبەرامبەر ڕەوشی لەئارادابوو-بونیاد دەنێ، هەر ئەوەشە ئەو مەودا یان بۆشاییەی کە هەیە لەنێوان ڕەوشی ئارا و ڕەوشی خوازراودا، بۆ مرۆڤ دیاریدەکات.

لەبەرئەوە دژیەکیەکی بیروباوەڕی لەنێوان ڕەوشی ئارا وڕەوشی خوزراودا هەیە بەو واتایەی کە لە عەقیدەدا سەرنج و ڕەخنە هەیە لەسەر هەل ومەرجی ئارا و ئەو مرۆڤەی کە ئەو ڕەوشە بونیاد دەنێ و دروست دەکات. عەقیدە هەمیشە ڕەتکردنەوەی ڕەوشی ئارا لە بەرامبەر ڕەوشی خوازراودا دەنوێنێ، مرۆڤی باوەڕی ئەو کەسەیە بەدوی مرۆڤی خوازراو و کۆمەڵگای خوازراودا دەگەڕێ.

لەسەر ئەمەشەوە عەقیدە وەکو ووتمان گوزارشتە لە بڕوایەك کە لەسەر تێڕوانینی گەردوونیانەی یەکانگیریی و ناچارەکیانەی دیالەکتیکی- دژیەکی چینایەتی کە لە کۆمەڵگادا هەیە و پەیام و بەرپرسیارێتی مرۆڤ لەبەرامبەر میتافیزیکا، دامەزراوە هەرچی ململانێی تاك یان کۆمەڵە ئەوا لەڕووی هونەرییەوە بۆ دوو قۆناغ دابەشدەبێت.

قۆناغی یەکەم:

بریتی یە لە هێنانەئارای ڕژێمێکی شۆڕشگێڕی لەسەر بنچینەی بوونی سەرکردایەتیەکی هزریی باوەڕیی شۆڕشگێڕی، بەجۆرێك کە ئەم سەرکردایەتی سەرکردایەتی قۆناغێکی دیاریکراو وکاتی دەکات و دەکرێت ئەم قۆناغە ناوبنێین قۆناغی بونیادنانی خودیی شۆڕشگێڕی بۆ کۆمەڵگا.

قۆناغی دووەم:

لەم قۆناغەدا کۆمەڵگا خۆی دەگاتە هۆشیاری خوازراو کە ڕژێمی دیموکراتیە، و لەم قۆناغەدا ژمارەی دەنگدەران یەکسان دەبێت بە ژمارەی دەنگەکان، و لەم دۆخەشدا دیموکراتیەت دەبێتە دیموکراتیەتێکی واقیعی و حەقیقی، و ماوەی شۆڕشگێڕی دەگەیەنرێتە کۆتایی بۆئەوەی کە ماوەی فەرمانڕەوایی دیموکراتی شوێنی بگرێتەوە. لە قۆناغی شۆڕشگێڕیدا ئامانجی خراوە ڕوو بەپلەی یەکەم بەندە لەسەر شکاندنی هەموو کۆتە سەپێنراوەکان، بە واتایەکی تر پێدانی بەرپرسیاریی خاوەندارێتی تاکی یان سروشت بۆ بەرهەمهێنان و دابەشکردنی گشتی بۆ کۆمەڵگا، دیارە لەژێر چاودێری سەرکردایەتی شۆڕشدا. بەواتایەکی تر گۆڕانی ژێرخانی کۆمەڵگە لە بوونیادێکی قابیلییەوە بۆ بونیادێکی هابیلی یان بونیادێک کە تێیدا مرۆڤ وێنە و نیگاری ئایندە دەکێشی، چونکە لە کۆمەڵگای هابیلیدا مرۆڤ خۆ بەخۆ دەگۆڕێت بۆ مرۆڤێکی ئایندە خواز ومرۆڤێك کە نەخشەی ئایندە دەکێشی.

ڕژێمی ئایندەخوازی لە کۆمەڵناسیدا بوونی هەیە، مرۆڤی ئایندەخواز لەسەر بنچینەی زانست و زانیاری بوونی هەیە، هەرچی مرۆڤی هابیلییە لەسەر بنچینەی سوودی ئابوورییەوە بوونی هەیە، ئەو مرۆڤە پشت بە واقیع و بەرچاویی نابەستێت بەڵکو پشت دەبەستێ بە زەینییەت، کەچی دام ودەزاگای بنەڕەتی و لاوەکی بۆ کۆمەڵگا لەسەر بنچینەی ژێرخانی هابیلی یان هێنانە ئارای سیستەمێکی ئابووری بۆی، دروست ناکات و دانامەزرێنێت.

کۆمەڵگا دیسان جارێکی تر دابەش دەبێتەوە بەسەر دۆخی دوو چیندا: چینی فەرمانڕەوا و چینی بەرفەرمان، و چینی بەرز و چینی نزم، بەڵام لەپێناوی ئەوەی کە کۆمەڵگەیەك هەبێت ئەم چینایەتیانە و ئەم جیاوك (إمتیان)انە باوی نەبێت پێویستە

